دکتۆر عەبدوڵڵا عەلیاوەیی

# کوردستان

## لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی دا



لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهان
(لێکۆڵینەوەیەکە لە بواری مێژووی سیاسی دا)

دکتۆر عەبدوڵڵا عەلیاوەیی

# کوردستان
# لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا

## لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهان

(لێکۆڵینەوەیەکە لەبواری مێژووی سیاسیدا)

پێناسی کتێب :

ناوی کتێب : کوردستان له سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا
ناوی نووسەر: د.عەبدوڵڵا عەلیاوەیی
دیزاین : نورالدین عبدالله
سەرپەرشتی چاپ : نەهرۆ محمود
چاپی یەکەم : بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان
چاپی دووەم : کتێبخانەی ئاوێر
ژمارەی سپاردن : (٤٣٢)ی ساڵی ٢٠٠٤

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین لەهێندێ کێشەی سەرەکی بکۆڵینەوە کە دەکرێ لەم مەسەلانەدا کۆبکرێنەوە: پێکهاتەی دانیشتوان و ژیانی ئابووری لەکوردستانداو، دابەش بوونی کوردستان بۆ دوو بەشی عوسمانی وسەفەوی و، بوونی میرنشینە رەوا کوردەکان و بەردەوام بونیان و، سەرەتای پەیدابوونی بزوتنەوەی نیشتمانی تازەی کوردو سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لەبەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەندیداو، سەرەتای پەیدابوونی دەسەڵاتی ئەورووپی لەکوردستانداو، پەیمانەکانی سنووری نێوان دوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی.

## پێکهاتەی دانیشتوان و ژیانی ئابووری لەکوردستاندا

## پێکهاتەی دانیشتوان

ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابوری لەکوردستاندا لەسەرخۆ گەشەیان کردو چەند خاسیەتێکیان هەبوو کەدەکرێ بەم شێوەیە دیاری بکرێن:

کۆمەڵی کورد لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەم و پێش ئەوەشدا لەبناغەوە پێکهاتبوو لەو عەشیرەتانەی دابەش دەبوو بەسەر سێ بەشەوە: عەشیرەتە کۆچەرییەکان، عەشیرەتە نیمچە کۆچەرییەکان و، عەشیرەتە نیشتەجێکان[1]، حکومەتی مەرکەزی هەمیشە هەوڵی دەدا باجی زۆر بەسەر ئەو عەشیرەتانەدا بسەپێنێ و بەزۆر لێیان وەربگرێ، بۆیە عەشیرەتەکان هەوڵیان دەدا لەحکومەت دوور بکەونەوەو رووبکەنە ناوچە شاخاوییە پتەوەکان[2].

---

[1] زکی، محمد امین: خلاصة تاریخ الکرد وکردستان من اقدم العصور حتی الآن، ترجمة: محمد علی عوني، ط۲، ۱۹٦۱، ل ۲۷٦./جلیلی جلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی: د.کاوس قفطان، بغداد ۱۹۸۷، ل۲۷/خصباك، شاکر: العراق الشمالي، دراسة النواحي الطبیعیة البشریة،، ط۱، بغداد ۱۹۷۳، ص۱٦۷.

[2] باشا، خورشید، سیاحتنامه حدود، استانبول، بن میژوو، ل۲٤۹.

سەرنجی ئەوەش دەدرێ کەناوی عەشیرەتەکان ڕەنگە بەگۆڕینی کاتو بارودۆخ بگۆڕێ. عەشیرەتە کوردەکان تیرەو خێڵیان زۆر بوو. سەرنجی ئەوەش دەدرێ کە لەمێژووی عەشیرەتە کوردەکاندا تیرەیەك یان خێڵێك هەلکەوتووەو ناوی زاڵ بووە بەسەر ناوی عەشیرەتەکەدا[1]. بۆ نموونە عەشیرەتی(بلباس) عەشیرەتێکی گەورە بوو وچەندین لقی هەبوو وەکو: ئاکۆ، مامشو مەنگوڕ. بەلاّم ناوی عەشیرەتەکە هێندەی چەند تیرەیەکی وەکو ئاکۆ لەکوردستانی عێراقو مەنگوڕ لەکوردستانی ئێران بەناوبانگ نییە.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا عەشیرەتە کۆچەری یەکان لەکەمبوونەوەی بەردەوامدا بوون پاش ئەوەی بەشێوەیەکی ڕێكوپێك لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بەدوای گوزەرانو لەوەڕگەی بەپیتدا دەگەڕان[2]. لەکۆتایی وەرزی بەهاردا بۆ ناوچە یەکجار ژوورەکاندا کۆچیان دەکرد کە لەناو کورددا بە((کوێستان))دەناسرێنو لەکۆتایی وەرزی پاییزدا دەگەڕانەوە بۆ ئەو دەشتە دەوڵەمەندانەی کەلای ئەوان بە((گەرمیان))دەناسرێن[3].

ئەم عەشیرەتە کۆچەری یانە پشتیان بەلەوەڕاندنو بەخێوکردنی مەڕومالاّت دەبەست[4]. هەر عەشیرەتێکیش لەوەڕگای سروشتی تایبەتی خۆی هەبوو، یان لەخاوەنەکانیان بەکرێیان دەگرتو بەکاریان دەهێنان[5]. هێندێك لەئەندامانی ئەو عەشیرەتانە بەکشتوکاڵەوە خەریك بوون[6].

عەشیرەتە کۆچەرە کوردەکان لەرەشماڵدا دەژیان، کە لەکاتی ڕۆیشتنی عەشیرەتەکە لەنێوان لەوەڕگاکانی کوێستانو گەرمیاندا گواستنەوەی ڕەشماڵەکان ئاسانەو. لەمەرێسی خوری بزن دروست دەکرێ کەبە یەکگرتوویی و بەهێزی ناسراوەو ڕێگانادات باران لێوەی دزە بکات. هەروەها بەبچووکی قەبارەی نەناسراوە کەلەگەڵ سروشتی

---

[1] لەموحازەرەکانی د.ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر بۆ قوتابیانی خوێندنی بالاّ، بەشی مێژوو، کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر، ١٩٩٦-١٩٩٧.

[2] حلمي، ابراهيم: العشائر القاطنة بين بغداد وسامراء، مجلة((لغة العرب)) العدد٣، بغداد ١٩١٣، ص٨٤.

[3] مينورسكي: الاكراد، ترجمة: د. معروف خزندار، بغداد ١٩٦٨، ص٣٣.

[4] ا. شاميلوف: حول مسألة الاقطاع بين الكرد، ترجمة: د. كمال مظهر احمد، بغداد، ١٩٧٧، ص٣٣.
خصباك: العراق الشمالي، ص١٦٩.

[5] الجاوشلي، هادي رشيد: الحياة الاجتماعية في كردستان، بغداد، ١٩٧، ص٦٢.

[6] خصباك: العراق الشمالي، ص١٦٨.

کەش‌وهەواو گواستنەوەدا دەگونجێ[1]. رەشماڵی سەرۆکی عەشیرەت بەگەورەیی قەبارەی‌و دابەش بوونی بۆ سەرچەند بەشێك بەهۆی(چیغ)ـەکانیەوە دەناسرێ[2].عەشیرەتە نیمچە کۆچەری یە کوردەکان بەشێوەیەکی بەردەوام نیشتەجێ نین، بەڵام بەشێوەیەکی ئاسایی ماڵی نەگۆڕیان لەناوچە زستانی یە پێ دەشتەکاندا هەیە[3]، ئەندامانی ئەم عەشیرەتانە لەزستاندا بەکشت‌وکاڵ‌و مەڕو ماڵات خەریك دەبن[4]. بەشێوەیەکی دیکە ئابووری ئەم جۆرە دوولایەنەیە، جگە لەمەش، ئەمانە هێندێ پیشەسازی لارەکی وەکو کەرەو پەنیرو شیریان هەیە[5]. مەڕو بزن‌و ژمارەیەکی کەمی مانگاش بەخێو دەکەن‌و، کشتوکاڵی زستانەیان پتر بریتی‌یە لەگەنم‌و جۆ[6]و ئەم عەشیرەتانە بەپێی نەخشەیەکی دارێژراو لەشوێنی زستانەیانەوە بەرەو کوێستاکانیان دەڕۆن[7].

عەشیرەتە نیشتەجێکان لەگوندەکاندا نیشتەجێن‌و کشتوکاڵ پیشەیانەو[8]، ئەمانەش شان بەشانی هەموو گەلانی دیکەی جیهان، ئەگەر پێش ئەوانیش نەبن، دەستیان داوەتە کشتوکاڵ[9]و، ئابووری‌و ژیانی ئەم جۆرە عەشیرەتانە لەژیان‌و ئابووری دوو جۆرەکەی دیکە، واتە کۆچەری‌و نیمچەکۆچەری‌یەکان جیاوازە[10].

عەشیرەتە نیشتەجێکان لەخانووی نەگۆڕدا دەژین کە لەناوچە پێدەشت‌و دۆڵەکاندا دروستی دەکەن[11]. ئەو خانووەی کوردی تێدا نیشتەجێ‌یە لەناوچەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە، بەپێی سروشتی ئەو ناوچەیە، دەگۆڕێ[12]و، ژیان لەخانووی جێگیردا بناغەی پێکهاتنی گوندی کوردەو، گوند بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بەکشتوکاڵ‌و بەخێوکردنی مەڕوماڵات دەبەستێ، هەروەها پشت بەبەرهەمی دەستکردی ساکار دەبەستێ بۆ دابین کردنی پێویستی‌یەکانی‌و، هەموو گوندێك سەر بەموڵکدار(ئاغا

---

[1] خصباك: العراق الشمالي. ص١٦٨-١٦٩.

[2] Layards, Sir Austin Henry, Discoveries inruins of Nineveh and Bobylon, With travels in Armenia, Kurdistan ete, London, ١٨٥٣. P-٢١٥.

[3] نيكيتين، باسيل، الاكراد، دار الروائع، بيروت، ص٣٠.

[4] خصباك، العراق الشمالي، ل١٢٣/قاسملو: كردستان و الاكراد، بيروت١٩٧٠، ص١٢٣.

[5] العريم، عبدالجبار: القبائل الرحل في العراق، بغداد ١٩٦٥، ص٤٩.

[6] خصباك: العراق الشمالي، ص١٧١.

[7] عقراوي، متى، العراق الحديث، بغداد ١٩٣٦، ص١٨.

[8] خصباك: العراق الشمالي، ص١٧٠.

[9] الجارشلي الحياة الاجتماعية، ص١٠٩.

[10] خصباك: العراق الشمالي، ص١٧١.

[11] تومابوا، لمحة عن الاكراد، ترجمة: حمه شريف عثمان، النجف، ١٩٦٩، ص٢٤-٢٦.

[12] بيكنكهام، جيمس: رحلتي الى العراق، ج٢، ترجمة: سليم طه التكريتي، بغداد، ١٩٦٩ ص٢٣٥.

یان بەگ)ێکەو ئەو مولکدارە سەرۆکی راستەقینەی گوندە[1]و، دەکرێ گوند مولکی هاوبەشی پتر لەیەك سەرۆك بێت و، دەشکرێ یەك سەرۆك پتر لەیەك گوندی هەبێ.

لێکۆڵینەوەی مەسەلەی دەرەبەگایەتی لەنێو کورددا بەیەکێك لەبابەتە ئاڵۆزەکان دادەنرێ بەهۆی نەبوونی سەرچاوەی نووسراو دەربارەی مێژووی کورد بەگشتی و لایەنی ئابووری بەتایبەتی[2]. ژیانی کۆمەڵایەتی لای کورد تێکەڵ و پێکەڵ بوو چونکە هەموو ئەندامانی عەشیرەت مێگەلی مالات و زەوییان هەبوو کەبە هاوبەشی یان بەجیا وەبەریان دەهێنان.

**شارەکان**

شار دیاردەیەکی شارستانی و جوگرافی جیاواز لەدیاردە مرۆڤایەتییەکانی دیکەیە لەرووی زەویدا[3]. شارە کوردەکان، وەکو هەر شارێکی دیکە، بەبچووکی دەستیان پێ کرد، پاشان هێندێکیان بۆ شاری مام ناوەندی گەشەیان کرد، شارە گەورەکانیش لەکوردستاندا، بەبەراورد لەگەڵ شاری گەورەی وەکو ئیستانبوڵ و تاران و بەغدا، یان نییە یان دەگمەنە..و، لەبەرئەوەی تۆپۆگرافیای کوردستان لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاوازە، دەبینین کەشارە کوردەکان بەپێی جیاوازی شوێنەکانیان دەگورێن. ئەو شارە سنوورییانەی دەکەونە سەر سنوورە سیاسییە دروستکراوەکان بەخاسیەتی ئیستراتیژی سەربازی ناسران و، لەهێندێکیان قەڵا و شووره هەیە[4]و، ئەو شارانەی لەپێدەشتەکاندان تارادەیەك شوورەو سەنگەریان تێدانییە. شارە کوردەکان، سەرەڕای ئەوەی لەمێژە لەکوردستاندا هەن، بەبچووکی و کەمی ژمارەی دانیشتوانیان ناسرابوون، بەڵام لەسەدەی نۆزدەیەمەوە وردە وردە گەشەی زۆری کردو، لە زۆربەی شارە کوردەکان تایفەی ناموسڵمانی وەکو جولەکەو فەلە(مەسیحی)دەژین[5].

گرنگترین شاری کوردستانی عوسمانی لەسەدەی نۆزدەیەمدا بریتی بوون لە: وان و دیار بەکرو بەتلیس و سلێمانی و هەولێرو کەرکوك و ئۆرفەو زاخۆو راواندەدو جزیرەو

[1] مینورسکي: الاکراد، ص٢٤-٢٥/قاسملو: الاکراد، ص١٧٤، الغمراوي، امين سامي: قصة الاكراد في شمال العراق، ط ١،١٩٦٧، ص٤٦.

[2] شامیلوف: الاقطاع، ص٢٥.

[3] حسين، عبدالرزاق عباس: نشأة مدن العراق وتطورها، بغداد ١٩٧٢، ص٢١.

[4] هەمان سەرچاوە، ل١٠١/بۆ زیاتریش بڕوانە: الوائلي، عبد ربه سكران، اكراد العراق، ١٨٥١-١٩١٤، جامعة القاهرة، ١٩٨٧، ص١٢٤-١٣٠ (پاشتریش: الوائلي: اكراد العراق)

[5] مینورسکی، الاکراد، ص٧٧/. الوائلي، اكراد العراق، ص١٢٧.

شاری دیکە[1]. جگە لەو شارانەش چەند شارێکی دیکە هەن هێندێکیان بە(قەزا)دەناسرێن: لەڕووی گرنگییەوە لەشارە گەورەکانی دیکە کەمتر نین‌و، هێندێکیان سەنتەری میرنشینی بەناوبانگی کورد بوون کەرۆلی گرنگیان لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا گێڕا وەکو: ڕەواندزی پایتەختی میرنشینی سۆران‌و، جزیرەی ئیبنی عومەری پایتەختی میرنشینی بۆتان‌و، ئامێدی پایتەختی میرنشینی بادینان[2]و سلێمانی پایتەختی میرنشینی بابان‌و بەتلیس‌و هی دیکە.

## ئابوری

لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە ئابورییەکان لەکوردستاندا هێشتا لەسەرەتای ڕێگادایەو، سەرنجی ئەمەش لەزۆربەی ئەو نووسراوانەدا دەدەین کە لەبارەی مێژووی ئابورییەوە دانراون، چونکە ئەو توێژینەوانەی باسی ئابووریان کرد تەنها بەشێوەیەکی سەرپێیی داهاتە ئابوورییەکانیان ژمارد، بۆیە لێکۆڵینەوەی ئابووری کورد پێویستی بەتوێژینەوەی زیاتر هەیە[3]. لەبەرئەوەی کوردستان لەلایەن هەردوو دەوڵەتی ئێرانی‌و عوسمانی داگیرکرابوو، هەردووکیشیان لەڕووی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و ئیدارییەوە دواکەوتووبوون، بۆیە هیچ کارێکی ئەوتۆیان بۆ گۆڕان‌و پێشکەوتنی ئابووری کوردستان نەکرد[4]. کشتوکاڵ شادەماری ئابووری کوردستانەو، پاش ئەوەش بەخێوکردنی مەڕومالات‌و بازرگانی دێت[5].

## بازرگانی

بازرگانی بەشێوەیەکی پتەو بەگۆڕانی ئابوورییەوە بەستراوەتەوە. چەند شت‌و مەکی کشتوکاڵ‌و ئاژەڵی زیاتر بەرهەم بهێنرێ، ئەوەندەش هەلی ناردنە دەرەوەو ئاڵوگۆڕی شمەك بەشێوەیەکی بەرفراوان‌و زیاتر دەڕەخسێ. کۆمەڵی کورد لەسەرەتای چالاکییدا هەوڵی دەدا بەشی خۆی بەرهەم بێنێ‌و ئەم ئاراستە ئابورییە ئاساییە بۆ ئەو

---

[1] توما بوا: مع الاکراد، ترجمة: آواز زنگنه، بغداد، ١٩٧٥، ص٧-٨/الدباغ، فیصل نورالدین، بعض ما ورد عن المدن الکردیة في العهد العثماني، مجلة الکادر، العدد ٣٢، مایس ١٩٩٣.

[2] بۆ پتر لەبارەی ئەم شارانەوە بڕوانە: مەرکریانی، حسین حوزنی: مێژووی میرانی سۆران، چاپخانەی کوردستان، هەولێر١٩٦٢/زکی: خلاصة، ص٢٣٦-٢٣٨/الدملوجي: امارة بهدینان الکردیه، الموصل١٩٥٢/ زکی: تاریخ السلیمانیه‌و انحاٶها، ترجمة: محه جمیل روژبیانی، بغداد ١٩٥١،(پاشانیش: زکی: تاریخ السلیمانیة).

[3] نیکیتین: الاکراد، ص١٢٤.

[4] شەمزینی: جوولانەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان، وەرگێڕانی: فەرید ئەسەسەرد، چاپی٢، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ١٩٨٥، کوردستان، ل٢٤-٢٥.

[5] قاسملو: الاکراد، ص١٢٠

ناوچانەی تۆپۆگرافیای سەخت‌و ئاڵۆزی ئەوتۆیان هەیە کەدەبێتە مایەی لێك دابڕانی ناوچە جیاجیاکان، جگە لەخراپی ڕێگای هاتوچۆو بازرگانی. ئەمە لەرووی بازرگانی ناوخۆوە، بەڵام لەرووی بازرگانی دەرەوەو ناردنە دەرەوەی شمەکەوە ئەوا بەهۆی گۆشەگیری کوردستانەوە بووە، چونکە لەراستیدا لەلایەن وڵاتان‌و گەلانی دیکەوە ئابلۆقە دراوە. ئەم راستییە لەوەدا روون دەبێتەوە کەکوردستان لەدەروازە(منفذ)ە دەریاییەکانەوە دوورە کە لەرووی بازرگانییەوە رۆڵێکی گەورەیان هەیە، ئەمەش بووە مایەی زۆرتربوونی پشت بەستن بەسەر پیشەسازی‌و بەرهەمی ناوخۆ بەمەبەستی پڕکردنەوەی پێویستی ناوخۆو جێبەجێ کردنی چەند مەبەستێکی بازرگانی ناوخۆ لەزۆربەی کاتدا[1] و هەناردەکانی کوردستان پتر بریتی بوون لەماددە خامەکان، بەتایبەت لەبەرهەمی کشتوکاڵی‌و ئاژەڵی‌و، پێکهاتبوو لەسەرومالات‌و خوری‌و بەرهەمی کشتوکاڵی وەکو مێوژو میوە وشکەوەکراوو مێو(مۆم)ی هەنگوین‌و دۆشاو ورۆن‌و زەیتون‌و دارو کەتیرەو هەنگوین‌و گوێزو هێندێ خامی کانزاکان[2] بەم شێوەیە دەبینین هەناردەکان تەنها بریتی بوون لەماددە سەرەتاییە خامەکان، نەك پیشەسازی‌و، بازرگانی کورد بەناهاوتایی ناسرابوو ولەبەرژەوەندی بازرگانی کورددا نەبوو. هاوردەکانیش بریتیبوون لەشتومەکە پێویستەکان کە لەکوردستاندا نەبوون وەکو شەکرو پارچەی ئاوریشم‌و[3] کەلوپەلی ناوماڵ‌و جل‌وبەرگ.

ئەم هۆکارانەش کەبەربەست بوون لەبەردەم بازرگانی دەرەوە لەکوردستاندا بریتی بوون لەدووری لەرێگاوبانی دەرەوەی جیهانی، وەکو گوتمان‌و، گۆشەگیری کوردستان‌و خراپی رێگای بازرگانی.

## دابەش کردنی کوردستان لەنێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەوی‌و عوسمانیدا

کوردستان‌و میرنشینە کوردەکان لەگەڵ دەست پێکردنی ململانێی عوسمانی‌و سەفەوی لەسەرەتای سەدەی شازدەیەمەوە، بەتایبەتی پاش شەڕی چالدێرانی ساڵی ١٥١٤ز دا دابەش کران. پێش ئەوەی شا ئیسماعیلی سەفەوی(١٥٠١-١٥٢٤)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوی لەئێراندا حوکم بگرێتە دەست‌و، پێش گەیشتنی عوسمانییەکان بۆ لێوارەکانی ناوچە کوردنشینەکان: لەکوردستاندا میرنشین‌و

---

[1] خصباك: العراق الشمالي، ص٤٦٤-٤٦٥.

[2] شەمزینی، جوولانەوەی رزگاری، ص٣٦/قاسملو: الاکراد، ص١٤٨.

[3] سالنامە ولایە للموصل، ١٩١١، ل٩١.

بنەماڵەی کورد بەشێوەیەکی سەربەخۆ حوکمیان دەکرد.[1] کە شا ئیسماعیلی سەفەوی ویستی لەکوردستاندا دەسەڵاتی بسەپێنێ رووبەرووی کوردە موکرییەکان بووەوە، کەدانیشتوانی ئەسڵی کوردستانی ئێرانن و بەتوندی بەربەرەکانێیان کرد[2].

لەساڵی(١٥٠٧)یشدا شا ئیسماعیلی سەفەوی لەبەرچەند هۆیەکی سیاسیو ئابووریو مەزهەبی ویستی بەرەو رۆژاوا بڕوات و، مەبەستیشی ئەوەبوو ناوچە ئیستراتیژییەکان کۆنترۆڵ بکات و بگاتە دەریای ناوەڕاست بۆ کۆنترۆڵکردنی رێگا بازرگانییەکان[3]، چونکە ئاوریشم شمەکی هەناردەی سەرەکی ئێران بوو بۆ ئەورووپا لەم سەردەمەی مێژوودا[4]. سوپای شا کوردستانی راماڵیو وێرانیو کاولکاریو ئاوارەیی بۆهێنا، هەروەها چەند میرێکی میرنشینە کوردەکانی ئەو سەردەمە لەژێرکاری تەماع یان ترس ملکەچی خۆیان دەربڕی... بەڵام چەند میرێکی دیکە ملکەچییان رەت کردەوەو بەرگرییان کرد، وەکو میری جزیرە بۆ نموونە[5] چەند میرێکی کورد ،کەژمارەیان بە دە میر دەخەملێنرێ، چوون بۆ(خوی)بۆ ملکەچی نواندنو، شا ئیسماعیلی زۆربەیانی لەسێدارەداو ئەوانی دیکەشی خستە زیندانەوەو لەبری ئەوان میری دیکەی سەربەخۆی دانا[6].

سیاسەتی شا ئیسماعیلی سەفەوی بەرانبەر بەکورد ئەم خاسیەتانەی هەبوو: پشت نەبەستنو بڕوا نەبوون بەمیرەکوردەکانو، رەنگە ئەوە بۆ چەند هۆیەکی ئایینیو رەگەز پەرستانەش بگەڕێتەوە. شائیسماعیلی کوردەکانی هانداا بۆ ئەوەی مەزهەبیان بگۆڕن[7] و هێزو توندوتیژی بەرانبەر ئەو کوردانە بەکارهێناکە پابەندی مافە رەواکانیانن[8]. بەم شێوەیە زۆربەی زەوییەکانی کوردستان کەوتنە ژێر داگیرکردنی

---

[1] شرفخان البدليسي: الشرفنامة، ترجمة: ملاجميل بندی رۆژبیانی، بغداد١٩٥٣، ص١٨٤، ٢٠٨/پاش شەرەفنامە، زکی، محمد امین: تاريخ الدول والامارات الكردية، القاهرة ١٩٨٤، ص٣٦٢-٣٦٣.

[2] شەرەفنامە، ل٢٩٩/ رۆژبەیانی،مەلا جەمیل: فەرمانڕەوای موکریان، بەغداد ١٩٩٢، ل٤٢.

[3] نوار، عبدالعزيز سليمان: تاريخ الشعوب الاسلامية في العصر الحديث، ج١، القاهرة، ص٢٨و٢٩. پاشان: نوار: تاريخ الشعوب.

[4] P.M.Hoit and others: The Combridige History of Islam: Vol ١. Acombridge. Univ. press.١٩٧٠.p.٣١٦.

[5] شەرەفنامە، ل١٣٠-١٨٩، ٤٢٩، ٢٥٩، ٣٣٩، ٢٠٠/ بۆ زیاتر بڕوانە: زکی: خلاصە ص١٦٢-١٦٣.

[6] زکی: خلاصە، ص١٦٤.

[7] قاسملو: الاكراد، ص٤١.

[8] امین، صالح محمد: کوردو عەجەم، چ٢، هەولێر ١٩٩٢، ل٢٤/ الجميل، سیارکوکب: دراسات في السيطرة العثمانية على الموصل واقاليم الجزيرة سنة ١٥١٦م وبدايات الصراع العثماني الايراني في عهد السلطان سليم الاول، ق١، مجلة بين النهرين، العدد(٣٠)السنة ١٩٨٠، ص١٩٦

سەفەوییەکان بۆ ماوەیەك و، بەئەوپەڕی دڵڕەقیی و تۆقاندن حوکمیان کردو باجی زۆریان بەسەر کورددا سەپاند، جگە لەناچارکردنیان بۆ بێگاریی و دەست گرتن بەسەر موڵکەکانیاندا[١].

کاتێکیش کەدەوڵەتی سەفەوی رووەو رۆژئاوا پێش دەکەوت، دەوڵەتی عوسمانی بەوردی چاودێری هەلومەرجی لەکوردستاندا دەکردو کەدەوڵەتی عوسمانی هەستی بەجدییەتی مەترسی سەفەوی کرد بڕیاریدا بچێتە بازنەی ململانێی دژ بەسەفەوییەکان[٢]، بەتایبەتی پاش هاتنی سوڵتان سەلیمی یەکەم، بۆیە ماوەی نێوان ساڵانی ١٥٠٨ تا ١٥٢٠ز بەسەرەتای راستەقینەی ململانێی هەردوو دەوڵەت لە کوردستاندا دانرا[٣]. عوسمانییەکان سەرکەوتن لەراکێشانی زۆربەی میرەکوردەکان بۆ لای خۆیان و[٤]، عوسمانییەکان لەشەڕی (چاڵدێرانی) ساڵی ١٥١٤دا سەرکەوتن بەسەر سەفەوییەکانداو شاری(تەبریز)یان داگیرکردو لەم شەڕەدا تۆپخانە رۆڵێکی سەرەکی بینی[٥] و بەمەش شەڕی چاڵدێران بووە سەرەتای ململانێی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە لەسەدەی شازدەیەمەوە تا سەدەی نۆزدەیەم[٦].

یەکێك لەئەنجامە گەورەکانی ئەم شەڕە، بریتی بوو لەچوونی بەشی هەرە گەورەی کوردستان بۆ ژێر دەسەڵاتی عوسمانیی و، کۆنترۆڵکردنی عوسمانییەکان بۆ خاڵە ستراتیژییەکانی پەڕینەوە لەئەنادۆڵەوە بۆ قەفقاس و سووریا[٧]. وەکو زانراویشە، دەوڵەتی عوسمانی پاش شەڕی چاڵدێران دانی بەرەوابوون و دەسەڵاتی میرەکوردەکان لەمیرنشینە ویلایەتەکانیاندا نا[٨] بەیارمەتی مەلا ئیدریسی[٩] بەدلیسی و[١٠] سوڵتان

---

[١] Safrastain. Dr.A.Kurdistan and Kurd, London ١٩٤٨.pp. ١٥-١٦.

[٢] الجواهري، عماد: صراع القوى السياسية في المشرق العربي، الموصل١٩٩٠، ص٦٥.

[٣] الجميل، سيار كوكب: استراتيجية العراق واثرها ونشوء الصراع العثماني والايراني، مجلة افاق عربية، العدد١٩٨١،١٠.

[٤] ئەسمەرد لەمرید: گەشەکردنی سەرمایەداری لەکوردستانداو زەمینەی ئابوورییانەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی، بەرگی١، ١٩٨٦، ل٢٠.

[٥] لونگريك، ستيفن هيكسلي: اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر الخياط، ط٦، بغداد ١٩٨٥، ص ٣٢،(پاشتر" لونگريك: اربعة قرون).

[٦] V.J.parry. Ahistory of the ottoman empire,London.١٩٧٦-pp-٧٠-٧١

[٧] نوار، تاريخ الشعوب، ج١، ص١٩٧.

[٨] مصطفى، احمد عبدالرحيم: في اصول التاريخ العثماني، ج١، بيروت ١٩٨٢، ل٨.

[٩] الشرفنامه، ص٤٣٨-٤٣٩.

Borhanedin-A.yassin: Vision or Reality? Lund University. Press Sweedin. ١٩٩٥.p.٤٢.

سەلیم دەسەڵاتی زۆر فراوانی پێ بەخشی بۆ هەماهەنگی نێوان میرە کوردەکان[2] و ڕێکەوتن لەگەڵیاندا بەمەش بەناو زۆربەی میرنشینە کوردەکانی ئەو کاتە سەربە دەوڵەتی عوسمانی بوون‌و، ڕێکەوتنەکە چەندین مەسەلەی گرنگی تێدابوو وەکو: هێشتنەوەی میرنشینە میراتیەکان بۆ میرەکوردەکان‌و دان نانی دەسەڵاتی عوسمانی بەمافە میراتیەکانی میرەکان، دەشبوو میرنشینەکان لەکاتی جەنگدا جەنگاوەران بە سوپای عوسمانی بدەن لەبەرانبەری یارمەتیدانی میرنشینە کوردەکان لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی مەترسی دەرەکیدا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە، دەبێ میرنشینە کوردەکان باجی ساڵانە بە دەوڵەت بدەن[3]. کوردان قوربانی زۆریان لەشەرەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا دا، چ لەگەڵ سەفەویەکاندا بووبێ یان لەشەرە بەرفراوانەکانیان لەئەوروپاو باکووری ئەفریقیاو قەفقاسدا[4] لەئەنجامی ئەو شەڕانەشدا، بەتایبەتی لەسەردەمی سوڵتان سلیمانی قانونیدا(١٥٢٧-١٥٦٤) پەیمانی (ئاماسیا)لە٢١/٥/١٥٥٥دا مۆرکرا کە سەرەتای چەسپاندنی دابەش کردنی کوردستان لەنێوان ئێران‌و دەوڵەتی عوسمانیدا[5] ئەمەش بەیەکەمین پەیمانی رەسمی دادەنرێ بۆ دیاری کردنی سنوور لەنێو هەردوو دەوڵەتدا، کەبڕیاریدا ویلایەتی قارس‌و قەڵاکەی بۆ دەوڵەتی عوسمانی بهێلرێتەوەو سنووری شارەزوو دیاری بکرێ کەململانێی لەسەر بەردەوام بوو، هەروەها ئەوەشی تێداهات کەسەلامەتی ئەو کەسە

---

[1] مەلا ئیدریس لەشاری بەدلیس لەساڵی ١٤٥٢دا لەدایك بوو و، لە١٤٧٨پەیوەندی بەسوڵتان یەعقوبی فەرمانڕەوای ئاق قوینلۆکرد. لەساڵی ١٥٠١ چووە ئەستانبوڵ‌و لەگەڵ سوڵتان سەلیمدا بەشداری شەڕی چالدێران بوو، هەروەها لەگەڵ شالاری عوسمانی ساڵی ١٥١٧بو سەر میسر بوو، ساڵی ١٥٢٠لە ئیستانبوڵ‌و کۆچی دوایی کرد.

Dr.Mehmet. Buyrakdar, Bitlissidiris ( Idris Bidlisi ) Ankara.١٩٩١- p.o.

[2] زادە، محمد هەمدمی صولاق: صولاق زادە تاریخی، استنبول، ١٢٧٩ك(١٩٧٩ز) ل ٣٧٩.

[3] ئەولیا چەلەبی: کورد لەمێژووی دراوسێکاندا، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، و: ئاکام، چ٢، بەغدا ١٩٧٨، ل٣٥، ٣٦.٩٥، ١٠٥، ٣١٦ ، بۆ زیاتریش بڕوانە: حسین سعدی عثمان: کوردستان والامبراطورية العثمانية(دراسة في تطورها السياسي ١٥١٤-١٨٥١، ر.م.غ، اداب، اربيل، ١٩٩٥، ص٤٤،٤٣.

[4] شێرکو، بلەج: القضية الكردية، ماضي الكردو حاضرهم، ج٢، بيروت١٩٨٦، ص٤٣. نیکتین: لاکراد، ل١٦٩/حلمي، رفيق: یادداشت، بەشی یەکەم، هەولێر ١٩٨٨، ص٢٥، خصباك، شاكر: الكرد والمسألة الكردية، بغداد ١٩٥٩، ص٢٣.

[5] Ismail, Hakki, Uzun Carsill, Osmanli Tarihi, Cilt ١١,Ankara, ١٩٤٩ p٢٥٠.

ئاماسیا: شارێکە لەباکووری ئەنەدۆڵ‌و شارۆچکەیەکی ولایەتی سیواسە، نورس، د. علاء: العراق في العهد العثماني ١٦٣٨-١٧٥٠(دراسة في احوالها السياسية) ر.م. م. بغداد، ص٧٧.

ئێرانیەیە دابین بکرێ کەزیارەتی شوێنە پیرۆزەکان دەکا[1]. بەڵام ئەم پەیمانە کێشە سنوورییەکانی نێوان دوو دەوڵەتی چارەسەرکرد. لەسەردەمی سوڵتان مورادی چوارەمیشدا لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا پەیمانێکی سەرەکی بەناوی(زەهاب)یان(زەهاو)لەساڵی ١٦٣٩ز دا مۆرکرا[2]ئەمەش زیاتر دابەش کردنی کوردستانی لەنێو هەردوو دەوڵەتدا چەسپاندو ئەم پەیمانە بووە بەردی بناغەی پەیوەندی نێوان دوو دەوڵەت[3]و، گرنگترین دەقەکانی پەیمانەکە[4]ئەمانە بوون:

یەکەم: ئەم ناوچانە هی دەوڵەتی عوسمانی بن: بەدرە، جەسسان، مەندلی، درنە، درتنك، وسەرمنیلو ئەو گوندانەی دەکەونە نێوان قەڵازنجیر تا قەڵای زەڵم لەلێوارەکانی شارەزوور هەموو شاخەکانی دەوروبەری ئەم قەڵایە تا ئەو دەروازەیەی بۆ شارەزوور دەڕواو خاڵی سنووری هەردوو دەوڵەت پێکدێنێ، جگە لەقەڵای قزڵجەو دەوروبەری.

دووەم: دەبێ حکومەتی ئێران دەست وەرنەداتو خۆی نەدا لەقەرەی هەموو ئەو قەڵاو زەوییانەی دەکەونە سنووری(اضخە؟)و قارسو وانو شارەزوورو بەسرەو ئەو قەڵایانەی دیکە کەسنووری عوسمانی دەپارێزن.

سێیەم: دەبێ حکومەتی ئێران دەست لەجنێودان بەخەلیفە راشیدیو ئەسحابەکان هەڵبگرێ.

چوارەم: ئەو قەڵایانەی دەکەونە ئەوبەرەوە لەنێوان مەندلیو دەرتنكو شوێنەکانی:(بیرە)و(یەکە)و(زومرودهاوا)و گوندو قەڵاکانی رۆژهەڵاتی قەڵای زنجیرو میهرابانو دەوروبەریان بۆ ئێرانن‌و نابێ دەوڵەتی عوسمانی دەست لەکاروباریان وەربدات.

پێنجەم: هەردوو تیرەی(بیرە)و(زەردووی)عەشیرەتی جاف سەر بەئێران دەمێننەوە.

شەشەم: رووخاندنی قەڵای زنجیر هەردوو قەڵای قوتوور و ماکو کە دەکەونە سەرووی وان لەکوردستانی باکورداو قەڵای (موغازبرد)کە دەکەوێتە ناوچەی قارس.

حەوتەم: هەردوو دەوڵەت دەست لەکاروباری یەکدی وەرنەدەن.

---

[1] الضابط، شاكر صابر: العلاقات الدولية ومعاهدات الحدود بين العراق وايران، بغداد ١٩٦٦، ل١٩.

[2] العزاوي، عباس: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٤، بغداد ١٩٤٩، ص٢٣٦-٢٣٧.

[3] نورس: العراق في العهد العثماني، ص٦٤.

[4] الحلبي، مصطفى نعيما: تاريخ نعيما ج٣، استانبول، ١٢٨١ك، ل٤٣٠/نورس: العراق في العهد العثماني، ص ٦٤-٦٥.

ئەم پەیمانە لەرووی دانانی سنووری نێوانیان، یەکەمین پەیمانە بەشێوەیەکی روون و ورد دیاری دەکا[1] لەباکوورەوە بۆ باشوور، ولەم رووەوە سیما سروشتییەکانی کردنە بناغەی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت. لەم پەیمانەدا تای تەرازووی عوسمانی بەسەر سەفەویدا قورسترکرایەوە، هێندێ عەشیرەتی کورد بونە دوو بەشەوە، بەشێك لەناو دەوڵەتی عوسمانی و بەشێك لەسنووری ئێراندا، وەکو عەشیرەتی (جاف)ی کۆچەر[2]. بەپێی ئەم پەیمانە میرنشینی (ئەردەلان)ی کوردی بووبە بەشێکی دەوڵەتی ئێران[3]. هەروەها ئەم پەیمانە بەشێوەیەکی رەسمی کوردستانی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێراندا دابەش کرد و بووە بناغەی پەیمانەکانی پاش خۆی، پاش ئەم پەیمانە زۆربەی زەوییەکانی کوردستان بەشێوەیەکی رەسمی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوون[4].

## میرنشینە کوردەکان

دیراسە کردنی میرنشینە کوردەکان گرنگیی لەوەدایە کە لەمواقیعی میاتی مێژوویی خۆی و ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی کوردەوە رەوایی (مشروعیە)ی خۆی وەرگرتووە، ئەگەرچی زۆربەی توێژەرەوەو مێژونووسان دەربارەی ئەو رەواییەی میرنشینە کوردەکان نادوێن. میرنشینەکانی حەسنەوی و عەنازی و شەددادی و دۆستەکی و مەروانی و هەمەزەبانی[5] بەلگەی روونی رەوایی دەسەلاتی سیاسی ئەو میرنشینانەن کەلە کاروباریاندا سەربەخۆ بوون. زۆر میرنشین و حکومەتی کورد لەبەشە جیاجیاکانی کوردستاندا تا سەردەمی دەرکەوتنی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی کیانی خۆیان پاراست. ئەم دوو دەوڵەتە کەوتنە دژایەتی یەکدی کردن و، لەئەنجامی شەڕە وێرانکارەکانیاندا وردە وردە کوردستان دابەش کرایە سەر دوو بەشی عوسمانی و سەفەوی ئیسماعیل شای (سەفەوی)ش بەخاکی کوردستاندا بلاوبۆوەو بەشێکی زۆری خاکەکەی دایە پاڵ دەوڵەتی سەفەوییەوە لەرێگای بەکارهێنانی

---

[1] الخطيب، حميد جواد، الحدود العراقية- الايرانية الوضع القانوني لشط العرب، ر.م.غ: كلية القانون- جامعة بغداد، ١٩٧٢، ص١٧٢.

[2] على، شاكر على: تاريخ العراق في العهد العثماني ١٦٣٨-١٧٥٠م(دراسة في احواله السياسية) ر.م.م، جامعة بغداد ١٩٧٦، ص٧٧.

[3] قەفتان، صالح: مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تاکو ئەمڕۆ، بەغداد ١٩٦٩، ص٣٠٨.

[4] عزيز، د. حسين محمد: ململانێی ئایدۆلۆژی لەکوردستاندا، سلێمانی ١٩٩٣، ص٧٠.

[5] الشرفنامه، ص٣٠، ٣٤،٣٩،٤٣/ زكى، الامارات، ص٦٩، ٩٠،٩٥،١٢٦، ١٣١، ١٥١،١٦٢.

توندوتیـژیو دەلڕەقـیو سـەرکوتکردن دژی کـوردو، لـەبری میرەکوردەکـان خـەلکی لایەنگری خۆی دامەزراند.

دەولەتی عوسمانی پاش شەڕی سالی١٥١٤ (چالدێران)ی بەهۆی ڕووبەڕووبونـەوەی هێزی سەفەوی لەلایەکەوەو هێزەکانی مەمالیك لەمیسرو سـوریا لەلایـەکی دیکـەوە، ناچار بوو هەولّ بدات لەگەلّ ڕێبەرو میرەکوردەکـان لێـك تـێ بگـەنو دۆسـتایەتییان وەدەست بێنێ، ئەویش لـەڕێگای زانـای کـورد مـەلا ئیدریسـیبەوەو، لەگـەلّیان ڕێـك کـەوت بەشـێوەیەکی رەسمـی دان بەسـەربەخۆیی میرنـشینیو حکومەتـەکانیان بنـێ، ئـەوەش لەسـالی ١٥١٥دا بـوو لەڕێگـەی ئـەو فەرمانانـەی لەلایـەن مـەلا ئیدریـسی نوێنەری سولتان سـەلیمەوە بەسـەریاندا دابـەش کـرا. ئەمـەش دان پێـدانانێکی رەسمی دیکەیـە بەدەسـەلاتی سیاسـی میرنـشینە کوردەکـانو مانـەوەی حـوکمی ویراسـییان بەشێوەیەك کە لەکاروباری ناوخۆیاندا بەسەربەخۆیی فەرمانڕەوایی بکەن. ئەو هۆیانەی بوونە مایەی دانی ئەم ئیمتیازانە بەوان ئەمانە بوون[1]:

یەکەم: دەولەتی عوسمانی ناچار بوو لێك بگەنو هەموو هەولێك بدات بۆ وەدەست هێنانی دۆستایەتی ڕێبەرانی کوردو میرەکانیان، چونکە ڕووبەڕووی. دووهێـزی گـەورە بـووە بـووەوە، کەسـەفەوییەکان لەرۆژهـەلاتو مەمالیکـەکان لەمیـسرو سـووریا لەباشووردا.

دووەم: تـرس لـەوەی ڕێبـەرو میرەکـانی عەشـیرەتە کوردەکـان بـچنە پـالّ لایـەنی سەفەوییەوە، ئەگەر دەولەتی عوسمانی توندوتیژییان لەگەلّدا بەکار بێنێ.

سێیەم: دەولەتی عوسمانی دەرکی بەڕادەی ئازایەتی کورد لەجەنگدا کردبوو، بۆیـە ویستی لەشارەکاندا شان بەشانی خۆی بەکاریان بێنێ.

چوارەم: ئەگەرچی شەڕی چالدێران شەڕێکی گەورە بوو، بەلام یەکلاکەرەوە نـەبوو و دەولەتی عوسمانی زیـانی گیـانیو کەرەسـتەی زۆری تێـدادا، بۆیـە ویـستی هێزەکـەی بگێڕێتەوەو باروودۆخەکە هێمن بکاتەوە، لـەڕێگای گـەڕان بـەدوای دۆسـتایەتی تـازەدا خۆی بەهێز بکاتەوەو، کورد بەسـەر هـەموو ئـەو زەوییانـەدا زالّ بـوون کـە دەکەوتنـە نێوان ئەو سێ هێزەوە، ئەمەش گرنگییانی لەم وەرچەرخانە یەکلاکەرەوەیەی مێـژووی دەولەتی عوسمانیدا زیاتر کرد.

---

[1] الشرفنامە، ص٤٣٨.

بەمەش دەتوانین بڵێین پەیوەندی نێوان کوردو دەوڵەتی عوسمانی بەدوو قۆناغدا تێپەڕی:

یەکەم: قۆناغی تەبایی‌و دان بەیەکدانان‌و بەرژەوەندی هاوبەش. دەوڵەتی عوسمانی لەم قۆناغەدا(واتە پاش شەڕی چاڵدێران)پێویستی بەکورد هەبوو تا لەپاڵ ئەودا دژ بەسەفەوی‌و مەمالیکەکان بوەستێ، وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، مەزهەبی سوننی کوردیان قۆستەوە[1]. کوردانیش قایل بوون بەهاوکاری عوسمانی‌یەکان بەو هیوایەی ئەم هاوکاری‌یە دۆستانەیە بەردەوام بێ.

دووەم: قۆناغی هەوڵدانی حکومەتی عوسمانی بۆ لادان لەرێکەوتنی ناوبراو لەنێوان خۆی‌و کورددا، ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی بەسەر دان نانی عوسمانی‌یەکان بەسەربەخۆیی میرنشینە کوردەکان‌و دانی تالاّو داهۆڵ پێیان، تا وردە وردە سیاسەتی هاوسۆزی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ کوردەکان گۆڕدراو نیازە راستەقینەکانی دەرکەوتن. سوڵتان سلێمان کە لەساڵی ١٥٢٠دا حوکمی بەدەست گرت ئەو رێکەوتننامەیەی پێشێل کرد کە لەساڵی(١٥١٥)دا لەگەڵ میرە کوردەکان مۆری کرا، ئەمەش بەیەکەمین هەوڵی پێشێل کردن‌و سەرەتای یەکەمین قۆناغی جێبەجێ کردنی سیاسەتی مەرکەزی دادەنرێت. سوڵتان سلێمانی قانونی دوو هێرشی دیکەی بردە سەر سەفەوی‌یەکان‌و لەئەنجامدا ناوچەی دیکەی دایە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە کەهێندێ ناوچەی کوردیان تێدایە[2]و، خراپە بۆ کوردکردن‌و جیاوازی خستنە نێوان میرەکانیان[3].

میرنشینە کوردەکان پاش ئەوەی گۆڕانی هەڵوێستی عوسمانی‌یەکانیان بۆ دەرکەوت، دەستیان دایە بەربەرەکانێ کردنی دەسەلاّتداری‌یە عوسمانی‌یەکان‌و، سەربەخۆیی رەوای خۆیان بەپێی توانایان پاراست[4]. ئەو سوڵتانانەی پاش سلێمانی قانونی هاتن هەمان سیاسەتیان گرتەبەر، ئەوەبوو سوڵتان مورادی چوارەم لەساڵی

---

[1] شەرەفنامە، ل٤٣. Derk Kinnane: The Kurds. Op.Cit, p David Medowall: The Kurd .١٥ anation denied, London, ١٩٩٢.p.٣٠.
زکی، خلاصە، ص٦٥.

[2] الشرفنامە، ص٤٥٣/ زکی، خلاصە، ص١٧٨ سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل١٩٦/ بۆ زیاتر پروانەحسین، سعدی عثمان: کردستان والامبرطوریة العثمانیة: ص٥٤-٦٢.

[3] رفیق حیلمی: یاداشت، ص٢٦/بۆ پتر دەربارەی سیاسەتەر دەسەلاّتەکانی سلیمانی قانوونی بەرانبەر بەکورد بروانە: سعدی عثمان: کردستان والامبراطوریة العثمانیة، ص٥٣- ٦٢.

[4] د. لیونهارت، ار ولتسن: رحلة المشرق، ترجمة: سلیم طه التکریتي، بغداد ١٩٧٨، ص١٩٧.

١٦٢٨دا فەرمانیدا (یوسف خان)ی میری بادینان زیندانی بکرێ چونکە پەیڕەوایی لەسوڵتان نەکرد بۆ گەڕانەوەی لەداگیرکردنی بەغدا[١] و هەڵسانی سلێمان پاشای گەورەی والی بەغدا لەساڵی ١٧٩٦دا بەراوە دوونانی تەیمور پاشا[٢] سەرۆکی عەشیرەتی مللی کورد بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی گەورەی لەنێوان حەلەبو دیاربەکرداو، هەروەها هەڵسانی عەلی پاشای والی بەغدا(١٨٠٢-١٨٠٦) بەلابردنی میری بادینان کە لەکاتێکدا داوا لێ کردنیدا هێزی بۆ والی بەغدا نەنارد بۆیە لای برد[٣]هەروەکو(ریچ)ی گەشتیار[٤]باسی دەکا، خەلکی شاری سلێمانی هیچ رێزێکیان بۆ عوسمانیەکان نەبوو. گەشتیارێکی دیکەش[٥] لەساڵی ١٨٣٣دا دیدەنی ئەو ناوچە کوردەی کرد کەدەکەونە نێوان خوویو ئەرزەرووم، گوتی: دانیشتوانی کوردی(هی ئەو ناوچەیە)هیچ بایەخێك بەفەرمانەکانی سوڵتان نادەنو بەشێوەیەکی گشتی رقیان لەدەوڵەتی عوسمانیەو، گەشتیارێکی رووس[٦] باسی دیمەنێك دەکا بەچاوی خۆی دیتبووی: دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەشاری موسڵدا کوردێك خرایە ناو شاگردەوە بەتۆمەتی بەرهەڵستیکردنی دەسەڵاتی عوسمانی. هەروەها باسی دیمەنێکی دیکەشی کورد کەدیسانەوە خۆی دیتبووی: کەدەسەڵاتدارانی عوسمانی کوردێکی دیکەیان لەموسڵ خستە ناو مەنجەڵی تاوی کوڵاوەوە بە تۆمەتی بەشداربوون لەشۆڕشی میر بەدرخانی گەورە. لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا عوسمانیەکان هەوڵیاندا سیاسەتێکی ناوەندی، زیاتر لەرابردوو، پیادەبکەنو کوردان بەتوندی ئەم سیاسەتەیان بەرپەرچ دایەوە[٧]، بەم شێوەیە سەروەری عوسمانی بەسەر میرنشینە کوردە رەواکاندا هەر بەناو سەروەری بوو[٨].

---

[١] سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ص١٤٩.

[٢] زکی: خلاصە، ص٢٢٠.

[٣] الکرکوکلی، رسول: دوحة الوزراء فی تاریخ وقائع بغداد، ترجمة: موسی کاظم نورس: بیروت، ١٩٦٣، ص٢٢٤.

[٤] کلودیوس، جیمس ریچ: رحلة ریچ فی العراق عام ١٨٢٠، ترجمة: بهاء الدین نوری، ج١ ط١ بغداد ١٩٥١، ص٥١.

٥J.B.F.Asar: Awinters Journy from Constantinopole to Tehran. Vol. New york. ١٩٤٣, p. ٢٥٠.

[٦] دیتل: رحلة فی الشرق، بیبلوتیکا دلیاجیتینا، بەرگی(٩٥)ساڵی ١٨٤٠، ل٢٠. لە(خالفین: الصراع علی کردستان)، ل٢٠ وەرگیراوە.

[٧] A.Yassin; op. cit. P.٤٣.

[٨] Edgar Oballance. O.P. Cit. P.١٦.

لەگەڵ سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا دوەمین قۆناغی پیادەکردنی سیاسەتی مەرکەزی لەسەردەمی سوڵتان مەحمودی دوەم(١٨٠٨-١٨٣٩ز)دەستی پێکردو، سەردەمی ئەو سەرەتای کۆتایی میرنشینە کوردە رەواکان بو[١]و، سولتان مەحمود ئەم سیاسەتەی بەپاساوی هەڵسان بەریفۆرم لەناو ئیمپراتۆری لاوازدا گرتەبەر[٢]و، یەکێك بوو لەبیانووەکانی بۆ رێگا بڕین لەبەردەم دەست تێ وەردانی رووسیو ئێرانی لەکاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانیو، پاشانیش لێدانی میرنشینە کوردەکانو نەهێشتنی سەربەخۆیی ئیداری رەوایانو بەسەربازگرتنی کوردان لەسوپای عوسمانیدا، چونکە زۆربەی کوردان ئارەزووی بەشدارییان لەجەنگە عوسمانییەکاندا نەبوو[٣].

سوڵتان مەحمود توانی هێندێك لەمەبەستەکانی حکومەتەکەی یان سیاسەتەکەی بەرانبەر بەمیرنشینە کوردەکان جێبەجێ بکاتو هێندێکیان بڕوخێنێ لەبەر چەند هۆیەك، لەوانە: بەهێزی سوپای عوسمانی لەرووی مەشقو چەکەوە کەهەلومەرجێکی ناهاوتای خولقاند بە بەراوردکردن لەگەڵ هێزی میرنشینە کوردەکانو پەرتەوازەیی ناوخۆیی خودی میرە کوردەکانو هۆکاری دەرەکی کە لەهێزە گەورەکانی وەکو بەریتانیاو روسیادا بەرجەستەبوو[٤].

سەرەڕای ئەم سیاسەتە سەرکوتکارانەیە، میرنشینە کوردە رەواکان تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم بەخۆڕاگری لەبەردەم دەوڵەتی عوسمانیدا مانەوە، بەڵام لەنزیکەی سەدەی نۆزدەیەمدا دەوڵەتی عوسمانی توانی دەسەڵاتی مەرکەزی بەسەر میرنشینە کوردەکاندا، یەك لەدوای یەك، بسەپێنێتو لەمەودوا کورتەیەك لەسەر گرنگترین ئەو میرنشینە کوردانە دەخەینەروو کە تا ئەو کاتە مابوون:

**میرنشینی سۆران:**

یەکێکە لەمیرنشینە کوردییە کۆنەکان، لەکاتی هاتنی عوسمانییەکان لەسەردەمی سوڵتان سەلیمدا هەبوو. رەچەڵەکی ئەم خێزانە دەگەڕێتەوە

---

[١] Hassan Arafa: The Kurds, Oxford University Press, London. ١٩٦٦. P.٢٢/ Namo Aziz: Kurdistan DA Verlag Das Andere. ١٩٩٢. P.١٢٨. جەلیلی: کوردەکان، ل١٦٥.

[٢] Derk Kinnane, o.p. cit. P.٢٣.

[٣] العزاوي، عباس: تاریخ العراق، ج٧، ل٢٤.

[٤] زکی: خلاصە، ل٢٤٦: جلیلی: کوردەکان، ل١٨٠/ بۆ زیاتر بڕوانە: حسین، سعدی عثمان: کردستان والامبراطوریة العثمانیة، ص١٥٥-١٦٠.

بۆ((کلوس))و، عیسای کوڕی بەدامەزرێنەری میرنشینەکە دادەنرێ[1]. شاری هەولێر پایتەختی ئەم میرنشینەیە بوو لەسەردەمی((عیزەدین شێر)) کەسولتان سلێمانی قانوونی لەساڵی(١٥٣٤ز)دا لەسێدارەی دا[2]. ئەم میرنشینەیە پتر لەپایتەختێکی بۆ خۆی هەڵبژارد لەوانە: خەلیفان و هەریرو هەولێرو دویین و رواندز[3]. بەرجەستەترین فەرمانڕەوای میرنشینی لەسەدەی نۆزدەیەمدا محمد پاشای گەورە بوو لەساڵی ١٨١٣ز[4] داو، نازناوی((پاشایەتی))ی لەلایەن والی بەغداوە((علی رەزا پاشا))پاش رەزامەندی ئەستانە پێی بەخشرا[5]. میر پاش وەرگرتنی حوکم دەستی دایە بەهێزکردنی میرنشینەیەکەی کەرواندز پایتەختی بوو و، ناوچە کوردنشینەکانی دەوروبەری دایە پاڵ میرنشینەیەکەوە[6]. گرنگترین کارە ئیدارییەکانی بریتی بوون لەدامەزراندنی چەند لیژنەیەك بۆ سەرپەرشتی کاروباری ئیداری میرنشینەیەکە[7]، وەکو دامەزراندنی ئەنجومەنی سەروەری، کەخۆی سەرۆکی بوو و، دامەزراندنی لیژنەی سەربازی کە بەسەرۆکایەتی(ئەحمەد بەگ)ی برای بوو و، پێکهێنانی لیژنەی زانایان بۆ دانانی یاسا مەدەنی یان دینییەکان و، سەرپەرشتی کردنی حوکمەکانی شەریعەت و، لیژنەی بنیاتنان و دروستکردن بۆ سەرپەرشتی کردنی دروست کردنی قەڵاو شوورەو سەنگەرو پردو، لیژنەی بازرگانی بۆ سەرپەرشتی بەڕێوەچوونی کاروباری بازرگانی و بازاڕ. هەروەها سکەی(پوول)یشی دەرکرد کە لەیەکێك لەڕووەکانی(پوول)ەکەدا مۆری میری سەرکەوتوو محەمەد بەگ دیارەو لەدیوەکەی دیکەدا نووسراوە:(لەرواندز لێ دراوە)[8]و، ئەمەش بەڵگەیەکی روونە لەسەر سەربەخۆیی میری گەورەو خونەکانی بۆ بەرزکردنەوەی میرنشینەیەکەی تا ئاستی میرنشینەیە پێشکەوتووەکان.

هەروەها سوپایەکی بەهێزی دامەزراند کە پیادەو سوارو تۆپخانەی هەبوو و کارگەیەکی بۆ دروست کردنی تۆپ و دەمانچەو تفەنگ و خەنجەرو باروت

---

[1] شەرەفنامە، ل٢٧٣/ زکی: الامارات، ص٤٠٠/ بۆ پتریش بڕوانە: یحیی، عبدالفتاح علي: الهجوم العثماني على كردستان وسقوط امارة سوران: مجلة كاروان، العدد ٥٢ لسنة ١٩٨٧، ق١ ص١٣٥-١٣٧.

[2] شەرەفنامە، ل٢٧٨.

[3] زكی: الامارات، ص٤٠٠-٤٠٦/ قەفطان: مێژووی گەلی کورد، ل ٢٩٦.

[4] موکریانی، حسێن حوزنی: مێژووی میرانی سۆران، هەولێر ١٩٦٢، ل٣٠.

[5] موکریانی: میرانی سۆران، ل٧٩/ زکی: خلاصه، ص٢٢١/ لونگریك: اربعة قرون، ص٣٤٣/ قەفطان، کاوس: بابان، سۆران، بوتان، بغداد ١٩٨٥، ل٥١.

[6] موکریانی: میرانی سۆران، ص٣٦-٤٢/ زکی: خلاصه، ص٢٢١/ زکي: الامارات، ص٤٠٦.

[7] موکریانی: میرانی سۆران، ل٤٩.

[8] موکریانی: میرانی سۆران: ل٥٠/ نیز، جمال: الامیر الكردي، اربيل ١٩٩٤، ص١٠٥.

دامەزراند[1] و، سنووڕێکی بۆ دزیو ڕاو ڕووت تاڵان داناو سزای بۆ تاڵانباران دیاری کرد[2] و هێندێ سەرچاوە[3] ئاماژەیان کرد بۆ ئەوەی نامەکاری نێوان میرو ئیبراهیم پاشای کوڕی محمد علی پاشای میسر هەبووە بۆ یەکخستنی هەوڵەکانیان دژی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام ئێمە هیچ بەڵگەیەکمان دەربارەی ئەو نامەکارییانە لەبەردەستدا نییە جگە لەوەی (حسین حوزنی)لە(ملیخا)وە[4] گێڕاویەتیەوە. میری گەورە- وەکو گوتمان- سیاسەتی بەهێزکردنو فراوان کردنی میرنشینییەکەی گرتەبەرو، کۆیەو پردێو هەولێرو هەریرو ئامێدیو دهۆكو شەنگارو زاخۆو جزیرەی دایە پاڵ میرنشینییەکەیەوە[5]، لەئەنجامی ئەم بلاوبوونەوەیەی رووبەری دەسەلاتیدا عوسمانییەکان لەهەنگاوەکانی میر نیگەران بوونو دەستیان دایە هێرشێکی گەورە کەسەرکردایەتییەکەی درایە سەرۆك وەزیران(الصدر الاعظم)ی پێشوو محمد رەشید پاشا[6] لەگەڵ چوونی هێزەکانی هەودوو ولایەتی مووسڵو بەغدا بۆ پاڵ هێزەکەی. هەروەها ئێرانیش هێزەکانی کۆکردەوە بۆ ئابلوقە دانی میر لەدیوەکەی دیکەدا. سوپای عوسمانییەکان گەیشتە دەشتی هەریرو نامەیان بۆ میر نارد تا قەناعەتی پێ بهێنن داکۆکی نەکاتو گوایە لەپێناوی پاراستنی خوێنی موسڵماناندا خۆی بەدەستەوە بدات، بەڵام میر خۆی ئامادە کرد بۆ داکۆکی کردن لەپایتەختەکەی، وەکو تاقە سەرچاوەیەکیش[7] باسی کرد: فەرماندەی سوپای میر، کەناوی محمد باس بوو، بەدزییەوە لایەنگری خۆی بۆ سوپای عوسمانی ڕاگەیاندو شەڕی دژی نەکرد. لەئەنجامی ئەمەدا و لەبەر چەندین هۆی زۆری دیکە میر ناچاربوو خۆی بەدەستەوە بداتو ملکەچی بنوێنێ، ئەوەشی کرد بۆ ئەوەی قەسابخانە لەمیرنشینییەکەدا بەرپا نەکرێ، پاشان نێردرا بۆ ئەستانەو گوترا: سوڵتان لێی خۆش بوو، بەڵام لەڕێگای

---

[1] موکریانی: سەرچاوەی پێشوو، ص ٤٦-٤٩.

[2] نیز، جمال: الامیر، ل٩٥-٩٦/ فریزر، جیمس بیلی: رحله فریزر الی بغداد في عام ١٨٣٤، ترجمة: جعفر الخیاط، ط١، بغداد ١٩٦٤، ص١٢،١٣.

[3]. موکریانی: میرانی سۆران، ل٦٨-٧٢/ بۆ زیاتر بڕوانە: عبدالفتاح علی یحیی: حقیقە الاتصالات، مجلە کاروان، العدد ٣٧، سنة ١٩٨٥.

[4] موکریانی: میرانی سۆران، ل٦٧.

[5] موکریانی: میرانی سۆران، ٥٥-٨٠/ رحلە فریزر، ص١٤،١٣،١٢.

[6] موکریانی: میرانی سۆران، ل٨٢-٨٧.

[7] بابان، عبدالقادر بن رستم: سیر الاکراد، بکوشش: محمد رؤوف توکلی، ج١ تهران ١٣٦٦ه (١٩٨٧ز) ص١٧٩.

گەڕانەوە لە(سیواس)دا کوژرا[1]. لێکۆڵەرەوەکان بگرەو بەردەی زۆریان لەسەر هۆیەکانی ڕووخانی میرنشینی سۆران لەساڵی(١٨٣٦)دا هەیەو، دەتوانرێ ئەم هۆیانە بگەڕێنرێنەوە بۆ ئەمانەی خوارەوە:

١-هێندێك دوورپاتی دەکەنەوە کەهێزێکی عوسمانی گەورە لەسێ بەرەوە بەسەرکردایەتی هەریەك لە: محەمەد ڕەشید پاشاو، محەمەد پاشای بەیرەقداری والی مووسڵو عەلی ڕەزا پاشای لازری والی بەغدا[2]، جگە لەکۆکردنەوەی هێزێکی گەورەی ئێران لەسنووری میرنشینیدا.

٢-پشتگیری بەریتانیا بۆ لایەنی عوسمانی[3].

٣-نەبوونی هیچ پشتیوانێك بۆ هێزەکانی محەمەد پاشا.

٤- نەبوونی هاوکاری لەنێوان میرنشینی سۆرانو میرنشینەکانی تر بۆ فریاکەوتنی یەکتری لەکاتی پێویستدا.

هی دیکەش هەن کەڕووخانی میرنشینییەکە دەگێڕێتەوە بۆ فەتوای زانای ئایینی(محەمەدی خەتێ) و ئەمانەش ئەو بۆچوونە لە(حسین حوزنی) لەکتێبی(مێژووی میرانی سۆران)ەوە دەگێڕنەوە. من لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نیم چونکە ئەستەمە پێشبینی ڕووخانی میرنشینییەکی گەورەی وەکو میرنشینی سۆران بەتەنها دەرکردنی فەتوایەك لەلایەن زانایەکەوە بکرێ[4].

## میرنشینی بادینان:

ئەم میرنشینییە بەناوی باپیرەی بنەماڵەو دامەزرێنەری میرنشینی بەهائەدینەوە ناونراوەو[5]، یەکێکە لەمیرنشینییە کوردە کۆنەکانو دامەزراندنی بۆ پێش سوڵتان

---

[1] ( )ی اسعد خیلانی: تاریخ سوران/ زکی: الامارات، ص٤١٤-٤١٥/ میجرسون: رحلة متنکر الی بلاد مابین النهرین، ج١، ط١، بغداد، ١٩٧٠، ص١٤٩/ خالفین: الصراع، ص٥١-٥٣/ نوار: تاریخ العراق الحدیث، القاهرة ١٩٦٨، ص١٠٧.

[2] رحلة فریزر، پەراوێزی ل٤٧.

[3] خالفین: الصراع، ل٥٢-٥٣/ بۆ پتر بڕوانە، نبز، جمال: الامیر الکردی، ص١٤٧-١٤٨.

[4] بۆ پتر بڕوانە: موکریانی: میرانی سۆران، ل٨٤/ نبز، جمال: الامیر الکردی ص١٢٤-١٣٠/ خلیلی: کوردەکان، ل٣٦/ یحیی، عبدالفتاح: الهجوم العثمانی علی کردستان، مجلة کاروان العدد(٥٣)ق٢، السنە ١٩٨٧/ محمد، مسعود: تثنیة الحج الی اعتاب العلامة الخطي، مجلة کاروان ق١، ق٢، العددان ٧١ر ٧٢، السنة١٩٨٩.

[5] شەرەفنامە، ل١٣٨/ الدملوجی، صدیق: امارة بهدینان الکردیة، للوصل ١٩٥٢، ص٩/ المانی، انور: الاکراد في بهدینان، الموصل ١٩٦٠، ص١٢٢/ زکي: الامارات، ص٣٩٢/ بۆ زیاتریش بڕوانە: العقراوي، نافع: شعرار من بادینان، بغداد ١٩٧٨، ص٥-١٠/ یحیی، عبدالفتاح علی: الملا یحیی المزوري رسقوط امارة بادینان، مجلة کاروان، العدد ٤١، السنة ١٩٨٦، ق١.

سەلیم دەگەڕێتەوە[1] و جوولەکەو ئەرمەن و ئاشووری و یەزیدی لەپەنایدا دەژیان[2].
لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا چەند ململانێیەکی ناوخۆ لەسەر ڕێبەرایەتی کەوتە ناو میرنشینییەوەو هەردوو ولایەتی موسڵ و بەغدا ڕۆڵێکی گەورەیان لەخۆشترکردنی ململانێیە ناوخۆییەکەدا بینی و، لەساڵی ۱۸۰۸دا میرنشینی بووە قوربانی ململانێی ناوخۆو کەوتە ژێر دەسەڵاتی ولایەتی موسڵەوە، بەڵام یەکێك لەمیرانی میرنشینی، کەزوبێر پاشایە، توانی رزگاری بکا[3]. دواترین کەس کەدەسەڵاتی میرنشینی گرتە دەست بەبڕیاری والی بەغدا ئیسماعیل پاشا بوو[4] و میرنشینی لەسایەی حوکمی ئیسماعیل پاشادا ڕووبەڕووی زۆر کێشە بووەوە،[5] تا لەساڵی ۱۸٤۲دا ڕووخا[6].

## میرنشینی بۆتان:

یەکێکە لەو میرنشینییانەی لەساڵی ۱۵۱٥دا لەلایەن سولتان سەلیمەوە دانی پێدانراو، بەناوبانگترین میری لەسەدەی نۆزدەیەمدا بەدرخانی کوڕی عەبدولخان بوو کە پاش مەرگی باوکی لە۱۸۲۱دا حوکمی میرنشینی گرتە دەست[7] وە لەسەرەتای حوکمڕانییەوە بەتەمای سەربەخۆیی و رزگاری کوردستان بوو[8] و،کینانKinnan[9] پێی وایە کە یەکەم شۆڕشی کوردە کەدەتوانرێ پێی بگوترێ شۆڕشی نەتەوایەتی و مەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کورد بێت لەبەر ئەوەی ئامانجی لەدامەزراندنی دەوڵەتێکی کورد ئاشکرابوو، دەبوو قسەی میرانی کوردو سەرۆك عەشیرەتەکان

---

[1] پێ رەش، بارزان، ل١٦.

[2] الدملوجي: امارة بهدينان، ص١٢و١٤/ للماني: الاكراد في بهدينان، ص٦٥-٨٧/ جليلي جليل راخرون: الحركة الكردية، ص١٢.

[3] الماني: الاكراد في بهدينان، ص١٦٣-١٦٥/ بز زباتر، بروانە: الموصل في العهد العثماني ١٧٢٣-١٨٤٢، النجف ١٩٧٥، ص١٥٩-١٦٧

[4] الوائلي: اكراد العراق، ص١٤.

[5] زكي: خلاصه، ص٢٣٤، ٢٣٥/ للماني: الاكراد في بهدينان، ١٧٢-١٧٤/ العباسي، محفوظ: امارة بهدينان العباسية، الموصل ١٩٦٩، ص١٠٩

[6] زكي: الامارات، ٣٩٨-٣٩٩/ الماني: الاكراد بهدينان، ص١٧٦-١٧٧/ يحيى، عبدالفتاح على، الملا يحيى المزوري، مجلة كاروان ق٢، العدد٤٢/ يحيى، عبدالفتاح علي: الهجوم العثماني على كردستان، مجلة كاروان، ق١، العدد٥٢، السنة ١٩٨٧.

[7] بلەج، شیرکو: القضية الكردية، ص٥١/ شەمزینی: جولانەوەی رزگاری، ل٥٣/ کریس کۆچیرا کورد لەسەدەی ١٩-٢٠، وەرگێڕانی محمدی ربانی، تاران ١٣٦٩، ل١٤٤/ کونی رش: الامير جلادت بدرخان، ص١٢.

[8] بلەج شیرکو: القضية الكردية، ص٥١/ البارزاني، عبدالمصور: حماية الاكراد، ر.د. نمسا ١٩٨٥، ص٨.

[9] D.Kinnane. O.P. Cit. P.٢٢.

یەکبخات و هەر ئاوەهاشی کرد، چونکە (پەیمانی پیرۆز)ی[1] لەنێوان ڕێبەرایەتی کورددا دامەزراندو دەبێ هێندێك لەئاستی ئەم پەیمانەدا ڕابوەستین، چونکە پێکهێنانی پەیمانێك کە ژمارەیەکی زۆری ڕێبەرانی کورد بگرێتە خۆی کارێکی تازەیەو چەند مەعنا و مەبەستێکی گرنگی هەیە کەهیچ میرێکی کورد پێش بەدرخان سەرۆك عەشرەتانی کورد بانگ نەکردووە بۆ باس کردنی پاشەڕۆژی گەلی کورد. ئەمەش بەلگەی تەواوی هەست کردنیەتی بەلێپرسراوی بەرامبەر بەگەلەکەی و، هەستێکی نەتەوەییە لەئاستێکی بەرزدا بەنیسبەت ئەو کاتەوە. لەو پەیمانە پیرۆزەدا بەشێکی زۆری ئەو سەرۆك عەشیرەتانە بەشداربوون کەوەپیر بانگەکەی بەردخانی گەورەوە چوون، وەکو: مستەفا بەگ و دەروێش بەگ و خان مەحمود و نوروڵڵا بەگ و فەتاح بەگ لەهەکاری و خالید بەگ لەخیزان و شەرەف بەگ لەمووشی و میرانی ئەردەلان[2] لەناوی سەرۆك عەشیرەتەکاندا بوونی میرانی میرنشینی ئەردەلان لەهاوپەیمانییەکەدا دەبینرێ، کەچی سەربە حکومەتی ئێران بوون و، ناوی بنەماڵەکانی بابان و سۆران نەهاتووە. ڕەنگە بەشداری میرانی ئەردلان بەپشتگیری و هاندانی حکومەتی ئێران بووبێ، بۆ ئەوەی جەنگاوەرانی دژی دەوڵەتی عوسمانی ژمارەیان زیاتربێ، ئەمەش بەشێکە لەهەوڵی تۆڵە سەندنەوە لەعوسمانییەکان، یان چوونە ناو شەڕێکی ناڕاستەوخۆ دژی و، ڕەنگە بەشدارنەبوونی بابان و سۆران لەکوردستانی باشووردا بگەڕێتەوە بۆ:

١-نەبوونی پەیوەندی لەنێوان بەدرخانی گەورەو میرانی کوردی کوردستانی باشور.

٢-روخانی میرنشینی سۆران لەساڵی ١٨٣٦داو ڕوودانی ئاژاوەو گەڕانەوەی حوکمی مەرکەزی عوسمانی بۆ ناوچەکە.

٣-رووخانی میرنشینی بادینان لەساڵی ١٨٤٢داو دامەزراندنی فەرمانڕەوای تورك لەبری کورد.

٤-دووری ناوچەی دەسەڵاتی میرنشینی بابان لەسنووری میرنشینی بۆتانەوە.

٥-هێرشی سوپای عوسمانی بەسەرکردایەتی سەرەك وەزیرانی پێشوو محەمەد ڕەشید پاشا لە ١٨٣٤دا و بەشداری سوپای هەردوو ولایەتی موسڵ و بەغدا لەپرۆسەی سەربازییەکان لەکوردستانی باشووردا بوونە مایەی ڕووخان و سوتانی زۆر گوندو شارو ڕوودانی تاڵان و زەوت کردن تێیدا، کەخەڵکی ناچارکرد بۆ بەرزاییەکان هەڵبێن و،

---

[1] جلیلی، کوردەکان، ل٢١٣-٢١٤/ سەجادی، عەلائەدین: شۆڕشەکانی کورد، بەغدا ١٩٥٩، ل٤٥.
[2] بلەج: القضیة الکردیة، ص٥٢/ شەمزینی، جولانەوە، ل٥٤/ جەلیلی: کوردەکان، ل٢١٤.

ئەمەش بووە مایەی پچڕانی پەیوەندی بەمیرانی بۆتانەوە، جگە لەناخۆشی ڕێگاوبان و نەبوونی ئاسایش لەناوچەکەدا.

سەرۆکە کۆبووەکان ڕێککەوتن لەسەر دابەش کردنی سەرۆکایەتی و پایەکان لەنێوانیاندا پاش ڕزگارکردنی کوردستان[1]. هەروەها بایەخی زۆری بەدرخانی گەورە بە کێشەی کورد و یەکخستنی کورد لەکارە گەورەکەیدا دەردەکەوێ، چونکە زاناو حەکیمانی وەکو شێخ مەحموود لەمووسڵ و شێخ یوسفی لەمزاخۆ[2] ناردە ناوچەی عەشیرەتە کوردەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەوگرفتانەی لەنێوانیاندا ڕوویان داوە، هاندانیان بۆ چوونە ناو پەیمانە پیرۆزەکەوە[3]. وا دەردەکەوێ کەبزوتنەوەی بەدرخانی گەورە لەبزوتنەوە ڕێکوپێکەکانە کە ئیستراتیژێکی ڕوونی هەبووە و ڕەنگە ئەمە هۆی ئەوە بووبێ کەهێندێکیان ناوی (چاخی زێڕین) یان لەسەردەمەکەی ئەو ناوە[4]. گرنگترین کارەکانیشی ئەمانەن:

١-ئامادە نەبوونی بۆ دانی باجی ساڵانەی ئاسایی بەدەوڵەتی عوسمانی و، هاندانی عەشیرەتە کوردەکانیش بۆ نەدانی.

٢-دانانی پلەی شێخی ئیسلام(شێخ الاسلام)، کەمەلا عەبدولقدوس بۆ ئەم پلەیە دانرا، ئەمەش بەڵگەی سەربەخۆیی میرنشینەیە لەدەوڵەتی عوسمانی. هەروەها تاهیر ئاغا بۆ سەرکردایەتی سوپاو حامید ئاغا بۆ سەرکردایەتی سوارەکان و ئەفەندی ئاغا بۆ چاودێری خەزێنە دامەزرێنران.

٣-هەوڵێدا ڕەگی دووبەرەکی تایفەگەری و مەزهەبی لەنێوان موسڵمانان و مەسیحیەکان هەڵبکێشێ، بەڵام لەوەدا سەرنەکەوت چونکە موژدەدەرە بێگانەکان و عوسمانیەکان مەسیحیەکانیان بە دژ بە بەدرخانی گەورە هان دەداو داوایان لێ دەکردن باج بەمیر نەدەن.

٤-نووسەر هەن دەڵێن: بەدرخان پەیوەندی بەئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشای میسر کردووە بۆ یەکخستنی کۆشش دژی عوسمانیەکان[5] و، کورد شان بەشانی میسریەکان لەشەڕی (تریب)ی نزیکی (عەنتاب) بەشداربوون و توانیان

---

[1] جەلیلی: کوردەکان، ل٢١٤.
[2] بلەج شەرکو: القضية الكردية، ص٥٢/ جلیلی: کوردەکان، ل٢١٤.
[3] جەلیلی: کوردەکان، ل٢١٣-٢١٤.
[4] کۆچیرا: کورد لەسەدەی ١٩-٢٠، ل٤٨.
[5] الطالباني، جلال: كردستان والحركة القومية الكردية، بيروت، ط٢، ١٩٧١، ص٨٥.

شکست بەسوپای عوسمانی بێنن، بەڵام دەست تێ وەردانی هەردو دەوڵەت: فەرەنساو بەریتانیا ترازووی هێزی وەرگێڕا[1].

٥-بەدرخان دەستی کردە ئاوەدان کردنەوەی وڵاتو کارگەی بۆ دروست کردنی چەكو باروت دامەزراند[2].

٦-بایەخی بەلایەنی فێرکاریو، نیازی وابوو قوتابیان بۆ دەرەوە بنێرێ بۆ فێربوونی جەنگو پیشەسازی بەو شێوەیەی محەمەد عەلی پاشا لەمیسر کردی[3].

٧-لێدانی پووڵ(پارە)و لەرویەکیدا نووسرابوو(میر بەدرخان بۆتان)و،لەرووەکەی دیکەیدا نووسرابوو(ساڵی١٢٥٨ی کۆچی)[4].

٨-هەواڵگرەکانی دەنارده شوێنەکانی سوپای عوسمانی بۆ هێنانی هەواڵی جموجۆڵی سوپای عوسمانی، ئەمەش بەڵگەی لێزانی گەورەی بەدرخانە لەهونەرەکانی جەنگداو، ناسینی خاڵەکانی لاوازی هێزی دوژمن تا لەگۆڕەپانی شەڕدا بەئاسانی زاڵ بێت بەسەریدا.

٩-سندوقێکی بۆ بەخشش(تبرع)ی جەنگی دامەزراندو خەڵکی هاندا بۆ بەخشش بۆ کۆششی جەنگی. ئەمەش بەکارێکی تازە بۆ خزمەتی بزوتنەوەی تازەی رزگاریخوازی کورد دەژمێردرێ.

١٠-فەرمانیدا پارە بەسەر بێوەژنان بۆ پەروەردەکردنی منداڵانیان دابەش بکرێ، ئەمەش ئاوڕدانەوەیەکی باشە لەلایەن میرنشینیەوە لەو کەسانەی دەست کورتن[5].

١١-بایەخی بەهاتوچۆ لەگۆمی(وان)دا بەهۆی ئاسانی پەیوەندیو بازرگانی لەنێوان ئەو شارانەی دەکەونە رۆخی گۆمەکەوە.

١٢-هەلی سەرقاڵ بوونی دەوڵەتی عوسمانی بەجەنگەکانی لەگەڵ سوپای میسر قۆستەوەو دەستی کردە فراوان کردنی دەسەڵاتیو رزگارکردنی کوردستان[6]،

---

[1] حسێن جاف دەڵێ: دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەدرخانیان بەنەقیبی فەخری لەسوپای عوسمانیدا دامەزراند تا دژی میسرییەکان بجەنگێ‌و، سوپاکەی لەشەڕی نسیبیندا بەشداربوو کەسوپای عوسمانیی تێدا شکستی خوارد. لەئەنجامدا بەدرخان بۆ جزیرە کشایەوەو دەسەڵاتی خۆی بەهۆستنەوەی لاوازیی دەوڵەتی عوسمانی فراوان کرد، صفحات مشرقة من تاريخ الاسرة البدرخانية، مجلة كاروان، العدد٣، السنة ١٩٨٢، ص١٠٠.

[2] وردي، محمد توفيق: كردستان المناضلة، بغداد ١٩٥٩، ص٢٥.

[3] الطالباني: كردستان، ص٨٥.

[4] بلەج: القضية الكردية، ص٥٥/ المانى، انور: الاكراد في بهدينان، ص٢٢٣.

[5] جليلى، جليل واخرون، الحركة الكردية، ص١٩.

[6] جەلیلی: کوردەکان، ل٢١٢/ على، حامد محمد عيسى: المشكلة الكردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها الى سنة ١٩٩١، مصر ١٩٩٣، ص١٦، هەروەها على، د. حامد محمود: للشكلة الكردية).

لەموکریانەوە تا بۆتان[1] و دەوڵەتی عوسمانی لەساڵی ١٨٤٢دەستی دایە نەخشەیەك بۆ لەناوبردنی میرنشینی بۆتان بەچەند قۆناغێك کەبریتین لە:

یەکەم: هەڵگیرساندنی دووبەرەکی تایفەگەری و هاندانی نەستووری(مەسیحی)یەکان بۆ نەدانی باج، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی بەدرخان ناچاریان بکات باج بدەن و، ئەمەش نەستووریەکان پاڵ پێوە نابۆ پەنابردنە بەر کونسوڵگەرییە بێگانەکان، بەتایبەتی هی بەریتانیا لەموسڵ و، دەوڵەتانی ئەورووپای ناچارکرد داوا لەدەوڵەتی عوسمانی بکەن دژ بە بەدرخانی گەورە تەدەخول بکات[2].

دووەم: کارکردن بەلای خۆدا راکێشانی لایەنگرانی میرو کڕینیان لەرێگای ئیغراو بەرتیلەوە[3]. پاشان دەوڵەتی عوسمانی سوپایەکی گەورەی بەسەرکردایەتی عوسمان پاشا کۆکردەوەو هەردوو سوپا لەنزیکی شاری ورمێ پێکداهاتن و هێزەکانی میر بەدرخانی گەورە سەرکەوت[4]، بەڵام یەکێك لەخزمە نزیکەکانی، کەناوی یەزدان شێر بوو هێزێکی گەورەی لەژێر فەرماندا بوو، چووە پاڵ عوسمانیەکان[5]و، پایتەختی میرنشینی(شاری جزیرە)ی دایە دەست داگیرکەرانەوە. کەبەدرخان بەوەی زانی بەپەلە گەڕایەوە بۆ سەنتەری میرنشینی و لەماوەیەکی کورتدا رزگاری کرد، بەڵام لەدەست دانی پایتەخت بۆ ماوەیەکی کورت کارێکی زۆری کردە سەر هێزەکانی بەدرخان و وەی سوپاکەی، چونکە کارگەر خەزێنەکەی تێدابوو و شارەکە دووچاری وێرانی و روخان بوو، ئەمەش کاری کردە سەر داکۆکی میر لەپایتەخت، بۆیە لێ کشایەوەو پەنای بردە بەر قەڵای(ئاروخ)[6]، لەوێدا سوپای عوسمانی ئابلۆقەیاندا بۆ چەند مانگێك، بۆیە ناچاربوو خۆی بەدەستەوە بدات پاش ئەمانی جیهو تەقەمەنی لەقەڵادا، پاشان نێردرا بۆ ئستانە و لێی خۆش بوون[7]، بەڵام ئەو داوای لەبابی عالی(سوڵتان)کرد رێگای پێ بدات لەشەڕی(کریت)دا بەشدار بێت و، چووە ئەوێ و لەشەڕدا ئازایەتی نواندو، ئەمە بووە مایەی ئەوەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی چەند مەدالیایەك و پلەی(ئەمیری لیوا)ی

---

[1] Namo Aziz: O.P.cit.P.١٢٩.

[2] جلیلی، جلیل واخرون: الحركة الكردية، ص٢٠/ نوار: تاریخ العراق، ص١٢٠.

[3] خالفین: الصراع، ص٦٢.

[4] بلەج: :القضية الكردية، ص٥٦/ شەمزینی: جوڵانەوەی، ل٥٥.

[5] بلەج: القضية الكردية، ص٥٦/خالفین: الصراع، ص٦٣/ جەلیلی: کوردەکان، ل٢٤٥/ شەمزینی، ل٥٥/ وردی: كردستان المناضلة، ج١، ص٢٦.

[6] بلەج: القضية الكردية، ص٦٥/ جەلیلی: کوردەکان، ل٢٤٥.

[7] زکی: خلاصە، ص٢٢٨.

پێ ببەخشن، لەکۆتاییشدا هات بۆ شام لەسەر داوای خۆیو لەوێ لەساڵی ١٨٦٧دا کۆچی دوایی کردو لەدیمەشق بەخاك سپێردرا[1].

بەم شێوەیە میرنشینی بۆتان لەساڵی ١٨٤٧دا کۆتایی پێ هاتو دەوڵەتی عوسمانی خەونی بەم سەرکەوتنەوە دەبینی، بۆیە بایەخێکی گەورەی پێدا چونکە هەمو ئەوانەی بەشدار بون لەروخاندنی میرنشینیەیە مەدالیای تایبەتیان بەم بۆنەیەوە پێ بەخشرا کە ناونرا بە(مەدالیای شەڕی کوردستان)و لەیەکێك لەروەکانیدا نووسرابوو(مەدالیای شەڕی کوردستان)و لەرووەکەی تردا وێنەی(قەڵای ئارووخ) کرابوو.

## میرنشینی هەکاری[2]

لەمیرنشینیەیە کوردە کۆنەکانە لەسەدەی شازدەیەمەوە هەبوو[(1)]، دەکەوتە باشووری گۆمی وانو شاری(جولیمەرگ)پایتەختی بوو[3]. میرنشینیەکە بریتیبوو لەیەکێتیەکی عەشایەرىو ئەرمەنو ئاشووریەکان لەسایەیدا دەژیان. حکومەتی ئێران لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا هێندێ عەشیرەتی دژی ئەم میرنشینیەیە هانداو چەند کێشەیەکی بۆ دروست کردو، لەئەنجامدا مستەفا پاشای میری میرنشینی ناچاربوو دان بەسەروەری ئێران بەسەر ئەم میرنشینیەدا بنێ[4]و، هەر بەو شێوەیە مایەوە تا چوارەمین دەیەی سەدەی نۆزدەیەم کەنوروڵلا بەگ فەرمانڕەوایی میرنشینی گرتە دەست[5] پاش دوورخستنەوەی رکەبەرەکەیو، نوروڵلا هاوکاری لەگەڵ بەدرخانی گەورەدا کردو بەپێی بانگەوازەکەیەوە بۆ پێکهێنانی پەیمانی پیرۆز چوو. لەکۆتایی چلەکانو، لەکاتێکدا کەعوسمانیەکان هێرشیان بردە سەر میرنشینی بۆتان، مەبەستیان میرنشینی هەکاریش بوو، چونکە سوپای عوسمان پاشا بەهێزێکی گەورەوە هێرشی بردە سەرو نورولڵا بەگ دەرکی بەوە کرد کەناتوانێ بەرگری ئەم سوپا گەورەیە بکات بۆیە پەنای بردە بەرچیاو، لەوێوە دەستی دایە شەڕی پارتیزانی دژی سوپای عوسمانیو، تا ساڵی ١٨٤٩ زیانی گەورەی پێ گەیاند، پاشان سوپای عوسمانی

---

[1] سەجادی: شۆڕشی کوردەکان، ل٤٧.

[2] حسین، سعدی عثمان: کردستان والامبراطورية العثمانية، ص١٦، ٣٥، ٤٢.

[3] جليلی، جليل، من تاريخ الامارات الكردية في الامبراطورية العثمانية، ترجمة: محمد عبدو، ط١، دمشق ١٩٨٧، ص٧٠.

[4] جليلی: من تاريخ الامارات، ص٧٣/ جليلی واخرون: الحركة الكردية، ص١٣/ جەلیلی: کوردەکان، ص١٢٥.

[5] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٤٩.

توانی نوروڵلا ناچار بکات ناوچەکە بەجێ بهێڵێ و پەنا بۆ ئێران ببات. بەمەش لەساڵی ١٨٤٩دا میرنشینەکە روخاو حکومەتی عوسمانی زیا پاشای بۆ بەرێوەبردنی ناوچەکە دامەزراند[1].

## میرنشینی بەتلیس

لەمیرنشینییە کوردە کۆنەکانە[2]، دەکەوتە باشووری رۆژئاوای گۆمی(وان)ـەوە[3]، ئازایانە بەرگری هەوڵی عوسمانییەکانی بۆ پێشێل کردنی سەربەخۆیی دەکردو، لەسەدەی نۆزدەیەمدا شەریف بەگ میری میرنشینی بوو کەپەیوەندیی باشی لەگەڵ بەدرخانی گەورەی میری بۆتاندا هەبوو وچووە پەیمانی پیرۆزەوە. پاش روخانی میرنشینی بۆتان لەساڵی (١٨٤٧ز)دا عوسمانییەکان توانییان پاش داگیرکردنی زۆر شەریف بەگ بگرن و بردیان بۆ ئستانەو، حوکمی میرنشینی درایە کەسێکی تورك[4]. بەمەش فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینییەش لەساڵی (١٨٤٩ز) دا کۆتایی هات[5].

## میرنشینی بابان

سەرەتاکانی دامەزراندنی میرنشینی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدەیەم، چونکە میر( پیر بوداق) کەنازناوی(بەبە، بابا) نازناوی بوو و(بابان)یش لەوەوە وەرگیراوە، بەدامەزرێنەری میرنشینی دادەنرێ و، لەساڵی(١٥٠٠ز)دا کۆچی دوایی کردو، برازاکەی پاش خۆی حوکمی میرنشینی گرتە دەست[6] زانیاریمان سەبارەت بە سەرەتای میرنشینی کەم، بەڵام یەکێك بوو لەو میرنشینییانەی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دانی پێدانرابوو. مێژووی میرنشینی لەساڵی (١٦٨٦ز)ـەوە روونتر دیارە، لەسەردەمی فەقێ ئەحمەدەوە کەنازناوی(بەبە)ی بۆ خۆی هەڵبژاردو، فەقێ ئەحمەد بەدامەزرێنەری دوا بنەماڵەی میرنشینی دادەنرێ و یەکێکە لەسەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەی

---

[1] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٤٩/ بۆ زیاتر، بڕوانە: حسین، سعدی عثمان: کردستان والامبراطورية العثمانية، ل١٥٢-١٥٣.

[2] شەرەفنامە، ل٣٦٥-٣٨٤.

[3] شەرەفنامە، ل٤٢٥-٤٢٦.

[4] میجرسون: رحلة متنکر، ج١ ل١٥١-١٥٢/ خالفین: الصراع، ص٦٣.

[5] D.Kinnane- D.P.Cit, P.٢٣.

[6] شەرەفنامە، ل٢٩١/ زکی: تاریخ السلیمانیة، ل٤٤/ زکی، محمد امین: تاریخ الدول والامارات الکردیة، القاهرة ١٩٤٨، ل٤١٦ پاشتریش: زکی(الامارات)علی، شاکر علي: تاریخ العراق في العهد العثماني، ل١٨١.

پشدەر[1] میرنشینی چەند پایتەختێکی هەبوو، کەبەپێی باروودۆخی سیاسی بۆهەر یەکێکیان گواستوویەتیەوەو لەوانە: ماوەت و قەڵای بەکراواو قەڵاچوالان و سلێمانی کەبرایم پاشا لەساڵی (١٧٨٤ز) دا دایمەزراند[2]، بەڵام ململانێی نێو بنەماڵە نزیکەی سەرجەمی مێژووی میرنشینیدا بەردەوام بوو و دەتوانرێ بەیەکێك لەهۆ سەرەکییەکانی رووخانی میرنشینی دابنرێ[3]. بەناوبانگترین میری میرنشینی لەسەدەی نۆزدەیەمدا عەبدولڕەحمان پاشای کوڕی مەحموود پاشا بوو کەعەلی پاشای والی بەغدا لەسەر میرنشینی دایمەزراندو[4]، بەهێزو زیرەکی و ژیری ناسرابوو و، خواست و خەونی نەتەوایەتی ئاشکرای هەبوو وبەتەمای دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی بوو، بەڵام ململانێی نێو بنەماڵە هەلی جێبەجێ کردنی ئەوەی بۆ نەڕەخساند[5]، عەبدولڕەحمان پاشا بەشداری کرد لەو هێرشەی دەوڵەتی عوسمانی کردیە سەر وەهابییەکان، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ عەلی پاشای والی بەغدا تێکچوو، پاش ماوەیەك والی سوپایەکی نارد بەڵام لە(پردێ)دا شکستی خوارد، بۆیە والی ناچار بوو خۆی سەرکردایەتی هێرشێك بۆ سلێمانی بکات و، لەساڵی ١٨٠٥دا عەبدولڕەحمان پاشا پەنای بردە بەر ئێران[6] و ئێرانییەکان زۆر پارمەتییاندا، بەڵام لەساڵی ١٨١٣ز کۆچی دوایی کردو پاش خۆی مەحمود پاشای کوڕی جڵەوی میرنشینی گرتە دەست[7] و، سەعید بەگی کوڕی سلێمان پاشای والی بەغدا بەو دامەزراندنە قایل بوو. لەسەردەمی ئەودا میرنشینی بەهۆی دەست تێ وەردانەکانی عوسمانی و ئێرانییەکان لەکاروباری ناوخۆیدا و بەهۆی ململانێی نێو بنەماڵەوە رۆژ بەرۆژ لاوازتر دەبوو. سلێمانی لەسەردەمی مەحمود پاشادا بووە شوێنێکی گونجاو بۆ بەرهەڵستکارانی سەعید بەگی والی بەغدا، لەوانەش: دەفتەردار داودئەفەندی پاشاکە پاشتر بووە والی بەغدا[8] و، سلێمان پاشای برای مەحمود پاشا توانی لەساڵی(١٨٣٤ز)دا مەحمود پاشای برای لەمیرنشینی دووربخاتەوە.

---

[1] زكي: تاريخ السليمانية، ص٥٢-٦٠، زكي: الامارات، ص٤١٧-٤١٨/ حكيم، هلكوت: النقشبندية في كردستان في اوائل القرن التاسع عشر مجلة دراسات كرديه، بن ژمارەو مێژوو، پاریس، ل٥٧.
[2] زكي: تاريخ السليمانية، ص٩٤-٩٥.
[3] زكي: الامارات، ص٤١٧/ جليلي، جليل: من تاريخ الامارات، ص٥٣.
[4] زكي: تاريخ السليمانية، ص١٠٥
[5] زكي: خلاصه، ص٢٢٦.
[6] بۆ زیاتر بڕوانە: زكي: تاريخ السليمانية، ل١٠٢-١٢٤/ جليلي: من تاريخ الامارات الكردية، ص٥٣.
[7] زكي: تاريخ السليمانية، ص١٢٤/ زكي: الامارات، ص٤٢١
[8] بۆ زیاتر بڕوانە: زكي: تاريخ السليمانيه، ص١٢٥-١٣٦.

حوكمی سلێمان پاشا چوار ساڵی خایاند، لەساڵی(١٨٣٤ بۆ ١٨٣٨ز)و لەسەردەمیدا بەتوندی دژی هەمەوەندییەکان جەنگاو سەرکەوت بەسەریاندا[*]، بەڵام لەساڵی(١٨٣٨ز)دا کۆچی کردو سێ کوڕی بەجێ هێشت کە: ئەحمەد بەگو عەبدوڵڵا بەگو محەمەد بەگ بوون، ئەحمەد بەگی کوڕی گەورەی حوکمی گرتە دەست[١]. ئەم بایەخی بەڕێکخستنی ئیداری کاروباری سوپا[٢]دا. میلنجن[٣]دەڵێ: ئەحمەد پاشا لەساڵی(١٨٤٣ز) دا سەرکردایەتی بزوتنەوەیەکی ڕێکوپێکی دژی نەجیب پاشای کردو، سوپایەکی ڕێکخراوی کۆکردەوە کەبریتی بوو لەچەندین تابووری پیادە بەتۆپخانەوە، نەجیب پاشای والی بەغداش پشتگیری عەبدوڵڵا پاشای دژی ئەحمەد پاشای برای دەکرد تاتوانییان لەحوکم دووری بخەنەوەو بینێرن بۆ ئستانەو، حوکمی میرنشینی[٤]درایە عەبدوڵڵا پاشا، بەڵام بەسیفەتی قایمقام نەك میری میرنشینی، حامیەیەکیشیان دانا لەسلێمانیدا کە لەتورك پێکهاتبوو. عەبدوڵڵا پاشای قایمقام نزیکەی چوار ساڵ حوکمی کردو، بەداهاتنی ساڵی(١٨٥١ز) نامیق پاشای گەورەی والی بەغدا بانگی کردو لەوێوە بەکەلەبچە کراوی بۆ ئستانە نێردراو، ئیسماعیل پاشای تورك بەقایمقامی سلێمانی دامەزرێنراو ستەمی زۆری تێدا کرد[٥]. بەم شێوەیە حوکمی میرنشینی بابان لەساڵی ناوبراودا لەناوچوو[٦]، لەمێژووی کوردستاندا سەردەمێکی تازە دەستی پێ کردو، دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەتی عوسمانی شوێنی بنەماڵەی وەرگرت و رەوای بابانی گرتەوە[٧].

ئەمانەش بەشێکن لەهۆیە سەرەکییەکانی روخانی میرنشینی بابان:

١-دەست تێ وەردانی بەردەوامی ئێرانیو عوسمانییەکان لەکاروباری ناوخۆی میرنشینیدا.

---

[*] بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی هەمەوەندییەکان، بڕوانە: فەسڵی دووەم.
[١] زكي: تاريخ السليمانية، ص١٥٨.
[٢] زكي: الامارات، ص٤٢٢/ ادمونز، سی.ج: كردوترك وعرب، ترجمه: جرجيس فتح الله، بغداد١٩٧٦، ص١٥٧.
[٣] ابوبكر، احمد عثمان: كردستان في عهد السلام. مجلة الثقافة، العدد(٥)، السنة ١٠-١٩٨٠، ص٤٩.
[٤] شەرەفنامە، ل٢٩٧/ نوار، د. عبدالعزيز: تاريخ العراق الحديث، القاهرة ١٩٦٨، ص١١٧/ العزاوي: تاريخ العراق، ج٢، ل٩٢/ لونگريك: اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ص٣٤٥.
[٥] سەججادی، عەلائەدین: دوو چامەکەی نالیو سالم، بەغدا ١٩٧٣، ل٧٣-٧٨.
[٦] تاريخ السليمانية، ص١٦١، ١٦٢/ میری بصري: اعلام الكرد، ص٢٨.
[٧] زكي: تاريخ السليمانية، ص١٦٢-١٦٣/ جليلي: من تاريخ الامارات الكردية

۲-پەیمانی دووەمی ئەرزەرۆمی[1] ساڵی(١٨٤٧ز) و دەست تێ وەردانی بەردەوامی ئێران لەکاروباری ناوخۆی میرنشینی، جگە لەبڵاوبوونەوەی نەخۆشی و تاعوون لەمیرنشینیدا[2].

۳-ململانێی بنەماڵە بەهۆی ئارەزووە شەخسییەکانی میرەکان

## هۆکانی روخانی میرنشینییە کوردەکان لەدەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا:

حکومەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەمەوە بڕیاری دابوو، وەکو ڕێبازێکی سیاسی نەگۆڕ، دەسەڵاتی سیاسی ڕەوا لەکوردستاندا نەهێڵێ، کە لەو میرنشینییە ویراسییانە بەرجەستەبوو کە بەکورتی لەلاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژەمان بۆ کردن. دەتوانرێ ئەم خاڵانە بەچەند هۆیەکی رووخانی میرنشینییە کوردەکان لەو سەدەیەدا دابنرێن:

یەکەم: ڕێبازی تازەی دەوڵەتی عوسمانی وەکو باسمان کردو کاری بەرنامە بۆ دارێژراو بۆ جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە لەڕێگای بەکارهێنانی سوپا هێزی گەورەی ئامادەکراو بۆ ئەو مەبەستەو، بەردەوامی هێرشی سوپاکان بۆ سەردانەواندنی میرنشینییەکان و، دڵڕەقی دەوڵەت لەسەرکوت کردنی بەرگری کورددا.

دووەم: بێ باکی میرنشینییە کوردەکان. ئەم میرنشینییانە، مەگەر بەدەگمەن، دەنا هەوڵیان نەداوە بەپێی پێویست کۆششیان دژی دوژمنە راستەقینەکان تەرخان بکەن و لەوانەش لاوازی پەیوەندی لەبوارەکانی: بازرگانی و ئابووری، جگە لەخراپی ڕێگاوبان.

سێیەم: ململانێی نێوبنەماڵە لەمیرنشینییە کوردەکاندا.

چوارەم: نەخوێندەواری بڵاو لەنێو کورددا و لاوازی هوشیاری نەتەوایەتییان.

پێنجەم: ڕەنگە خیانەت لەهێندێ حاڵەتدا رۆڵی لەروخاندنی میرنشینییە کوردەکاندا بینی بێ.

شەشەم: ئەگەرچی میرە کوردەکان لەکاتی دیاری کراودا سوودیان لەململانێی بەردەوامی عوسمانی- ئێرانی وەرگرتبێ، بەتایبەت بەنیسبەت میرنشینی بابانەوە. بەڵام ئەمانە بەروونی شایەتی لەسەر ئەوە دەدەن. فیلیدریك میلنجن لەبارەی میرنشینییە کوردەکانەوە دەڵێ: ((خواست و هیوا نەتەوایەتییەکانی کوردان لەماوەی

---

[1] العزاوي: تاريخ العراق، ج٧، ص٩١.

[2] بۆ زیاتر: بڕوانە: زكي: تاريخ السليمانية ص ١٦٦-١٦٧.

ئەو سەدەیەدا پاڵیان پێوەنان سێجار دەسەڵاتی سوڵتان لەسەر خۆیان لابەن‌و سەربەخۆیی وەدەست بێنن. یەکەمین بزوتنەوە بریتی‌یە لەشۆڕشی محمەد پاشای رەواندزی لەساڵی(١٨٣٤ز)دا. ئەگەرچی پلانە سەرەتایی‌یەکانی پاشا مۆرکی نهێنی بوونی بەخۆوە نەگرتبوو، بەڵام بێگومان ئەو مەبەستی ئەوە بوو وڵاتەکەی لەدەسەڵاتی عوسمانی رزگار بکات. دووەمین بزوتنەوە کەکوردان مەبەستیان ئەوە بوو جەخت لەسەر سەربەخۆیی نیشتمانی‌یان بکەن‌و بیچەسپێنن ئەو بزوتنەوە رێکوپێکە بوو کەلەلایەن ئەحمەد پاشای میری سلێمانی‌یەوە کرا.ئەم میرە سوپایەکی رێکوپێکی ئامادەکرد کەلەچەندین تابووری پیادەی پاڵپشتی کراو بەتۆپخانەو هێزی سوارە پێکهاتبوو و سوپاکەی رووەو پاشای تورکی فەرمانڕەوای بەغدا پێشڕەوی پێ کرد. ئەم رووداوە لەساڵی(١٨٤٣ز)دا بوو. سێیەمین بزوتنەوەی شۆڕشگێڕو گرنگترینیان لەساڵی(١٨٤٧ز)دا روویدا، ئەمیش کەسەرۆکی کورد بەدرخان بەگ سوپایەکی گەورەی کۆکردەوەو لەسەرەتادا دژی نەستووری‌یەکان بەکاری هێناو دوای ئەوەش دژی سوپای تورك بەسەرکردایەتی عومەر پاشا هێرشی هێنا))[1].

## سەرەتای دەسەڵاتی ئەوروپی لەکوردستاندا

هەردوو حکومەتی عوسمانی‌و ئێرانی، سەرەڕای دابەش کردنی کوردستان لەنێوانیاندا، نەیانتوانی سەروەری رەهاکراوی بەسەردا بسەپێنن، بەڵکو سەروەری راستەقینە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا هەر هی میرنشینی‌یە کوردەکان بوو و پابەندبوونی میرنشینی‌یە کوردەکان بەدەوڵەتی عوسمانی‌یەوە هەر بەناوبوو لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە کوردستان بووە شانۆی ململانێی هێزە نێودەوڵەتی‌یەکان، چونکە رووس دەیانویست بگەنە ئاوە گەرمەکەی کەنداو، بۆیە هەوڵیان دەدا کورد بۆ لای خۆیان رابکێشن، بەریتانیاش دەیویست رێگا بازرگانی‌یەکانی دابین بکات‌و بازاڕ بۆ بەرهەمەکانی بدۆزێتەوە. فەرەنساش دەگەڕا بەدوای سەنتەرێکی دەسەڵات لەهەردوو دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێرانی، بەتایبەت لەسەردەمی ناپلیۆندا. ئەم هەوڵانەی دەوڵەتە گەورەکان وردە وردە پارچەکانی دەوڵەتی عوسمانی، گرتەوە لەوانە کوردستان. لەلایەکی دیکەشەوە دەوڵەتی عوسمانی خۆشی سیاسەتێکی سیستماتیکی گرتە بەر بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی لەناوخۆدا، کارەکەش پتر لەپێشبڕکێیەك دەچوو لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی‌و دەوڵەتانی ئەوروپا ، ئەم ململانێیانەش لەسەر حیسابی

---

[1] ابوبکر، احمد عثمان: کردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، العدد(٥)، السنة١٠، مایس١٩٨٠، ص٤٨-٤٩.

سەربەخۆیی میرنشینە کوردەکان بوو. لەلایەکی دیکەشەوە میرنشینی و میرە کوردەکان ڕێگای داکۆکی ڕاستەقینەیان گرتە بەر بۆ پاراستنی کیانە ڕەواکانیان و ڕێگا گرتن لەبەهێزبوونی دەسەڵاتی عوسمانی لەمیرنشینییەکانیان،کە لەڕاپەڕینەکەی عەبدولڕەحمان پاشای بابان و میرنشینی سۆران لەسەردەمی محەمەد پاشای گەورەو میرنشینی بۆتان لەسەردەمی میر بەدرخانی گەورەدا بەرجەستە بوو.

رووسیا و بەریتانیاو ویستیان سوود لەململانێی ئێرانی و عوسمانی بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستەکانیان وەربگرن، بۆیە هەردوو دەوڵەت لەسەرۆك عەشیرەتە کوردەکان نزیك بوونەوە، نەك بۆ بەرژەوەندی کورد، بەڵکو بۆ زیاتر ناسینی کوردو واکێشانی بۆ لای خۆیان. رووسیا ویستی کورد لەململانێی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بێ لایەن بکات[1]. بەریتانیاش ویستی دەسەڵات لەنێو سەرۆکەکانی کورددا پەیدا بکات سەبارەت بەرووسیا ئەوا پەیوەندی بەکوردەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، کەسنوورەکانی کوردستان وردە وردە لەرووسیاوە نزیك دەبووەوە، بەڵام لەدەیەی سێیەمەوە بەشێکی کوردستان چووە پاڵ رووسیاوە[2]یەکەمین پەیوەندی کوردو رووس دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی رووس- ئێران(١٨٠٤-١٨١٣ز)کەفەرماندەی گشتی روس لەجیۆرجیا میر(زیگانۆف) نامەیەکی بۆ حسین ئاغا لەناوچەی یەریڤان لە٢٤/٨/١٨٠٤ز/دا ناردو داوای لێ کرد ریزەکانی هێزەکانی ئێران بەجێ بێڵێ و پەیوەندی بەهێزەکانی رووسیاوە بکات، بەڵام داواکەی لەلایەن حسین ئاغاوە ڕەت کرایەوە. سەرکردایەتی رووس لەساڵی(١٨٠٥ز)دا هەوڵەکەی دووبارەکردەوە بۆ راکێشانی کورد بۆلای خۆی، بەڵام هەوڵەکانی بێ بەر بوون. پاش ئەوەی رووسەکان لەداخوازییەکانیان بێوەر بوون: کاریان بۆ بێلایەن کردنی کورد لەجەنگەکاندا کردو، حکومەتی تزاری پێشنیاری بۆ هێندێ لەکوردەکان کرد تابۆ رووسیا بگوازنەوەو بەڵێنی پێدان هەموو مافەکانیان بپارێزێ[3]. لەماوەی شەڕی رووسی- عوسمانی(١٨٢٨-١٨٢٩ز)دا روسیا هەوڵیدا کورد بۆ لای خۆی رابکێشی و سەرۆکی یەزیدییەکان(حەسەن ئاغا)ڕەبەر داواکەیانەوە چوو وشان بەشانی رووس شەڕی کردو،

---

[1] ابوبکر، احمد عثمان: کردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، العدد ٥، السنة ١٠، مایس ١٩٨٠، ص٤٨-٤٩.

[2] جتويف، خالد: اكراد ارمينيا السوفيتية(ابحاث تاريخية ١٩٢٠-١٩٤٠)(باللغة الروسية)يريڤان ١٩٦٥، ص١٠/ بۆ زیاتر بڕوانە: خالفين: الصراع، ص١٢، ٢٠، ٢١، ٥٥، ١٥٥.

[3] . خالفين: الصراع، ص٤١-٤٢.

هێندێ عەشیرەتی کورد هاوسۆزبوون لەگەڵ رووسدا کەپەیوەندی باشیان لەگەڵ فەرماندە ناوچەیییە کوردەکاندا دروست کرد[1] ئەگەرچی رووس هەوڵیاندا لەهەستی سەربەخۆیی کورد بگەن، بەڵام لەژێرەوە پشتگیری ئەرمەنەکانیان دەکرد، وەکو چەند سەرچاوەیەك بۆی چوون[2].

سەبارەت بە پەیوەندی ئینگلیزی بەکوردەوە، دیارە گەشتیارە ئینگلیزەکان بەبەردەوامی سەردانی ناوچەکەیان دەکرد، بەتایبەت لەسەدەی نۆزدەیەمدا، سەرەرای دووری کوردستان لەئیمپراتۆری بەریتانیەوە. ئەم گەشتانە پاش دروست کردنی خانەی نیشتەجێ بوونی کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵات لەبەغداد لەساڵی(١٨٠٦)دا زیادیان کرد. ریچ بەرپرسی کۆمپانیاکە بوو و گەشتێکی درێژی لەناوچە کوردەکاندا کردو پەیوەندی بەرێبەرانی عەشیرەتە کوردەکانەوە کرد. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا ئینگلیز هێندێ کونسولگەری بازرگانی لەشارەکانی کوردستاندا کردەوە، وەکو ورمێو وان. هەروەها پەیوەندی بەریتانیا لەگەڵ هەر یەك لەئێرانو دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەکی سەلبی کاری کردە سەر پاشەرۆژی کورد[3].

دەشتوانین بڵێین کەمەلەلانێی دەوڵەتانی زلهێزیش لەلای خۆیەوە بەشێوەیەکی سەلبی کاری کردە سەر پاشەرۆژی کوردستان لەو سەردەمەدا.

دەسەڵاتی ئەمریکاو ئەڵمانیا لەناوچەی کوردنشیندا دواکەوت، یەکەمین جاریش لەکوردستانی رۆژهەڵاتدا پەیوەندی ئەمریکا-کورد دروست بوو و چالاکی نێردراوە مژدەدەر(تەبشیری)و خێرخوازە ئەمریکییەکان لەرۆژهەڵاتی ناوەراستدا بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دەگەرێتەوەو لەسەرخۆ گەشەی دەکرد بەهۆی رکەبەری ئەوروپا بۆ چالاکییەکانیان[4].

---

[1] چتویف: اکراد ارمینیا السوفیتیه، ص١٢/خالفین: الصراع، ص٤٤/ جلیلی، جلیل: نهضة الاکراد الثقافیة رالقومیة في نهایة القرن التاسع عشرو بدایة القرن العشرین، ت: بافی نازیو د. ولاتوکدره، ط١، بیروت ١٩٨٦، ص١٤٠.

[2] Derk Kinnane, The Kurds and Kurdistan, ١٩٦١-١٩٧٠. London ١٩٧٣. P ٢٦.
Edgar Oballance: The Kurds and Kurdistan, ١٩٦١-١٩٧٠. London. ١٩٧٣, P.١٩.

[3] خالفین: الصراع، ص٢٧، ٢٩،٣٣/د. جلیلی جلیلی: راپەرینی کوردەکانی، ساڵی ١٨٨٠، وەرگێرانی: د.کاوس قفطان، بەغدا ١٩٨٧، ل٤٨(دواتر: جەلیلی(راپەرین)/ ئەمین، محمد صالح: کوردو عەجەم، ١٨٣.

[4] حتی: فیلیب: موجز تاریخ الشرق الادنی، ترجمة: د. انیس فریحه، بیروت ١٩٦٥، ٢٩٠-٢٩١ فوزی خلیل شویل: تغلغل النفوذ الامریکی في ایران، ١٨٨٣-١٩٢٥، ر. د. غ. اداب، جامعة بغداد، ١٩٩٠، ص٢٠.

**پەیمانەکانی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانیو ئێران لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا:**

پاش رێککەوتنی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ میرە کوردەکاندا لەرێگای ئیدریسی بەدلیسییەوە- وەکو پێشتر روونمان کردەوە[1] کێشەکانی سنوور لەنێوان دوو هەر دەوڵەتدا دەرکەوتنو، هەر دوو دەوڵەت سەرنەکەوتن لەیەکلاکردنەوەی سنووری نێوانیان[2] چونکە سولتان سەلیمی یەکەم عەشیرەتی کۆچەری کوردی وەکو((حەسنانلی))ی لەسنووری ئێرانی- رووسی- عوسمانلیدا نیشتەجێ کردو، بەم شێوازە ئەو خەرجییەی کەم کردەوە کە دانانی سوپاو دروست کردنی قەڵا لەناوچە سنوورییەکاندا گەرەکیتی، جگە لەوەی پارەی بۆ سوپای عوسمانی گل دایەوە تا بۆ مەبەستی دیکە بەکاری بێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا شەر لەسنوورەکاندا هەر بەردەوام بوو و دەبوە مایەی گۆرینی بەردەوامی سنوور[3]، هەردوو دەوڵەت خۆشحاڵ بوون بەبەکارهێنانی کورد وەکو بەربەستی بەشەری لەنێوانیاندا، هەر دەوڵەتێك پارەی دەدایە سەرۆکی تیرە کوردەکان تا بەلای خۆیدا رایان بکێشێ[4]، بەلام کۆچی کورد لەنێوان گەرمیانو کوێستانیاندا بووە مایەی پێکداداني زۆری هەردوو دەوڵەتو وروژاندنی کێشەی زۆر[5] کەبۆ چوار سەدە بەردەوام بوو[6]، لەو ماوەیەدا پەیمانی زۆر گرێ درا. لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا هەردوو پەیمانی یەکەمو دووەمی ئەرزەرۆم لەنێوان هەر دوو دەوڵەتدا بەسترا. پەیمانی یەکەمی ئەرزەروم لەساڵی ۱۸۲۳ لەشاری ئەرزەرۆمی کوردانـدا بەسترا لەئەنجامی شەرو پێکداداکان لەسەر سنوور لەساڵی(۱۸۲۱ز)وە، و لەئەنجامی ئەو شەرانەش ئێران دەستی بەسەر بایەزیدو بەتلیسو ئارجیش گرتو، ئێرانییەکان لەکوردستانی باشووردا گەیشتنە شارەبان[7].
یەکێك لەهۆیە راستەوخۆکانی ئەم شەرانە: کۆچی(۵۰۰)خێزانی کوردی سەر

---

[1] بروانە: ۲۲

[2] پێ رەش: بارزان وحركة الوعي القومي الكردي ١٨٢٦-١٩١٤، ١٩٨٠، ص١٣٤.

[3] جليلي، جليلي، م. س، لازاريف، م.م حسرتيان، شاكر محويان، اولغا جيقالين: الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: د. عبدي حاجي، ط١، بيروت ١٩٩٢، ص١١.

[4] نديم، شكري محمود: احوال العراق في مرحلة المشروطية الثانية، ر. د. غ، آدب، جامعة بغداد ١٩٨٥، ص٧٦.

[5] نوار: تاريخ الشعوب، ج١، ص ١٩٥/ الارحيم، فيصل محمد، تطور العراق تحت حكم الاتحاديين، ١٩٠٨-١٩١٤م، الموصل ١٩٧٥، ص٨٨.

[6] لازاریف: کێشەی کورد ب٢/ ل٥٥٣، بۆ زیاتر بروانە: لونگریك: اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث.

[7] نوار: تاريخ الشعوب، ج١، ص٢٠٧-٢٠٨.

بەعەشیرەتی(حەیدەرانلو) لەئێرانەوە بۆ ناوچەی موشی سەربە دەوڵەتی عوسمانی و، حکومەتی ئێران داوای لێ کردن بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکەی خۆیان، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی داواکەی بەجێ نەهێنا، ولەئەنجامی بەجێ نەهێنانی ئەو داخوازییەی ئێران لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە ئەو شەڕە دژوارانە روویان داو زیانی زۆریان گەیاندە کوردستان[1]، پەیمانەکەش ئەم بەندانەی بەخۆوە گرتبوو[2]:

١-دەست وەرنەدان لەکاروباری ناوخۆی هەر یەکێك لەو دوو دەوڵەتە.

٢-ئازادی گەشتی زیارەتکارانی ئێران بۆ شوێنە پیرۆزەکانی عێراق.

٣-رێگاگرتن لەعەشیرەتەکانی(حەیدەرانلو) و(سپیلکی) لەکۆچ کردن لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە لەناو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانیدا.

٤-هیچ دەوڵەتێك باوەش بۆ هەڵاتووانی ئەوی دیکە نەکاتەوە.

٥-پەیمانەکە کاروباری بازرگانیشی بەخۆوە گرتبوو.

٦-سامانە بەجێ هێڵراوەکانی ئێرانییەکان لەدەوڵەتی عوسمانیدا بۆ خاوەنە وارسە شەرعییەکان دەگەڕێتەوە.

٧-رێکەوتنی هەردوو لایەن بۆ گۆڕینی باڵیوزەکانیان هەرسێ ساڵ جارێك.

**پەیمانی دووەمی ئەرزەروم لەساڵی(١٨٤٧ز)دا:**

یەکەمین پەیمانی ئەرزەروم کە لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانیدا بەسترا کێشەکانی نێوانیانی چارەسەر نەکرد، بەڵکو پێکدادانەکان جاربەجارێ بەردەوام دەبوون. عەلی رەزا پاشای والی بەغدا لەساڵی(١٨٣٧ز)دا شاری موحەمەرەی گرت، ئێرانییەکانیش لەساڵی(١٨٤٢ز)دا شاری کەربەلای پیرۆزیان گرت[3]و، ئەگەر رووسیاو بەریتانیا ناوبژییان نەکردبا، خەریك بوو جەنگێکی گەورە لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا روویدات[4]. رووسیاو بەریتانیش بۆ پاراستنی بەرژەوەندی بازرگانیو دەسەڵاتیان ناوبژییان کرد. وتووێژەکان جارێکی دیکەش لەشاری ئەرزەرۆم لەساڵی(١٨٤٧ز)دا کرانو میرزا جەعفەرخان نوێنەری ئێران بوو وعەبدولمەجید نوری پاشاش نوێنەری

[1] زكي: خلاصه، ص٢٢٤-٢٢٥.

[2] بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی بەندەکانی پەیمانەوە بڕوانە: الضابط، شاكر: العلاقات الدولية، ص٥٦/ ن. أ. خالفين: الصراع على كردستان، ت: احمد عثمان، بغداد ١٩٦٩، ص٣٨-٣٩/ جليلی: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ل٢٥٦/ الطائي، ذنون يونس حسين، الاتجاهات الاصلاحية في الموصل في اواخر العهد العثماني وحتى تاسيس الحكم الوطني، ر. م. غ. اداب، جامعة الموصل ١٩٩٠، ص٧١.

[3] خالفين: الصراع، ص٥٧.

[4] جەلیلی: کوردەکانی، ل٢٥٦.

سولتان. نوێنەری بەریتانیا سەرگورد (فرانت) و نوێنەری حکومەتی تزاری سەرگورد (داتیزی) لەسەرکردایەتی گشتی بەشدارییان کردوئەم لیژنەیە بەلیژنەی تێکەلاو ناسراو، کاری لیژنەکە چوار ساڵ بەردەوام بوو وردشنوسی ڕێکەوتنەکە ئامادەکرا، هەردوولا لەسەرەتادا ڕەقیان کردەوە کەمۆری بکەن، بەلام لەکۆتایی و لەئەنجامی پێ داگرتنی و فشاری دوو دەوڵەتی گەورەی ناوبراودا ناچار بوون مۆری بکەن[1]. پەیمانەکە ئەم بەندانەی بەخۆوە گرتبوو:

١-هەردوو دەوڵەت دەستیان لەهەموو لافە دارایییەکانیان هەلگرت.

٢-ئێران بەڵێنی‌دا بەشی ڕۆژاوای زەهاو بۆ دەوڵەتی عوسمانی بەجێ بێڵێ، دەوڵەتی عوسمانیش بەڵێنی دا بەشی ڕۆژهەلاتی زەهاو بۆ دەوڵەتی ئێران بەێنێتەوە.

٣-ئێران دەست لەهەموو لافێکی لەسلێمانیدا بەرەسمی هەلدەگرێت و پەیمان دەدا دەست وەرنەدا لەکاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی، لەبەرانبەریشدا دەوڵەتی عوسمانی دەست لەهەموو لافێکی لەموحەمەرەو بەندەرەکەی و جەزیرەی خدرو موسا هەلدەگرێ.

٤-دامەزراندنی ئەندازیاری لێهاتوو بۆ دیاری کردن و بڕیاردانی سنوورو، لیژنەکەش لەنوێنەری دەوڵەتی عوسمانی دەروێش پاشاو نوێنەری ئێران میرزا جەعفەرخان و، نوێنەری ڕووسیا (جیرکۆف) و نوێنەری بەریتانیا (ولیامز) پێکهات و، لیژنەکە پتر لەیەك جار کۆبوەوەو سنووری دارشت، بەلام شەڕی کریما لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ڕوسیا لەسالانی (١٨٥٣-١٨٥٦) دا کارو ئەرکەکانی لیژنەکەی پەك خست[2]

٥-دانانی داوەرێك بۆ هەر کێشەیەك زیانی لەیەکێك لەو دوولایەنە دابێ.

٦-دانەوەی هەموو ئەوانەی کۆچیان کردووە، بەپێی بەندەکانی یەکەمین پەیمانی ئەرزەڕۆم (سالی ١٨٢٣ز).

٧-توندکردنی چاودێری سنوورەکان وڕێگانەدان بەپێشێلکاران[3] هەردوو پەیمانەکە لەچەند ڕوویەکەوە کاریان کردە سەر کوردان، کەدەکرێ بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:

---

[1] خالفین: الصراع، ص٥٨-٦٣/ العزاوي: تاريخ العراق، ج٧، ص٧٨/ جەلیلی: کوردەکانی، ل٢٥٦.

[2] بەلگەنامەیەکی بلاوکراوە F.O.٣٧١/١٤١ File No, ١٢٩٨١. Memorandam, By Mr. Parker. no the turco, persian, Boundary Questions,(١٨٢٣-١٩٠٦).

[3] بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی بەندەکانی پەیمانەکەوە بڕوانە: الضابط، شاكر: العلاقات الدولية، ص٤٦/ خالفين: الصراع، ص٥٨-٦٨/ العزاوي، عباس: تاريخ العراق، ج٧، ص٧٧-٧٩/ جەلیلی: کوردەکان ل٢٥٦/ لازاریف: کێشەی کورد، ب٢، ص٤١٧.

١-هەردوو پەیمانەکەو چەند هۆیەکی دیکە ڕێگایان خۆش کرد بۆ لەناوچوونی کیانە سیاسیە کوردییە ڕەواکان.

٢-هەردوو پەیمانەکە، وەکو پێشتر باسم کرد، ڕێککەوتنی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ میرنشین و میرە کوردەکان بەپێی ڕێککەوتنی ساڵی(١٥١٥ز)لەناوبرد، کەسەبارەت بەدان نانی دەوڵەتی عوسمانی بەسەربەخۆیی ناوخۆی ئەو میرنشینیانە بوو.

٣-جموجوولی ئەو عەشیرەتە کوردانەیان کەم کردەوە کەلەهەردوو دەوڵەتدا بەدوای لەوەڕگەدا کۆچیان دەکردو هێندێ عەشیرەتیان کردە دوو لەتەوە.

٤-هەلومەرجی سیاسی لەکوردستاندا لەقۆناغێکەوە چووە قۆناغێکی دیکەوە بەرجەستە بوو لەکۆنترۆڵ کردنی ڕاستەوخۆی کوردستان لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە، کە لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی قانوونی لەساڵی(١٥٢٠ز)دا دەستی پێ‌کردو بەلەناوبردنی میرنشینییە کوردەکان لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا کۆتایی هات.

پاش لەناوچوونی میرنشینییە کوردەکان و دوورخستنەوەی میرە کوردە شەرعییەکان و لەوتانی کیانە سیاسییە ڕەواکان، وەکو لەفەسڵی یەکەمدا باسمان کرد، قۆناغێکی تازەی مێژووی کوردستان دەستی پێ‌کردو هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران ڕاهاتن لەسەر سوود وەرگرتن لەهێزە کوردەکان لەجەنگەکانیاندا بۆ بەکارهێنانیان وەکو سوتەمەنی شەڕەکان، ئەمەش کوردستانی ڕووبەڕووی زیانی ماددی و مەعنەوی گەورە کردەوە. ئەم ڕاستی یانەش بەڕوونی لەو کاتەدا دەرکەوتن کەدەوڵەتی عوسمانی و ئێران و ڕوسیا بەیەکدا هاتن، بەتایبەتی هەردوو دەوڵەتی ڕووسیاو عوسمانی لەزنجیرە شەڕێکی بەردەوام ، لەساڵانی ١٦٧٦-١٨٧٧، واتە لەماوەی نزیکەی دووسەد ساڵدا دە شەڕ لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا بەرپابوو[1].

---

[1] احمد، د. کمال مظهر: کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ترجمة: محمد الملا عبدالکریم، ط٢، بغداد ١٩٨٤، ص٤٣(لێرە بەدواوە: احمد، کمال: کردستان).

## پەیوەندییەکانی رووسیا- کورد پاش ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم

پاش هەردوو شەڕی رووسیا-ئێران(١٨٠٤-١٨١٣)و(١٨٢٦-١٨٢٩)کە بەپەیمانی گوڵستانو تورکمانچای کۆتاییان پێ هات، بەشێکی بچووکی کوردستان بووە بەشێکی ئیمپراتۆری رووسیا[1]. پاش ئەم جەنگانە روسیا شارەزای توانای جەنگاوەرانەی کورد بوو، بۆیە لەهەلومەرجی کوردی کۆڵییەوەو هەوڵیدا چەند فەوجێکیان لێ پێك بهێنێ بۆ ئەوەی شان بەشانی خۆی دژی دەوڵەتی عوسمانی شەڕ بکەنو هانی دان بۆ روسیا کۆچ بکەنو لەئەنجامی ئەوەشدا بەشێکی کوردان بۆ رووسیا کۆچیان کرد، بەتایبەتی بۆ ناوچەی قەرەباغی قەفقاس[2]. لەماوەی شەڕی رووس- عوسمانی(١٨٢٨- ١٨٢٩) دا هەندێ لەسەرخێڵە کوردەکان چوونە پاڵ رووسیاوە[3]، هەندێ خێڵی تریش بەرژەوەندییان لەگەڵ روسیادا بوو چونکە لەناوچەی سنووری هاوبەشدا دەژیانو لەوەرگەکانی کوێستانیان دەکەوتە ناو خاکی رووسیاوە لەچیاکانی ئەلگزو ئەخماخاندا، بۆیە ئەمانە چوونە پاڵ رووسەوە[4]. گرنگی دانی رووسیا بەکورد رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبو، بەتایبەتی پاش ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمو لەشەڕی کریما (١٨٥٣-١٨٥٦)، کەرووس لەکوردەکان دوو فەوجیان پێکهێنا هەر یەکەیان بریتیبوو لەپێنج سەد سوار، یەکێکیان بەفەرماندەیی جەعفەر ئاغاو ئەوی دیکە بەفەرماندەیی ئەحمەد ئاغا بوو ولۆریس میلیکۆف سەرپەرشتی دەکردن. بەشداری ئەم دوو فەوجە لەشەڕیکریما دژی دەوڵەتی عوسمانی لەرووی سیاسییەوە گرنگتر بوو تا لەرووی سەربازییەوە . کورددکان بەئازایەتییەکی بەرچاوەوە شان بەشانی رووسەکان

---

[1] احمد، کمال: کردستان، ص٤٤/احمد، کمال مظهر: چ رێگایەك؟ گۆڤاری بەیان، بەغدا ژمارە(٢)١٩٧٢، ل١-٣.

[2] خالفین: الصراع، ص٤٣/ درة، محمود: القضية الكردية والقومية العربية في معركة العراق، ط١ بیروت،١٩٦٣، ص٣٠-٣١.

[3] چتویف: اکراد ارمینیا، ص١٢/ لازاریف: کێشە، ل٤٨.

[4] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٤٦.

شەڕیان کرد، بەتایبەتی لەشەڕی گوندی بیاندۆ کە بیۆتۆف سەرکردایەتی کرد. سەرکردەی ئەم شەڕەی دوایی دەگێڕێتەوە کەکوردەکان هێرشیان بردە سەر سوپای شکست خواردووی عوسمانیو چەکیان کرد[1]. لەئەنجامی ئەوەدا ژمارەیەکی زۆری سەرخێڵە کوردەکان چوونە ژێر سایەی سەرکردایەتی سیاسی رووسیاوەو داوایان کرد سالآنە رێگایان بدەن کۆچ بۆ ئەودیوی سنووری رووسیاو قەفقاس بکەن. ئەم داخوازییە بەو مەرجە جێبەجێ کرا کە ئازوقە بەسوپای رووس بدەنو لەجەنگی رووسیا- عوسمانیدا هێڵی پاشەوەی سوپاکەیان دابین بکەن[2]، عەبدولفەتاح[3]دەڵێ: روو کردنی کوردان لەرووس لەپێناوی خواستە نەتەوایەتییەکانیانو رزگاربونیان لەستەمی عوسمانییەکان بەقۆناغێکی گرنگی مێژووی کورد دادەنرێو لەئەنجامی ئەم لێك نزیك بوونەوەیەشدا رووسەکان لەکورد دڵنیا بوونو کۆلۆنێل لۆریس میلیکۆف لە ٢ی تشرینی دووەمی١٨٥٤ لەگوندی قزل لەگەڵ قاسم خان[4] کۆبۆوە کەبێ لایەنی هەڵبژاردبوو. کۆلۆنێل بەناوی سەرکردایەتی رووسەوە سوپاسی کوردی کرد کەجەنگاوەریان بەعوسمانییەکان نەداوەو لەجەنگدا بێ لایەن بوونو لەناوچەکانی سنووردا ماونەتەوەو پشێویو ئاژاوەیان نەناوەتەوە بۆ تەگەرە خستنە بەردەم جموجۆڵی سوپای روسیاوە[5]. کۆلۆنێل بەناوی حکومەتی رووسیاوە داوای لەقاسم خان کرد کەواز بێنێ لەپەیوەست بوون بەدەوڵەتی عوسمانییەوەو خۆیو عەشیرەتەکەی، بچن بۆ ناو خاکی رووسیاو ٨٠٠ تا ١٠٠٠ سوار لەکاتی پێویستدا بداتە سوپای رووسیاو هێمنی لەناوچەکانی سنووردا بپارێزێتو رێگا نەدات جەردەو رێگرەکان کێشە دروست بکەن، لەبەرانبەریشدا حکومەتی رووسیا بەڵێن بەقاسم خان دەدات کەدان بەهەموو مافەکانی لەناوچەکەدا بنێو لەکاتی هێرش کردنی سوپای عوسمانی بۆ سەری پشتگیری بکاتو پلەی کۆلۆنیلی پێ ببەخشێ لەگەڵ موچەی خانەنشینی بەدرێژایی ژیانی[6]. لۆریس لێپرسراوەکانی ئاگادار کردەوە کەوتوێژی لەگەڵ قاسم خاندا سەرکەوتوو و ئیجابی بووە. پاش گرتنی بایەزیدو هەڵاتنی هێزە عوسمانییەکان لەهەموو بەرەکان، سۆزی هەندێ لەکوردان بەلای روسەکاندا دایشکاند. لەم رووەوە

---

[1] خالفین: الصراع، ص٧١/ کوردەکان، ل٢٦٨-٢٦٩.

[2] خالفین: الصراع، ص٧١/ جەلیلی: کوردەکان، ل٢٧١.

[3] بۆ زیاتر بڕوانە: یحیی عبدالفتاح علي: عبدالرزاق بدرخان البوتاني، مجلة کاروان، العدد ٦٥، ص١٢٥-١٣٢.

[4] یەکێکە لەسەرۆك عەشیرەتە دەسەڵاتدارەکان لەسنووری رووس- عوسمانی لەپاشالق قارس.

[5] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٧١-٢٧٢.

[6] خالفین: الصراع، ص٧٥/ جەلیلی، کوردەکان، ل٢٧٢-٢٧٣.

روسەکان دەستەیەکی راوێژکاریان لەپیاوماقوولانی شاری بایەزید پێکهێناو سەرۆکایەتی ئەم دەستەیە بە جەعفەرخان سپێردرا[1].

توورەیی حکومەتی عوسمانی لەکورد پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵی هاوکاری کردنی هێندێك لەعەشیرەتەکانیان لەگەڵ رووس زۆر پەرەی سەند. کوردەکان چەندین جار لەماوەی جەنگی کریما هەوڵیان دا پەیوەندی بەرووسەوە بکەن و رایانگەیاند کەئامادەن هاوکاری رووس بکەن و پشتگیری سوپای رووس بکەن کەبەرەو کوردستان دەهات[2] و لەپێناوی رێکخستنی پەیوەندییەکانی رووسیا- کورددا، لۆریس میلیکۆف، بەسەرپشك کردنی لەلایەن مۆراڤییڤەوە، جارنامەی(سیستەمی بەرێوەبردنی تیرە کوردەکان)[3]ی ئامادە کرد، بەڵام پاش ئەوە جێبەجێ نەکرا.

**کورد لەماوەی جەنگی کریما (١٨٥٣-١٨٥٦)**

کێشەکانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و روسیا بەوە پەرەیان سەند کەحکومەتی رووسیای تزاری لەسەردەمی تزار نیکۆلای یەکەمدا داوای کرد فەلە ئەرتۆدۆکسەکانی ناوچە پیرۆزەکان بەپێی پەیمانێکی روون بپارێزرێن، نەك بەپێی فەرمان و مەرسومی عوسمانی، بەڵام عوسمانییەکان داخوازییەکەیان رەت کردەوە و لەئەنجامی ئەوەدا ستراتفۆرد کاننگی باڵیۆزی بریتانیا لەگەڵ باڵیۆزەکانی نەمساو پرۆسیاو فەرەنسادا کۆبوونەوەو هەمویان پشتگیری خۆیان بۆ هەڵوێستی عوسمانی راگەیاندو بەم پشتگیرییە نێودەوڵەتییە، عوسمانییەکان پتر رەقییان نواند، بۆیە دەوڵەتی رووسیا مۆلداڤیاو لاشیای داگیرکرد[4] و دەوڵەتی عوسمانیش رووسیای ئاگادار کردەوە کەدەبێ بکشێتەوە. کاتێك روسیا گوێی بەئاگادارکردنەوەکەی عوسمانییەکان نەدا، دەوڵەتی عوسمانی لە١٦ی تشرینی یەکەمی١٨٥٣دا[5] شەڕی دژی رووسیا راگەیاندو بریتانیاو فەرەنسا پشتگیری هەڵوێستی عوسمانییان کردو ئوستوڵەکانیان لەسەر داخوازی سوڵتانی عوسمانی چوونە تەنگەی دەردەنیلەوە. بەوەش شەڕ لەنێوان رووسیاو دەوڵەتی عوسمانیدا بەرپا بوو و ئەم شەڕە کە سێ ساڵی خایاند بە(شەڕی کریما)ناسرا چونکە لەم ناوچەیەو بەرامبەر بەندەری سیواستبوولی سەر دەریای رەش بەڕێوە چوو. سوپای

---

[1] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٧٦.

[2] خالفین: الصراع، ص٨٠-٨١.

[3] خالفین: الصراع، ص ٨٤.

[4] أ.ج.جرانت، هارولد تمبرلي: اوربا في القرنين التاسع عشر والعشرين ١٧٨٩-١٩٥٠، ترجمة: بهاء فهمي، ط٦ ، القاهرة، ص٤٢٠. بڕ زیاتر بڕوانە تاریخ اوربا في العصر الحديث، ط٧، ترجمة: احمد نجيب هاشم وديع الضبع، ١٩٣٦، ص٢١٨-٢٢١.

[5] التكريتي، هاشم صالح: المسألة الشرقية، المرحلة الاولى ١٧٧٤-١٨٥٦، بغداد ١٩٩٠، ص١٧٥-١٨٥.

عوسمانی، بەهاوکاری ئوستولی بریتانی‌و فەرەنسی، بەرزاییەکانی نیمچە دوورگەی کریمای داگیرکرد[1]، رووسیاش ناوچەی قارسی داگیرکرد[2]. پێش تەواوبونی جەنگی کریما، لە١٨٥٦/٢/١٨دا سولتان عەبدولمەجید بەلگەنامەی ریفۆرمی ناسراو بە(خەت هومایون)ی دەرکرد، بەپێی بەلگەنامەکە تیەرە فەلەکان بە ئەوپەری ئازادیەوە مافی جێبەجێ کردنی نەریتە دینیەکانیان پێ بەخشراو کارە مەدەنیەکانیان لەبەردەمدا کرایەوەو خزمەتی سەربازیان بەسەردا سەپێندرا، بەلام لەهەمان کاتدا مافی دانی بەدەلی پارەیان پێ بەخشرا[3].

حکومەتی نەمسا دەسپێشخەری کرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، بەتایبەتی پاش مردنی نیکۆلای یەکەمی تزاری رووسیاو لەسەر تەخت دانیشتنی ئەسکەندەری دووەمی کەئەنجومەنی وەزیرانەکەی ئامۆژگاریان کرد خۆی لەبەردەوام بوونی ئەم جەنگە رزگار بکا[4]. هەردوو لایەن پاش وتووێژ رێککەوتننامەی پاریسیان لە١٨٥٦/٣/٣٠دا مۆرکرد، کەئەمانە گرنگترین بەندەکانی بوون:

١-رێزگرتن لەمولکەکانی دەولەتی عوسمانی‌و بەشداری کردنی لەهاوسەنگیی ئەورووپادا.

٢-راگەیاندنی بێ لایەنی دەریای رەش.

٣-دەست هەلگرتنی رووسیا لەداکۆکی کردن لەفەلەکانی ناوچەی بالکان.

٤-هێشتنەوەی رووباری دانووب بەئازادی لەبەردەم هاتوچۆی دەریایی نێودەولەتیدا[5].

دەولەتی عوسمانی راهاتبوو لەسەر بەزۆر ناردنی رۆلە موسلمانەکانی گەلەکانی بۆ جەنگ بەقۆستنەوەی هۆکاری ئاینی بۆ شەرعیەتدان بەجەنگەکانی. لەم بوارەدا کورد پتر لەهەموو گەلان بەهەستی ئاینی دەورووژێنرا، بەلام بەتێپەربوونی کات نیازە راستەقینەکانی عوسمانیەکان ئاشکرا بوون، بەتایبەتی پاش روخاندنی یەك لەدوای یەکی میرنشینە کوردەکان، لەسەردەمی سولتان سلێمانی قانوونی لەسالانی سی

---

[1] الدسوقي، محمد كمال: الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، القاهرة ١٩٧٦، ص٢٠٠/ پی رەش: بارزان، ص١٢٥.

[2] محمد قاسم وحسين حسني؛ تاريخ القرن التاسع عشر، ط٥، القاهرة، ١٩٢٨، ص١٨٢.

[3] الدسوقي، محمد كمال: الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، ص٢٠٠.

[4] زين، نورالدين زين: الصراع الدولي في الشرق الاوسط وولادة دولتي سوريا ولبنان، دار النهار، ١٩٧١، ص٣٠(لەمەودوا: زين: الصراع الدولي).

[5] الدسوقي، محمد كمال: الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، ص٢٠١/ هارولد تيمبرلي: اوربا في القرنين، ص٤٢٦/ فيشر: تاريخ اوربا في العصر الحديث، ص٢٢٠.

سەدەی شازدەهەمەوە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، کە دڵڕەقی و سەرسەختی دەوڵەتی عوسمانی بەرانبەر بەکورد زیادی کردو هەموو جۆرە سیاسەتێکی شۆڤێنی دژیان پیادە کرا وەك ڕاگواستن و دەربەدەرکردن و کوشتن و زیادکردنی باج و بەزۆر ڕاپێچ کردنیان بۆ شەڕ لەپێناوی کپ کردنی جۆش و خرۆشی هەستی نەتەوایەتی یان و دوورخستنەوەی ڕێبەرانیان بۆ دەرەوەی کوردستان.

هەموو ئەم خاڵانە بوونە مایەی بڕوا نەمانی کوردو بێزاربوونی لەدەوڵەتانی عوسمانی، بۆیە گەلی کورد چاوەڕوانی هەل بوو بۆ دەربڕینی تووڕەیی و ملکەچ نەکردن بۆ فەرمانی دەوڵەت و بڕوانەکردن بەو دروشمە ئایینیانەی تەنها لەحاڵەتی مەترسیدا بەرز دەکرانەوە. لەگەڵ هەموو ئەو چەوساندنەوەیەشدا بابی عالی لەجەنگدا هیوایەکی گەورەی بەو عەشیرەتە کوردانە بوو کە لەسەر سنووری ڕووسیا- عوسمانی‌دا بوون[1]، بەڵام ڕووسیاش لەلایەن خۆیەوە پێش دەست پێ کردنی جەنگی کریما ڕێککەوتبوو لەگەڵ ئێران کەبێ لایەن بێت و بوار نەدات خێڵە کوردەکان لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتدا هێرش ببەنە سەر سنووری ڕووسیا[2]. ڕەنگە ئەمەش لەوەوە هەڵقوڵابێ کەڕوس دەترسان عوسمانی‌یەکان بەناوی ئایینەوە عەشیرەتە کوردەکان لەئێران هەڵبخەڵەتێنن.

پێش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی دژی ڕووس شەڕ ڕابگەیەنێ، سوپایەکی نارد بۆ شەڕ دژی کوردەکانی دەرسیم، ئەویش بۆ پاراستنی هێڵی پشتەوەی سوپای عوسمانی. سوپای عوسمانی نەیتوانی سەرکەوتنی یەکجارەکی بەسەر کوردی دەرسیمدا وەدەست بێنێ، بەڵام بەپاشەکشێی عەلی بەگی فەرماندەی کوردەکانی دەرسیم بۆ بەرزاییەکانی چیاکان سەرکەوتنی کاتی وەدەست هێنا. سوپای عوسمانی گوندەکانی سوتاندو گۆڕستانەکانی وێران کرد، بەڵام کەسوپای عوسمانی لەناوچەکە پاشەکشەی کردو هێندێ هێزو فەرمانبەری تورکی لەوێ بەجێ هێشت، عەلی بەگ هێرشی کردە سەریان و لەناوچەکە دەری کردن. بەمەش دەسەڵاتی کورد بۆ دەرسیم گەڕایەوە. پاش ئەوەی دەوڵەت، بەهۆی خەریك بوونی بەجەنگی کریماوە، نەیتوانی سوپا بنێرێ تا دەسەڵاتی خۆی بۆ ناوچەکە بگێڕێتەوە[3]، دەوڵەتی عوسمانی ویستی کوردی ناوچەی هەکاری و ڕواندز لەشەڕەکانی دژی ڕووسیا بەکار بێنێ، ئەگەرچی بڕوای پێ‌یان بەهێز

---

[1] جلیل، جلیلی: من تاریخ الامارات الکردیة، ص١٤٣-١٤٥/ جەلیل، جلیلی و اخرون: الحرکة الکردیة، ص٢٤.
[2] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٢٦.
[3] جلیل، جلیلی: من تاریخ الامارات، ص١٤٧.

نەبوو. نزیکەی ٤ تا ٥ هەزار سواری کورد لەهەردوو شەڕی (بیاندوور) و (باشکەلاّ دیکلار) بەشدار بوون و سوپای عوسمانی لەم شەڕانەدا هەلاّت و کوردەکان بوون بەدوژمنی سوپا هەلاّتووەکەو ئازووقەکەیان لیّ زەوت کرد و سەربازەکانیان چەك کرد. لەپاش ئەم شەڕەوە چیدی سوپای عوسمانی بەژمارەیەکی زۆر کوردی بەکار نەهێنا[1]، بەلاّم ئەم رووداوە نەبووە مایەی وەرچەرخانی یەکجارەکی هەلّوێستی عوسمانی بەرانبەر بەکورد، چونکە رەسوول پاشای برای میری گەورە محەمەد پاشای رواندزی سەرکردایەتی خۆبەخشە کوردەکانی لەبەرەی ئەرزەرۆمدا کرد[2] و لەدوورتویّی سەرچاوە مێژوویی‌یەکاندا هیچ باسێکی درێغی کردنی ئەم خۆبەخشانەمان لەشەڕکردندا بەدی نەکرد. پاش برانەوەی جەنگەکە، دەولّەتی عوسمانی رەسوولّ پاشای کردە پارێزگاری قارس و وان[3]. کوردەکان لەبایەزیدیش سەلیم پاشای فەرماندەی سوپای عوسمانی‌یان لەچیای جینگل کوشت و چەك و تفاقیان لەسوپاکە دامالّی[4].

دەسەلاّتدارە عوسمانی‌یەکان ویستیان لەجەنگی کریما پەنا ببەنە بەر عەبدوللاّ پاشای بابان کەپاش روخانی میرنشینەکەی کرابوە قایمقامی سلێمانی و پاشان فەرمانبەرێکی تورك لەشوێنی دانرابوو، بەلاّم رەشید گوزلیکلی والی بەغدا نەیهێشت بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی نەبا کوردەکان هەلّی جەنگی کریما بقۆزنەوە سەر لەنوێ شۆڕش بکەن[5]. بەشداری کورد لەجەنگی کریما تەنها پیاوانی نەگرتەوە، بەلّکو ژنێکی کوردیش بەشدار بوو بەناوی ((قەرە فاتمە)) وە کەخەلّکی (برووس) بوو[6] و ژنی یەکێك لەرێبەرانی عەشیرەتە کوردەکانی ناوچەی مەراشی باشووری ئەناتۆلیا بوو و لەو کاتەدا لای دەسەلاّتدارانی عوسمانی زیندانی کرابوو. ئەم ژنە رێبەرایەتی ٣٠٠ سواری کردو لەجەنگدا شان بەشانی عوسمانی‌یەکان بەشدار بوو. کەدەسەلاّتدارانی عوسمانی بەم مەسەلەیەیان زانی، لەبەر هەلّوێستی جوامێرانەی لەمێژوی دەولّەتی عوسمانیدا بانگیان کرد بۆ ئیستانبول، لەو کاتەشدا دەولّەت زەبرو زۆری بەکار دەهێنا بۆ رێگاگرتن لەچوونی ژنان بۆ دەرەوەی مالّی خۆیان، بەلاّم ئەم ژنە کوردە لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا سەرکردایەتی پیاوانی دەکرد. گەیشتنی ئەم ژنە بۆ پایتەخت

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٤٦-١٥٠.

[2] زکی: الامارات، ص٤١٦.

[3] زکی: الامارات، پەراوێزی ل٤١٥/ نیز جمال: الامیر الکبیر، ص١٥٢.

[4] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٧٥.

[5] نوار: تاریخ العراق، ص١٢٠.

[6] زکی: مشاهیر، ج٢، ترجمة: کریمة، مراجعة: علی عونی، القاهرة، ١٩٤٧، ص٢٤٧.

رۆژێکی دیاری مێژووی ئەو شارە بوو کە تیایدا خەڵك لەجادەکانی پایتەخت ریزیان بەست بۆ ئەوەی قەرە فاتمەو سوارو جەنگاوەرەکانی ببینن[1]. دەوڵەتی عوسمانی، بەهۆی هەڵوێستە دوودڵو راڕاکانی لەبەرانبەر کورددا، نەیدەتوانی بەتەواوی پشتیان پێ ببەستێ.

لەماوەی جەنگی کریمادا هاوسۆزی هەندێ کورد لەگەڵ رووسدا دەرکەوتو هێندێکیان شان بەشانی ئەوان بەشدار بوون. قاسم خان لەویلایەتی قارس بەڵێنی خۆی سەبارەت بە بێ لایەنی پاراست. عوسمانییەکان بۆ قارس بانگیان کرد، بەڵام نەچوو، چونکە دەیزانی ئەگەر بچێ دەیکوژن. بەداهاتنی مانگی تەمموزی ساڵی ١٨٥٥ رووس شاری قارسیان ئابلۆقە داو داوایان لەکوردان کرد هێرش بکەنە سەر ئەو کاروانانەی دەیانەوێ ئازووقە بۆ سوپای عوسمانی ئابلۆقەدراو ببەن، پاشان لەتشرینی دووەمی ساڵی ١٨٥٥دا سوپای رووس قارسی داگیر کرد[2].

ئەم شەڕانە کارەساتی زۆریان بۆ کورد دروست کردو زۆریانی بۆ سنووری رووسیا دەربەدەر کرد، جگە لەوەی ژمارەیەکیان برینداراو پەککەوتەو تووشی برسێتیو نەخۆشی بوون[3]. لەدوووتوێی رووداوەکانەوە سێ ئاراستەی کوردمان لەجەنگی کریما بۆ روون دەبێتە کەدەکرێ ئاوەها کورت بکرێنەوە:

یەکەم: بەرۆکەش پشتیوانی کردن لەدەوڵەتی عوسمانی، لەگەڵ چاوەڕوان بوونی هەلی گونجاو بۆ هەلکوتانە سەر سوپای عوسمانی. ئەمەش چەند جارێك رووی‌دا.

دووەم: داشکانەوەی بەشێکی کەمی کوردان بەلای رووسداو بەشدار بونیان شان بەشانی سوپای رووسیا لەجەنگ دژی عوسمانییەکان، پاشان ملکەچ کردنی کورد بۆ فەرمانی سوپای رووسیا بۆ یارمەتی نەدانی سوپای عوسمانی ئابلۆقەدراو لەقەلای قارسو هێرش بردنە سەر ئەو کاروانانەی ئازووقە کە بۆ ئەو سوپایە دەنێردران[4].

سێیەم: بێلایەنیو بەشدار نەبوونی هەندێ لەکوردان لەجەنگدا، وێڕای مەیلیان بەلای رووسدا.

[1] ابوبكر، احمد عثمان: الزعيمة الكردية قرە فاطمة في حرب القرم، جريدة خبات، العدد ٨٣٩ في ٢٩/٨/١٩٩٧.

[2] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٩٠.

[3] عبدالوحيد، للقدم الشيخ: الاكراد وبلادهم، ط٢، باكستان، ١٩٧٠، ص١٤٧/ وردي، محمد توفيق: الاكراد في الاتحاد السوفياتي، بغداد، ١٩٥٩، ص٨١.

[4] چتويف: اكراد ارمينيا السوفيتية، ص١٢.

## بزوتنەوەی یەزدان شێر

پاش روخانی میرنشینی بۆتان لەساڵی١٨٤٧دا، دەسەڵاتدارە عوسمانیەکان هێندێك لەهێزە سەربازیەکانیان لەو شوێنانەدا دانا کەزۆربەی دانیشتووانیان کوردن، ئەوەش بۆ رێگاگرتن لە بەرپاکردنی بزوتنەوەی دیکە دژی دەوڵەتی عوسمانی لەپاشەرۆژدا. دەسەڵاتداران گۆڕانی گرنگیان لە داموو دەزگا ئیداری و حکومیەکاندا کردو تورکیان لەپلەوپایەکاندا داناو هەر سێ ناوچەی جزیرەو هەکاری و بەرواریان لەیەك ناوچەی ئیداریدا کۆکردەوە[1]. یەزدان شێر بۆ بەرێوەبردنی ئەم ناوچەیە دامەزرێنرا، چونکە هاوکاری لەگەڵ تورکدا کردبوو، ئیتر ئەویش ماوەیەکی کورت لەو پلەیە مایەوە. پاشان حکومەت لی هەڵگەڕایەوەو فەرمانبەرێکی تورکی لەشوێنی داناو هێزێکی زۆری بۆ پشتیوانی لێ کردنی نارد[2]. رەنگە هۆی ئەم هەنگاوە ترسان بێ لەوەی کورد جموجوڵێك دژی دەوڵەتی عوسمانی و فەرمانبەرە تازەکەی بەرپا بکەن. پاش ئەوە یەزدان شێر لەشاری موسڵ ژیاو لەوێ زۆر هاتوچۆی بارەگای جێگری کونسوڵی ئینگلیز کریستیان رەسامی دەکرد[3]، پاش بەرپابوونی جەنگی کریما لەنێوان رووسیاو دەوڵەتی عوسمانی و هاوپەیمانانی، یەزدان ئەم هەلەی قۆستەوە، بەتایبەتی پاش شکستی سوپای عوسمانی لەبەرەی قەفقاسدا[4] و جموجۆڵی دژی عوسمانیەکان بەرپا کردو شاری جزیرەی رزگارکردو نیازی وابوو کوردستانی ئازاد دروست بکاو ببێتە فەرمانڕەوای[5]. گەلی کورد پێشوازی لەبزوتنەوەکە کردو لەدەوری کۆبۆوە، تەنانەت کوڕانی بەدرخانیش کەبابی عالی بەپارەیەکی زۆرەوە ناردبونی تا خۆبەخشە کوردەکان بۆ بەشداری لەجەنگی کریما کۆ بکەنەوە، چوونە پاڵ یەزدان شێرەوە. دەتوانین ئەو هۆیانەی پاڵیان بەیەزدان شێرەوە نا بزوتنەوەکەی بەرپا بکات، لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە:

یەکەم: بێزاری هەمەلایەنەو گشتی خەڵك لەخراپی هەڵسوکەوتی بەرێوەبەرایەتی عوسمانی و زەبرو زۆری فەرمانبەرە تورکەکان دژی گەلی کورد، جگە لە رەفتاری سوپای چوارەمی تورك لەکوردستاندا.

---

[1] جلیل، جلیلي واخرون: الحركة الكردية، ص٢١/ جليلي: من تاريخ الامارات الكردية، ص١٣٦.

[2] شەمزینی: جوڵانەوەی رزگاری، ل٧٩/ هەروەها بڕوانە: الوائلي: اكراد العراق، ص٢٥٧.

[3] Jhons, Guest: The Yezidis, Astudy in Surrival (London), ١٩٨٧. P.١١٢.

[4] لازاریف: کێشەی کورد، ل٥٠.

[5] Gerard Chailand, les Kurdes et Kurdistan ed- muspero Paris. ١٩٨١-P.٤٥.

دووەم: لابردنی کوردەکان لەپلەوپایەیان‌و دانانی تورك لەشوێنیان، ئەمە یەزدان شێریشی گرتەوە، ئەگەرچی زۆر خزمەتی دەوڵەتی عوسمانی لەکاتی ڕاپەڕینی بەدرخانی گەورە لەساڵی ١٨٤٧دا کردبوو.

سێیەم: زیادکردنی ئەو باجانەی بەسەر کورددا سەپێنرا بوون بۆ ئازوقەدان بەو سوپایەی لەکوردستاندا مابەوە پاش ڕوخانی میرنشینەکان و بەزۆر بردنی کوردان بۆ ناو سوپا.

یەزدان شێر هەلی بەرپابوونی جەنگی کریما و کشانەوەی زۆربەی هێزەکانی عوسمانی لەکوردستان قۆستەوەو ژمارەیەکی زۆری ڕۆڵەکانی گەلی کورد لەوانەی چاوەڕوانی هەلێك بوون بۆ دەربڕینی تووڕەییان دژی حکومەت[1]، پشتگیرییان لێ کرد. پاشان یەزدان شێر دەستی دایە چالاکی سەربازی‌و لەتشرینی دوەمی ساڵی ١٨٥٤دا شاری جزیرەی ئازادکردو فەرمانبەرە تورکەکانی لێ وەدەرنا. فەرمانڕەوای شاری ماردین ویستی جزیرە داگیر بکاتەوە بەڵام سەرنەکەوت[2]. پاش ئازادکردنی جزیرە ژمارەیەکی دیکەی کوردەکان چوونە پاڵیەوەو ئەو ناوچانەیان ڕزگارکرد کەدەکەونە نێوان وان‌و موسڵەوە. لەمانگی تشرینی دووەمی ١٨٥٥دا یەزدان شێر دەستی بەسەر شاری موسڵدا گرت کەکارگەیەکی دروست کردنی تۆپ‌و چەکی تێدابوو[3]. بەوەش هێزی یەزدان شێر زیادی کردو دەگوترێ کەژمارەی سەربازەکانی گەیشتە ١٠٠هەزار جەنگاوەر[4]. ڕووبەری بزووتنەوەکە، بەهۆی خەریك بوونی دەوڵەتی عوسمانی بەجەنگەوە لەگەڵ ڕووسیای تزاریدا، فراوانتر بوو، ئەگەرچی دەوڵەت لەبەغداوە هێزێکی بەسەرکردایەتی کەنعان پاشا ناردو لەم سەروبەندەدا لەنزیك شاری سیرت شەڕ قەوما، بەڵام کەنعان پاشا هەڵات‌و هیچ پێشکەوتنێکی وەدەست نەهێنا[5]. بزوتنەوەی یەزدان شێر نزیکەی دوو ساڵ بەردەوام بوو.

---

[1] زکی: خلاصة، ص٢٤١/ بۆ زیاتر، بڕوانە: خالفین، الصراع، ص٧١-٧٩/ لازاریف، صیهیة: الاکراد في ترکیا، الجامعة المستنصریة، ١٩٨٥، معهد الدراسات الاسیویة والافریقیة، سلسلة الدراسات الترکیة، تداول محوره، ص٤٩-٥١ لەسەرەوە: لازاریف: الاکراد في ترکیا/ الوائلي: اکراد العراق، ص٢٥٨/ کوتی رەش: انتفاضة یزدان شیر البرطانی ١٨٥٤-١٨٥٥ مجلة صدی، العدد ٥٧، السنة ١٩٩٦، ص١٠٥-١٠٧.

[2] John Guest. O.P. cit. P ١١٢.

[3] مینورسکی: الاکراد، ص٢٦/ شەمزینی: جوڵانەوەی ڕزگاری، ل٨٠/ جەلیلی: کوردەکان، ل٢٨٠.

[4] شەمزینی: جوڵانەوەی ڕزگاری، ل٨٠/ جلیلي: من تاریخ الامارات، ل١٥٣.

[5] خالفین: الصراع، ص٨٠.

## هەڵوێستی تایفە ئایینییەکان لەبزوتنەوەی یەزدان شێر

تایفە ئایینییەکان، لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەگەڵ هیچ بزوتنەوەیەك هاوکارییان نەکرد بەو شێوەیەی هاوکارییان لەگەڵ بزوتنەوەی یەزدان شێردا کرد، سەرەڕای ئەوەی سوڵتانی عوسمانی عەبدولمەجید (١٨٣٩-١٨٦١) هەوڵیدا جیاوازی بخاتە نێوان بزوتنەوەی یەزدان شێرو تایفە ئایینییەکانو چاندنی دووبەرەکی لەنێوانیاندا، بەڵام لەوەدا سەرنەکەوت[1]، چونکە فەلەو ئێزدییەکان زۆر لەگەڵ بزوتنەوەکەدا هاوکارییان کرد، هاوکارییەکەش سنووری لایەنی دارایی‌و هاندانی بەزاندو بەرەو بەشدار بوون لەجەنگدا شان بەشانی هێزەکانی یەزدان شێر پەرەی سەندو لەم ڕووەوە نەستوورییەکان لەسوپاکەیدا بوونە خۆبەخش[2]هەروەها ئەرمەنەکانیش[3]، ئەوەش کاتێك نەستوورییەکان ڕاپەڕینیان لەجولەمێرگ بەرپاکرد[4]. بەڵام بەشداری ئێزدییەکان، بەهۆی هەستی نەتەوایەتییانەوە، زیاتر بوو، لەم ڕووەوە ئێزدییەکانی شنگار چوونە پاڵ بزوتنەوەکەوە ڕۆڵێکی کاریگەریان گێڕا لەگرتنی شاری مووسڵ‌و ڕزگارکردنی سعرت و دەستیان بەسەر پێنج تۆپیشدا گرت[5]. هاوکاری‌و بەشداری تەنها تایفە ئایینییەکانی نەگرتەوە، بەڵکو عەرەب‌و یۆنانییەکانیش لەشەڕەکەدا بەشدارییان کرد. پاش تێکشکاندنی سوپای کەنعان پاشا پتر لەدوو هەزار عەرەبی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەناتۆلیاو ژمارەیەکی گەورەی یۆنانییەکان چوونە پاڵ بزوتنەوەکەوە[6]. ئەمەش بەڵگەی ئەوپەڕی بێزاری گەلانی عوسمانییە، بەهەموو نەتەوەو تایفەکانیانەوە، لەدەوڵەت‌و ڕەفتاری هەڵەی دژی گەلان، جگە لەخراپی بەڕێوەبردن. سەرجەمی ئەو خاڵانە بوونە مایەی یەکڕیزی خەڵك لەگەڵ بزوتنەوەکەی یەزدان شێر کەبەهۆی هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکانەوە سەرنەکەوت، چونکە سەرنجی ئەوە دەدرێ کەرووس، سەرەڕای ئەوەی لەجەنگدا بوون دژی عوسمانییەکان لەساڵی ١٨٥٣ەوە، لەگەڵ ئەو بزوتنەوەیەدا هاوکارییان نەکرد، ئەگەرچی یەزدان شێر پێنج نامەی بۆ سەرکردایەتی یەریڤان پاش داگیرکردنی بایەزید ناردو پێشنیازی کرد سوپای رووس پێش بکەوێ‌و لەگەڵ هێزەکەی یەزدان شێردا لەنزیك شاری بتلیس یەکبگرن‌و هێرشێکی هاوبەش

---

[1] شەمزینی: جوڵانەوەی ڕزگاری، ل٨٠/ الوائلي: اكراد العراق، ص٢٦٠.

[2] نیکیتین: الاكراد، ص١٨٠.

[3] خالفين: الصراع، ص٧٩.

[4] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٧٩.

[5] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٨٠/ لازاریف: کێشەی کورد، ل٥٠-٥١.

[6] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٨١/ جليلي: من تاريخ الامارات، ص١٥٢.

بکەنە سەر ئەرزەروم، بەڵام پێ دەچێ پێنج نامەکە نەگەیشتبێتە دەستی روسەکان بەهۆی داهاتنی وەرزی زستانو کشانەوەی هێزەکانی رووسیا بۆ مۆڵگەکانی زستانیان[1]. جگە لەمەش، بێبێتۆڤی فەرمانەدەی سوپای رووسیا لەقەفقاس داوای لەیەزدان شێر کرد هێزەکانی بڵاوە پێ بکات، پاشان رووسیا فشاری بەرەی قەفقاسی کەم کردەوەو بەمەش رێگای بۆ عوسمانیەکان خۆش کرد بەشێك لەسوپاکەیان بکێشنەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ یەزدان شێردا[2]، پاشان یەزدان شێر سەر لەنوێ لەساڵی ١٨٥٥دا نامەکاری لەگەڵ فەرمانەدەی یەریڤاندا تازە کردەوەو (ئەسلۆ)ی نوێنەری خۆی نارد، پاش ئەوەی هێزەکانی بەرانبەر بەعوسمانیەکان شکان، رووسەکان بەبیانوی ئەوەی کەبزوتنەوەکەی کۆتایی هات، وەڵامیان نەدایەوە[3].

پێ دەچێ رووس ئامادە نەبوبن یارمەتی کورد بدەن، بەڵکو تەنها لەناوچە سنووریەکانی نزیك خۆیاندا یارمەتیان دەدان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ئەبا کورد کێشەیان بۆ بنێنەوە. ئەوان بەچاوی گومانەوە تەماشای کوردیان دەکرد، مۆرافیۆڤ لەکۆتایی ساڵی(١٨٥٤)دا کەجێگری قەفقاسو فەرمانەدەی فەیلەقی قەفقاس بوو، پێی وابو بزوتنەوەی کوردان لەبەرژەوەندی ئەواندا نیەو کوردان تەنها بۆ داکۆکی لەوڵاتەکەیان شەڕ دەکەنو((ناتوانرێ پشتیان پێ ببەسترێ))[4].

لێرەدا دەردەکەوێ کەهەڵوێستی رەسمی رووسیا لەپاڵ کوردو هاوکاری کردن لەگەڵیاندا دژی عوسمانیەکان نەبووە، ئەگەرچی ئێمە لەکاتی قسەکردن دەربارەی پەیوەندی یەزدان شێر لەگەڵ رووسدا بۆچوونی جۆراوجۆر لەنێوان سەرکردایەتی هێزە سەربازیەکانو دیپلۆماتە رووسەکان دەربارەی کورد بەدی دەکەین.

سەبارەت بەهەڵوێستی ئینگلیزیش دەربارەی بزوتنەوەی یەزدان شێر، ئەوا لەسەرەتاوە دژی بزوتنەوەکەی بوون[5]، بەتایبەتی پاش ئەوەی حکومەتی بریتانیا بەنامەو نامەکاری رێبەری بزوتنەوەکەی لەگەڵ رووسدا زانی، ئیتر حکومەتی بریتانیا نوێنەرە دیپلۆماتەکانی راسپارد هەنگاوی پێویست بۆ سەرکوتکردنو لەناوبردنی

---

[1] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٨٢-٢٨٤/ جلیلي: من تاریخ الامارات، ص١٥٣-١٥٤/ الوائلي: اکراد العراق، ص٢٦١.

[2] شەمزینی: جوڵانەوەی رزگاری، ل٨١.

[3] خالفین: الصراع، ص٨٢.

[4] جلیلي: من تاریخ الامارات، ص١٥٥.

[5] خالفین: الصراع، ص٨١/ سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل٥٠.

بزووتنەوەکە هەڵبهێنن[1]. کۆنسوڵی بریتانیا لەموسڵ پاتریسارك نەفرام سەرپشك کراو دەسەڵاتی زۆری پێدراو پارەی خرایە بەردەست بۆ چاندنی تۆوی دووبەرەکیو کرینی سەرۆك عەشیرەتە کوردەکان بۆ دەست هەڵگرتن لەپشتگیریو بەشداری کردن لەبزووتنەوەکە[2]، کۆنسوڵ پیاوێکی گونجاوی بۆ ئەو ئەرکە هەڵبژارد کەکریستیان رەسامی جێگری بوو کە ئەوکاتە لە جزیرەدا بوو و کریستیانو یەزدان شێر پێشتر پەرژەوەندی بازرگانی هاوبەشیان هەبوو[3].

رەنگە ئەم پەیوەندییە بگەرێتەوە بۆ سەردەمی لابردنی یەزدان شێر لەپلەوپایەکەی پاش ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم کەپاشان نیشتەجێی مووسڵ بوو. رەسام هەڵسا بە ئەرکەکەیو پارەی بەسەر سەرۆك عەشیرەتەکاندا دابەش کرد بۆ کرینی هاوسۆزییانو هان دانیان بۆ بەجێهێشتنی ریزەکانی بزووتنەوەکە، تەنانەت ٤٠٠ کیسە پارەی خستە بەردەم یەزدان شێر[4]، بەڵام نەیتوانی یەزدان شێر قەناعەت پێ بکا دەست لەبزووتنەوەکە هەڵگرێ، دواتر توانی هێندێ لەسەرۆك عەشیرەتە کوردەکان قایل بکاتو لەو کاتەشدا ئینگلیز یارمەتی عوسمانییەکانیان داو لەشەری دژی کورددا پشتگیرییان کرد[5]. بەم شێوەیە هەڵوێستی رەسمی حکومەتی بریتانیا نەك هەر بریتی بوو لەیارمەتی نەدانی یەزدان شێر، بەڵکو هەروەها بریتی بوو لە لەناوبردنی بزووتنەوەکەی. بۆچوونی گشتیش ئەوەیە کەیەزدان شێر داوای یارمەتی لەئنگلیز نەکردووە، ئەگەرچی ئاسان بوو پەیوەندییان پێوە بکرێ، رەنگە ئەمەش بگەرێتەوە بۆ بەهێزی پەیوەندی نێوان دەوڵەتی عوسمانیو حکومەتی بریتانیا. بزووتنەوەکەی یەزدان شێر، وەکو لێکۆڵەرەوەکان دوویاتیان کردۆتەوە، زۆر زوو و بەشێوازێکی چاوەروان نەکراو کۆتایی پێهات، سەرەرای گەورەیی سوپاکەی. دەتوانرێ بگوترێ: نەبوونی رێکخستن لەبزووتنەوەکەدا هۆی سەرەکی ئەم ئەنجامە چاوەروان نەکراوە بوو. لەم سەروبەندەدا دەوڵەتی عوسمانی هێزێکی گەورەی بەسەرکردایەتی رەشید پاشای والی بەغدا بۆ جزیرە نارد، جگە لەهێزەکەی حیلمی پاشای والی مووسڵو عوسمانییەکان توانییان هێزێکی ئێزدی بۆ لای خۆیان رابکێشن لە دوو هەزار سوار پێکهاتبوو و میر حسێن بەگ فەرماندەیان بوو، کەتوانی زاخۆ داگیر بکات، هێزەکانی دیکەش

---

[1] خالفین: الصراع، ص٨١.

[2] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٨٣-٢٨٤.

[3] Johns Guest. OP.Cit. P ١١٤.

[4] خالفین: الصراع، ص٨١.

[5] عەسمان سەرچاوە، ل٨١.

توانییان پاش شەرێکی سەخت دەست بەسەر جەزیرەدا بگرن، ئەمەش بووە مایەی هەڵهاتنی یەزدان شێرو براکەی بۆ جەنگەڵە شاخاوییەکان،[1] پاشانیش لەقەڵای کۆشکەکەدا سەنگەری گرت.[2] لەوێشەوە وتووێژی نێوان کریستیان رەسام و یەزدان شێر دەستی پێ کردو لەئەنجامیشدا، سەرەرای بەڵێن دان بەدابین کردنی سەلامەتی، یەزدان شێر گیرا[3]. ئەم سەرگوزشتەیە تەنها یەك

نووسەر[4] دەیگێڕێتەوە کەدەڵێ:((لەسەرەتای ئاداری ساڵی ١٨٥٥دا ماتیلدا (ژنی کریستیان رەسام کەوەرگێڕ بوو و لەکونسولگەی بریتانیا کاری دەکرد)نێردرا بۆ رۆخی دیجلە لەموسڵ بۆ پێشوازی کردن لەکۆمەڵە پیاوێك کە لەتەنکە بوارێکەوە پەڕینەوە، ئەو کۆمەڵە یەزدان شێرو براکەی‌و پانزدە پیاوی لەلایەنگرانی بەخۆوە گرتبوو. ئەوانە لەژێر پاسەوانی ئەفسەرێکی عوسمانیدا بوون کەراسپاردەیەکی پێ بوو جەنراڵ ولیامز بەناوی هەردوو حکومەتی فەرەنساو بریتانیاوە سەبارەت بەسەلامەتی ئەندامانی ئەو کۆمەڵە دەری کردبوو. سەربازانی حیلمی پاشای والی موسڵ هەوڵیان دا بیانگرن، بەلام پاش چوار سەعات لەگفتوگۆر تکاکردن وەرگێرەکە سەرکەوت لەوەی رێگا بدرێ بۆ کونسولگەی بریتانیا لەموسڵ بگوازرێنەوە. یەزدان شێر پێنج مانگ لەوێ مایەوە تا فەرمان لەباڵیۆزخانەی بریتانیا لەئستانبولەوە هات بۆ تەسلیم کردنیان بەوالی موسڵ‌و پاشانیش والی موسڵ فەرمانی پێ درا بینێرێ بۆ ئستانبول)). هەندێ سەرچاوە دەڵێن یەزدان شێر زیندانی کرا[5] و پاشان لەوێ لەسێدارە درا[6]. بەبۆنەی سەرکەوتن بەسەر بزووتنەوەی یەزدان شێردا دەوڵەتی عوسمانی مەدالیایەکی دروست کردو دابەشی کرد بەسەر ئەو ئەفسەرو سەربازانەی کە لەجەنگەکەدا بەشدار بوون[7].

دەشگوترێ کەلێهاتوویی جێگری کونسولی بریتانیا لەموسڵ((کریستیان رەسام))رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەخۆبەدەستەوەدانی یەزدان شێردا[8].

---

[1] John's Guest, OP. Cit. P.١١٣.

[2] جلیلی واخرون: الحرکة الکردیة، ص٢٥/لالی: الاکراد في ترکیا، ص٥٣.

[3] خالفین: الصراع، ص٨١-٨٢.

[4] Johns Guest, O.P. Cit. P.١١٤

[5] خالفین: الصراع، ص٨٢.

[6] حیدر، کاظم: الاکراد من هم والی این، ط١، بیروت ١٩٥٩، ص٢٣.

[7] مینورسکی: الاکراد، ص٢٧/ جەلیلی: کوردەکان، ل٢٨٥.

[8] خالفین: الصراع، ص٨١-٨٢.

سەرچاوەیەکی دیکەش دەڵێ: هۆی راستەقینەی خۆ بەدەستەوەدانی یەزدان شێر دەگەڕێتەوە بۆ ئەفسەرێکی پۆڵەندی کە لەستافی جەنراڵ ولیامز کاری دەکردو ئەم ئەفسەرە پۆڵەندی‌یە خۆی ئەمری تایبەتی سەلامەتی یەزدان شێری هێناو بۆ مووسڵی برد[1].

بزوتنەوەی کورد پاش خۆبەدەستەوە دانی یەزدان شێر کۆتایی پێ نەهات، بەڵکو عومەر ئاغای برای یەزدان شێر، بە١٠هەزار جەنگاوەرەوە پەنای بردە بەر چیاکان‌و دەوڵەتی عوسمانیش بەهۆی پەیوەندی نێوان رووس‌و عومەر ئاغاوە زۆر ترسا[2].

زانیاریمان دەربارەی عومەر ئاغاو جەنگاوەرانی‌و چارەنوسیان بەدەستەوە نی‌یە، ئایا لەچیاکاندا لێك دابڕان، یان هەر یەکەو چۆوە شوێنی کارو گوندی خۆی، یان عوسمانی‌یەکان بەئیغرای پارە قەناعەتیان پێ هێنان.

لەهەمان کاتدا سوپای رووس بەسەرکردایەتی سۆسلۆۆ لەپاشالك وانی نێوان گۆمی وان‌و ئالاداغەوە پێشڕەوی کردو هێندێ گوندی داگیرکردو زیانی پێ گەیاندن، ئەمەش ناوبانگی رووسیای لای کورد زڕاند[3]. لەساڵی ١٨٥٦دا کوردان لەناوچەی وان بزوتنەوەیەکی دیکەیان دژی عوسمانی‌یەکان بەرپا کرد کەعەشیرەتی راشکوتانلی‌و ئێزدییەکان بەرپایان کرد. هەروەها دانیشتوانی دەرسیمیش بزوتنەوەیەکیان بەرپا کردو دانیشتوانی ولایەتی مووش‌و ئەرزەرۆمیش چاویان لەوان کردو[4] بەهیوا بوون رووسەکان یارمەتی‌یان بدەن، بەڵام رووس، هەر بەو شێوەیەی راهاتبوون، یارمەتی‌یان نەدان.

---

[1] Johns Guest, O.P. Cit. P.١١٤

[2] خالفین: الصراع، ص٨٣.

[3] خالفین: الصراع، ص٨٣-٨٤.

[4] جەلیلی: کوردەکان، ل٢٩١.

## کوردستان لە پاش شەڕی کریماوە تا بەرپا بونی شەڕی رووسیا- عوسمانی لەسالانی ١٨٧٧-١٨٧٨دا

بەراگەیاندنی جەنگ لەنێوان هەردوو لایەنی رووس- عوسمانی ولاتی کوردان بووە گۆڕەپانی جەنگی نێوان هەردوولا، بەتایبەتی لەناوچەی قارس، ئەمەش بووە هۆی سوتاندن و روخاندنی زۆر گوندو کوشتارو بلاوبوونەوەی برسێتی و نەخۆشی لێ کەوتەوەو بەکۆمەڵ خەڵك بەرەو ناوچەکانی دیکە کۆچیان کرد[1].

لەسەرەتای ساڵی ١٨٥٦دا پروپاگەندە بلاوبووەوە کەرووس خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی جارێکی دیکە هێرش ببەنە سەر دەوڵەتی عوسمانی و کوردانیش دڵخۆش بوون بەهیوای سوود وەرگرتن لەم هەلە[2]. لەو کاتەدا باروودۆخ لەکوردستانی عوسمانیدا لەخراپەوە بۆ خراپتر هەنگاوی دەنا بەهۆی تێکچوونی پەیوەندییە کۆمەلایەتی و ئابووری و ئیدارییەکان[3]. سەرەڕای ئەمەش، دەسەلاتدارە عوسمانییەکان ئیسماعیل حەقی پاشایان بەلێپرساوی کوردستان دامەزراندو ئیسماعیل حەقی توندوتیژی و دڵڕەقی بەکار هێنا بۆ گێڕانەوەی دەسەلاتی مەرکەزی بۆ کوردستان و چەند شالاوێکی توندی کردە سەر کوردەکانی بۆتان و هەکاری[4] و سەرەڕای چەندین هەوڵ نەیتوانی حوکمی مەرکەزی بۆ ناوچەی دەرسیم بگێڕێتەوە[5].

دانیشتووانی دەرسیم لەلایەنگرانی مەزهەبی عەلی ئیلاهی بوون و بەئازایەتی و یەکدەنگی ناسرا بوون[6].

دەسەلاتدارە عوسمانییەکان، سەرەڕای هەموو ئەو کارەساتانەی بەهۆی جەنگ و تەنگەتاوی ئابوورییەوە تووشیان بوو، بەدڵڕەقییەوە لەگەڵ کورددا رەفتاریان کردو باروودۆخی عەشیرەتەکان لەسەردەمی سوڵتان عبدولعەزیزدا (١٨٦١- ١٨٧٦) داتەپی بەهۆی زۆری ئەو باجانەوە کەبەسەریاندا سەپێنرا بوو لەکاتێکدا بەرهەمی

---

[1] جلیلی: من تاریخ الامارات الکردیة، ص١٥٦/ عبدالوحید: الاکراد وبلادهم، ص ١٤٧/ وردی: الاکراد في الاتحاد السوفیتي، ص٨١.

[2] لازاریف: کێشەی کورد، ل٥٢.

[3] خاللفین: الصراع، ص ٨٦.

[4] خاللفین: الصراع، ص ٩١/ لازاریف: کێشەی کورد، ل ٥٣.

[5] لازاریف: کێشەی کورد، ل ٥٨.

[6] هەمان سەرچاوە، ل ٥٣.

کشتوکاڵ لەکوردستاندا کەم ببۆوەو برسێتی بڵاوببۆوە، جگە لەمەش حکومەت رێژەی باجەکانی لە ١٠٪ ەوە بۆ ١٥٪ لەساڵی ١٨٧٦دا بەرزکردەوە[١]. سەرەڕای ئەمانە، دەرەبەگەکانیش لەکوردستاندا باجیان لەگوندنشینەکان دەسەند. باجەکانیش تەنها بەرهەمە کشتوکاڵیەکانیان نەدەگرتەوە: بەڵکو باجی سەر ئاژەڵیش، بەتایبەتی مەڕو ماڵات، زیاد کرا، لەئەنجامی ئەم باجە زۆرانەدا جووتیاری کورد نەیتوانی بەرگە بگرێ‌و زۆریان ناچار بوون بەرەو شارەکان، یان چیاکان، یان دۆڵەکان، بۆ رزگار بوون لەباج، کۆچ بکەن[٢].

والیە عوسمانیەکان چ لەکوردستان‌و چ لەعیراقدا عەشیرەتە کوردو عەرەبەکانیان لەجەنگدا دژی رکەبەرە تایبەتیەکانی خۆیان بەکار دەهێنا[٣]. مەدحەت پاشای والی (١٨٦٩- ١٨٧٢) شاڵاوێکی بەهێزی کردە سەر کوردە ئێزدیەکان‌و جەنگاوەری لەچەندین شوێنی جۆربەجۆر، لەماردینەوە بۆ شارەزوور، کۆکردەوەو پاڵپشتی تۆپخانەی بۆ ئەو هێزانە دانا، ئەویش بەمەبەستی گرتنی هەندێ لەبەرهەڵستکاران‌و بەزۆر بەسەربازگرتنی ئەوانەی توانای هەڵگرتنی چەکیان هەیە[٤]. شێوازی بەسەربازگرتن یەکێك بوو لەبێزراوترین شێوازەکانی تورك لای هاوولاتیەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەگشتی‌و ئەمەش پاڵی بەژمارەیەکی زۆری رۆڵەکانی عەشیرەتە کوردو ناکوردەکانەوە نا بۆ هەڵاتن لەدەست ئەم شێوازە بێزراوە. دەسەڵاتدارە عوسمانیەکان هەندێ هەنگاویان هەڵهێنا بۆ کەم کردنەوەی دیاردەی هەڵاتن[٥]، وەکو لابردنی ئەرکی خزمەتی سەربازی لەسەر فەقێکان[٦]و دانانی یاسای بەدەل. بەدەلیش دوو جۆر بوو: بەدەلی پارەو بەدەلی کەسایەتی[٧]. هەروەها رەووف پاشای والی بەغدا توانی لەساڵی ١٨٧٢دا قەناعەت بەهەمەوەندەکان بهێنێ کەیەك سریە جەندرمەیان لێ پێکبێنێ[٨]. بەڵام سەرەڕای ئەمانە شێوازی بەسەربازگرتن، وەکو گوتمان، هەر شێوازێکی بێزراو بوو لای کورد، بۆیە بەهەموو شێوەیەك بەرەنگاری

[١] جەلیلی: راپەڕین، ل ٢٩- ٣١.

[٢] جەلیلی: راپەڕین، ل ٣١.

[٣] العزاوي، عباس: عشائر العراق العربية، ج٢، بغداد ١٩٤٧، ص ٢٦٨/ الارحيم: تطور العراق، ص ٨٩.

[٤] نوار، تاريخ العراق الحديث، ص ١٣٢.

[٥] حسن، جاسم محمد: العراق في العهد الحميدي ١٨٧٦- ١٩٠٩، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، كلية الآداب، ١٩٧٥، ص ٢٣٦.

[٦] د. داود الچلبي: كتاب مخطوطات الموصل، ص ١٨.

[٧] الزوراء، العدد ٤٥٢، ٢٧ ربيع الثاني ١٢٩١هـ/ حسن: العراق في العهد الحميدي، ص ٢٣٦- ٢٣٧.

[٨] جريدة الزوراء، العدد ٣١٦، ١٩ ذي القعدة ١٢٨٩ هـ.

دەسەڵاتدارە عوسمانییەکان بوونەوە بۆ ئەوەی خۆیان رزگار بکەنو لەم بوارەدا کوردی دەرسیم لەریزی پێشەوەدا بوون. لەساڵی ١٨٧٥دا یەکێك لەو دەرەبەگانەی هاوکارییان لەگەڵ دەسەڵاتدارە عوسمانییەکاندا دەکردو ناوی جەلابی بەگ بوو، لەگەڵ چەند پیاوێکیدا کوژران[1]. ئەم دەرەبەگە نزیکەی حکومەتی عوسمانی بوو و دەیویست دەسەڵاتی عوسمانییان بەسەردا بسەپێنێ. هەروەها لە سییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دا کوردە میللییەکان بەسەرکردایەتی تیماوی بەگ پشتگیری سوپای میسریان کرد، کە لەژێر فەرمانی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی دا بوو، کاتێك هێرشی کردە سەر عوسمانییەکان، بەڵام تیماوی بەگ لەیەکێك لەشەڕەکانی نزیکی ماردین، پاش کشانەوەی سوپای میسر، کوژراو پاشان عوسمانییەکان ناوچەکەیان کۆنترۆڵ کرد[2]، پاشان مەحموودی کوڕی سەرکردایەتی میللییەکانی بەدەستەوە گرتو ڤیران شاری کردە بارەگای خۆی، بەڵام عوسمانییەکان لێی دەترسان بەهۆی بەرفراوان بوونی دەسەڵاتی لەنێو کورداندا لەکوردستاندا، بۆیە عومەر پاشای والی دیاربەکر گرتیو خستیە ناو زیندانەوە، بەڵام برایم پاشای میللی کوڕی توانی خدێوی ئیسماعیل پاشای میسر بکاتە ناوبژیوان لای سوڵتانو لەم رووەوە خدێوی یارمەتی دا، لەئاکام دا سوڵتان عەبدولعەزیز فەرمانی بەربوونی دەرکردو لێی خۆش بوو. بەڵام پاش ماوەیەکی کەم کۆچی دوایی‌کردو برایمی کوڕی سەرکردایەتی عەشیرەتی میللییەکانی لەساڵی ١٨٧٦دا گرتە دەست[3]. لەساڵی ١٨٧٤یش سوڵتان عەبدولعەزیز چەند شاڵاوێکی کردە سەر ئەو کوردانەی کەهێنەندێ دەسەڵاتیان وەدەست هێنابوو و ولایەتەکانی لێ سەندنەوەو فەرمانڕەوای تورکی بۆ دامەزراندن[4].

هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو ئێران پاش جەنگی کریما ناکۆکییان هەر بەردەوام بوو، بەتایبەتی لەکوردستانداو لەم سەروبەندەدا عوسمانییەکان قوتوریان داگیر کردو ئێرانییەکانیش بەشی رۆژاوای زەهاو[5].

پاش کۆتایی جەنگی کریما، کەبەهۆیەوە چالاکییەکانی لیژنەی چەسپاندنی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێرانو عوسمانی راگیران، چاو بەکێشەی سنووری

---

[1] خالفین: الصراع، ص ٩٠- ٩١.

[2] زكي: خلاصة، ص ٢٢٢.

[3] ابوبكر، احمد عثمان: اكراد الملي وابراهيم باشا، بغداد، ١٩٧٣، ص ٢٤- ٢٥ (لەمەودوا: ابوبكر، احمد عثمان: اكراد الملي).

[4] القصراوي: قصة الاكراد، ص ١٥٠.

[5] ادموندز: كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، ص ١٢٦/ حسن، جاسم محمد، العراق في العهد الحميدي، ص ٤١٣.

نێوان هەردوو دەوڵەت خشێنرایەوە، لەم سەروبەندەدا ڕوریێوە ڕووس و بریتانییەکان لەساڵی ١٨٥٧ لەپیترسبۆرگ کۆبوونەوە بۆ کێشانی ئەو نەخشانەی لەماوەی ساڵانی ١٨٥٠ - ١٨٥٢دا کۆیان کردبوونەوە[1]، بەمەبەستی دانانی نەخشەیەکی تەواوی سنوور بۆ هەردوو دەوڵەت. حکومەتی بریتانیا نوێنەرێکی خۆی نارد تا لەگەڵ ئەندازیارێکی رووسدا بەشدار بێت. هەر یەکەیان بەجیاوازی کاری خۆی کردو پاش ئەوەی لەساڵی ١٨٦٥ کارەکانیان تەواو کرد[2]، نەخشەکانیان بەراورد کردو هێندێ جیاوازییان تێدا بەدی کرد، بەتایبەتی لەبواری ناوی شوێنەکانداو هەردوولا کارەکانیان یەکخستو هەشت کۆپییان وەرگرت و دانەیەکی گەورەیان لەساڵی ١٨٦٩دا دروست کرد. ئەم نەخشەیە ناوی نەخشەی یەکخراو (Carte Identique)، یان نەخشەی دەقاودەقی لێ نرا[3].

لەساڵی ١٨٦٩دا سێ کۆبوونەوە کرا بۆ وتووێژ لەنێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی لەسەر بناغەی ڕێزگرتنی هەلومەرجی پێشوو[4] بەڵام حکومەتی عوسمانی ئەم پرۆژەیەی ڕەت کردەوە.

لەسەرەتای حەفتاکاندا لیژنەیەکی هاوبەشی هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی بۆ دیاری کردنی سنووری نێوانیان پێکهێنرا[5]. هەردوو دەوڵەت، پاش کۆبوونەوەیان لەئیستانبول لەساڵی ١٨٧٤دا نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە[6]، ئەمەش بەهۆی تێکچوونی بارودۆخ لەناوچەکانی سنووری نێوانیانداو ڕێك نەکەوتنیان لەسەر دانانی ستونی تەلگراف لەسەر ڕێی بەغدا- کرماشان، ئەم حاڵەتەش بووە مایەی دەست تێوەردانی رووسیاو بریتانیا بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییان[7] و سێر ئەرنۆڵدو کۆلۆنێل زلیۆنی لەساڵی ١٨٧٧دا بۆ ناوبژی نێردران و هەردوکیان پشتگیرییان لەئەنجامی داوەری ساڵی ١٨٥٠ کردو وردە وردە کاری ئەم لیژنەیە پێش کەوت و خەریك بوو ناکۆکییەکان چارەسەر بکات، بەڵام بەرپابوونی جەنگی رووسیا- عوسمانی لەساڵی ١٨٧٧- ١٨٧٨دا کارەکانی لیژنەکەی ڕاگرت[8]. بەڵام خالفینی

---

[1] ادموند: کرد وترك وعرب، ص ١٢٥.

[2] الگوراني: رحلة من عمان الى العمادية، ص ٢١٨- ٢١٩. (لەمەودوا: الگوراني: رحلة).

[3] ادمونڤز: کرد وترك وعرب، ص ١٢٥/ خالفين: الصراع، ص ٩٢.

[270] ادمونڤز: کرد وترك وعرب، ص ١٢٥/ خالفين: الصراع، ص ٩٢.

[5] النجار، مصطفى عبدالقادر: العلاقات السياسية مع القوى المجاورة في شط العرب والخليج العربي، ص ٨٢.

[6] ادمونڤز: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٦.

[7] الگوراني: رحلة، ص ٢١٩.

[8] الگوراني: رحلة، ص ٢١٩/ ادمونڤز، کرد وترك وعرب، ص ١٢٦.

مێژوونووسی[1] رووس جەخت دەکا لەسەر ئەوەی کە ئەم لیژنەیەو هەموو لیژنەکانی دیکە نەیانتوانیوە هیچ کارێکی گرنگ بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەیە بکەن کە کورد تێیدا یاریکەرێکی سەرەکی بوو.

بەم شێوەیە مەسەلەی سنوور بووە مەسەلەیەکی سیاسی نێوان هەردوو دەوڵەتو بووە مایەی دەست وەردانی دەوڵەتە گەورەکان، بەتایبەتی بریتانیاو رووسیا، لەکاروباری سیاسی هەردوو دەوڵەتو تێکڕای رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

لەبەر گرنگی ئەم بابەتە لەم بوارەدا، دەقی قسەکانی ڤینۆکۆڤی جوگرافیناسی رووس تۆمار دەکەین[2].

## جەنگی ساڵانی ١٨٧٧- ١٨٧٨ی نێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانیو رۆڵی کورد تێیدا

رووسیا بەتەمای ئەوە بوو دەست بەسەر تەنگەکاندا بگرێو بگاتە ئاوە گەرمەکانو یەکێتی سلاڤی لەبالکان وەدەست بێنێو دەسەڵاتی خۆی، لەپاش شکانی لەجەنگی کریما، بگێڕێتەوە[3].

سەرلەنوێ، لەساڵی ١٨٧٥ سەوە زنجیرە قەیرانێک لەناوچەی بالکان روویدا کەهەلی رەخساند بۆ دەست وەردانی دەوڵەتانی دیکە لەکاروباری دەوڵەتی عوسمانیدا[4]، ئەویش لەئەنجامی ناکۆکییەکانی نێوان بنەماڵەی فەرمانڕەوا لەسەر دەسەڵات. لەساڵی ١٨٧٦دا جۆرە بۆشایییەکی سیاسی لەدەوڵەتدا روویداو ئەتەوە بالکانییەکان، بەهاندانی رووسیای تزاری، ئەو هەلەیان قۆستەوەو داوای سەربەخۆییان کرد[5].

دەوڵەتان ویستیان ململانێی بالکان لەکۆنگرەیەکدا چارەسەر بکەن کە لەئیستانبول ببەسترێ، بەلام دەوڵەتی عوسمانی ئەوەی رەت کردەوە بەو بیانووەی کەنابێ دەوڵەتانی بێگانە دەست لەکاروباری ناوخۆی وەر بدەن، لەئەنجامی ئەوەشدا رووسیا لە٢٤ /٤/١٨٧٧دا جەنگی دژی دەوڵەتی عوسمانی راگەیاندو ئەم جەنگە

---

[1] خالفین: الصراع، ص ٩٤.
[2] بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٢).
[3] ندیم: احوال العراق، ص ٣٥.
[4] العدول، جاسم محمد حسن: الحرب الروسية- العثمانية لعام ١٨٧٧- ١٨٧٨ واثرها على العراق، مجلة التربية والعلم، جامعة للموصل، العدد ٨، لسنة ١٩٨٩، ص ٨١- ٨٢.
[5] Shaw, Stantord. J:.History of Ottoman Empire and Modren Turkey, Vol. ١,٧. published, Britain, ١٩٨٨.p.١٢٨. . Shaw: o.p. Cit p.١٨٢

درێژەپێدانی جەنگە درێژەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت بوو. ئیمپراتۆری نەمسا بەڵێنی بێ لایەنی لەململانێدا دا بەرووسیا، رۆمانیاش لە١٦/٤/١٨٧٧دا رێککەوتنێکی نهێنی لەگەڵ رووسیا مۆر کردو لەوێشدا رێگای بەسوپای رووسیا دا کە بەزەوی ئەودا تێ بپەڕێ[1]، ئەڵمانیاو ئیتالیاش بەبێلایەنی پابەند بوون، بەڵام حکومەتی بریتانیا بەتوندی دژی جەنگەکە وەستایەوەو یاداشتێکی بۆ حکومەتی تزاری نارد کەتێیدا لەداگیرکردنی ئیستانبول، یان کەناڵی سوێس یان هەر ناوچەیەکی دیکە کە لەڕووی بازرگانییەوە بەبریتانیاوە بەستراوەتەوە، وریای کردەوە[2]. بەم شێوەیە جەنگی هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو روسیا دەستی پێکردو شێخولئیسلام حەسەن خەیروڵڵا دوو فەتوای دەرکرد، یەکەمیان نازناوی غازی بەسوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بەخشیو دووەمیش جیهادی پیرۆزو رەوایی جەنگی تێدا راگەیاند، ئەمەش بەو مەعنایە بوو کەدەبێ هەموو موسڵمانان بەبەشداریکردن لەجەنگەدا پابەند بن[3]. حکومەتی عوسمانی پرۆژەیەکی خستە بەرچاوی پەرلەمان بۆ بەزۆر کردنی فەلەکان بە سەربازو لابردنی بەدەلی پارە، ئەمەش بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ورەی سەربازەکان بوو. سوڵتان عەبدولحەمید رایگەیاند کەسوورە لەسەر بەشداربوون لەشەڕدا، بەڵام مەحمود پاشای زاوای کەفەرماندەی تۆپخانە بوو، قەناعەتی پێ هێنا کەواز لەبڕیارەکەی بهێنێ[4]

سوپای رووسیا دوو بەرەی کردەوە: یەکەمیان لەئەورووپا لەناوچەی بالکانو دووەم لەقەفقاس لەنزیك ناوچەی کوردنشین. سوپای رووسیا لەهەردوو بەرەکەوە پێشڕەوی کرد، ئەوە بوو لەیەکەمین بەرەدا ١٠میلی مابو بگاتە ئیستانبولی پایتەختی عوسمانی[5]، بەڵام نەچووە ناریەوە، رەنگە ئەمەش لەترسی هەڕەشەکانی بریتانیا بووبێ[6]. سوڵتان عەبدولحەمید بروسکەیەکی بۆ ڤیکتۆریای شاژنی بریتانیا ناردو داوای کرد ناوبژی بکات بۆ راگرتنی شەڕو مۆرکردنی ئاگربڕ، لەئەنجامی ئەوەدا شاژن ڤیکتۆریا داوای لەدزرائیلی سەرەك وەزیرانی کرد کەکارێك بکاتو دزرائیلی توانی ئەنجومەنی وەزیران قایل بکات بۆ دەست تێ وەردانو راگرتنی پێشڕەوی هێزەکانی رووسیا. حکومەتی بریتانیا بەهێزترینو تازەترین ئوستولی خۆی نارد بۆ دەردەنیلو

---

[1] العقول: الحرب الروسية، ص٨٢.

[2] الدسوقي: الدولة العثمانية، ص٢٤٩-٢٥٠.

[3] الوردي، علي: لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ج٣، بغداد، ١٩٧٢، ص١٥.

[4] هاسلب، جول: السلطان الاحمر، ترجمة: فيليب، عطا الله، بيروت ١٩٧٤، ل١٤٥(لەمەودوا: هاسلب: السلطان الاحمر).

[5] Johns. Guest. O.P. Cit. PP. ١١٩-١٢٠.

[6] لويس دوللو: التاريخ الدبلوماسي، ترجمة: سموحي فوق العادة، بيروت. ١٩٧٠، ص٣٨.

رووی تۆپەکانی لەهێزەکانی رووسیا کرد[1]، بەوەش پێشڕەوی روسیای بەرەو پایتەختی عوسمانی لە٣/٣/١٨٧٨دا راگرت[2]. لەهەمان کاتیشدا حکومەتی بریتانیا هێزە یەدەگەکانی خۆی بۆ رووبەڕووبونەوەی هەر رووداوێکی کتوپڕ بانگهێشت کردو رۆژنامەکانی بریتانیا رۆڵێکی گەورەیان گێڕا لەکارکردنە سەر رای گشتی بریتانیاو پشتیوانییان لەشاژن ڤیکتۆریا کرد بۆ دەست تێ وەردان و راگرتنی پێشڕەوی رووسیا[3].

لەسەدەی نۆزدەهەمدا، کاتێك کوردەکان ناچار دەکران بچنە شەڕەوە، گۆڕەپانی جەنگیان بەجێ دەهێشت، ئەگەر بیانزانییایە ئەوە زیانی کەمترە و وڵاتەکەشیان زیاتر دەپارێزێ. بۆ نموونە، لەجەنگی ساڵانی ١٨٧٧-١٨٧٨ی نێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانیدا، کوردەکان لەناوچەی بایەزید شەرگەکەیان بەجێ هێشت و گەڕانەوە[4].

هەروەها سەرنج دەدرێ کەحکومەتی عوسمانی، پاش روخانی میرنشینە کوردەکان، سیاسەتی خۆی بەرانبەر بەکورد زۆر کەم دەستکاری کردو لەئاکام دا دەردەسەری کورد هەر بەردەوام بوو و پەیوەندی هێندێ لەعەشیرەتە کوردەکان بەرووسەوە لەجەنگی کریما، وەکو باسمان کرد بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوە. بۆیە دەبینین کورد بەدوای رێگاکانی رزگار بوون لەستەمی ئەم دەوڵەتە دەگەڕێ و بەشێکی کەمیان پێیان وابوو کەرەتگە هاوکاری کردن لەگەڵ رووس شتێکی لێ هەڵکرێتێ، بۆیە هێندێکیان وەپێ فەتواکەی شەیخولئیسلامەوە نەچوون کەبانگەشەی بۆ جیهاد دەکرد[5]، کەچی دەوڵەتی عوسمانی، بۆ خۆپاراستن لەئەگەری دوورکەوتنەوەی کورد، دەستی کرد بەنزیکبوونەوەی زیاتر لەشێخە کوردەکان[6] وەکو شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و کاك ئەحمەدی شێخ لەسلێمانی تا سۆزی کورد بۆ لای خۆی رابکێشێ و شێوازی نەرمی لەم بوارەدا بەکارهێنا، چونکە ئەم جۆرە هەنگاوانە لێیان رادەبینرا متمانەی کورد بەدەوڵەتی عوسمانی بگێڕنەوە، ئەویش لەو روانگەیەوە کەدەوڵەتی عوسمانی تا رادەیەکی زۆر خۆشەویستی زۆربەی کوردی بەهۆی هەنگاوە زۆرەملێیەکانی پێشوویەوە لەدەست

---

[1] الدسوقي: الدولة العثمانية، ص٢٥٣-٢٥٤.

[2] زين، نورالدين زين: الصراع الدولي في الشرق الاوسط، ص٤١.

[3] فيشر: تاريخ اوروبا في العصر الحديث، ص٣٧٠.

[4] جليلي: راپەڕین، ل ٥٣-٥٤.

[5] خالفين: الصراع، ص ١٠٩.

[6] جەلیلی: راپەڕین، ل٥١-٥٢.

دابور[1]. لەهەمان کاتدا حکومەتی بریتانیا هەوڵی دەدا سۆزی کورد بۆ لای دەوڵەتی عوسمانی رابکێشێ تا بەوە بەهێز بێت و لەبەردەم رووسیای تزاریدا خۆی رابگرێ. رووس هەستیان بەم هەنگاوو سیاسەتەی عوسمانییەکان و بریتانیا کردو لەلایەن خۆیانەوە دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لەنێو کوردانداو بەڵێنیان بەهەندێ لەرێبەرانی کورد لەلایەنگرانی خۆیان دا کەهێزێکی سەد هەزار جەنگاوەرییان بۆ ئامادە بکەن، بەڵام ئەمانە راستەوخۆ لەجەنگدا بەشدار نەبوون، بەڵکو تەنها رۆڵیان بریتی بوو لەراگرتنی ئارامی هەلومەرج لەپشتی هێڵەکانی رووسەوە[2]، لەراستیشدا هەر سێ دەوڵەتی عوسمانی و بریتانیاو رووسیا پێشبڕکێیان بوو بۆ راکێشانی سۆزی کوردو هاوکارییان لەگەڵیاندا، بەڵام راستی رووداوەکان دەیسەلمێنێ کەرۆڵی کورد لەهەردوو لایەندا کەم بووە، چونکە کورد درکی بەوە کردبوو کەهیچ بەرژەوەندی لەو شەڕەدا نییە، بۆیە هیچ ئارەزوویەکی بۆ بەشداری لەجەنگدا نەنواندو لەگونجاوترین دەرفەتدا جەنگاوەرانی کورد ریزەکانی سوپای عوسمانییان بەجێ دەهێشت[3]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا عەشیرەتی هەمەوەند شان بەشانی عوسمانییەکان شەڕیان کرد[4]و ئازایەتییەکی بێ وێنەیان لەجەنگدا دەرخست و بەهۆی ئەوەوە سوڵتان عەبدولحەمید بە بەرفراوان کردنی موڵکیان لەناوچەی بازیان پاداشتی دانەوە[5]. ئەو ئەندامانەی عەشیرەتەکەش کە لەشەڕەکەدا بەشدار بوون سوودیان وەرگرت، چونکە چەکە ئاسایییەکانی خۆیان بەچەکی تازە، بەتایبەت تفەنگە رووسییەکان، گۆڕییەوە[6]. هەروەها دەسەڵاتدارە عوسمانییەکان توانییان هەندێ کورد لەژێر سەرکردایەتی کوڕانی بەدرخانی گەورەدا کۆ بکەنەوەو هێندێ پارەیان دانێ تا جەنگاوەر کۆبکەنەوە[7]. هەروەها سوڵتان عەبدولحەمید کاک ئەحمەدی سلێمانی بانگ کرد بۆ دەیدەنی کردنی لەئیستانبول، بەڵام ئەو سەید محەمەد مفتی لەبری خۆی نارد. کەجەنگ بەرپا بوو کاک ئەحمەد هێندێ جەنگاوەری لەلایەنگرانی بۆ بەرەکانی جەنگ

---

[1] خصباک، د. شاکر: الکرد و المسألة الکردیة، ص٢٧.

[2] مینورسکی: الاکراد، ص٨٣/ بۆ زیاتر بروانە: خالفین: الصراع، ص١٠١-١١٠/ خالد چتریف زمارەی ئەوانە بەدوو فەوج دەخەمڵێنێ: اکراد ارمینیا السوفیتیة، ص١٣.

[3] خالفین: الصراع، ص١٠٩.

[4] زکي: تاریخ السلیمانیة، ص١٩١.

[5] نیکیتین: الاکراد، ص١٤٣.

[6] زکي: تاریخ السلیمانیة، ص١٩١.

[7] مرة: اللهجیة الکردیة، ص٢٩/ بلیچ: اللهجیة الکردیة، ص٥٧.

بەناوی جیهادەوەو بەسەرکردایەتی شێخ سەعیدی نەوەی نارد[١]. هەروەها خانمی کورد قەرە فاتمەش لەم جەنگەدا بەشداری کردو رێبەری ٥٠٠ سوار بوو و لەبەرەکانی ئەرزەرۆمو قارسو ئەردەهان شەڕی کردو رۆژنامە میسرییەکان لەکاتی خۆیدا بەشانو باڵیدا هاتن[٢]. سەرەڕای بەشداری هێندێ کورد لەجەنگدا، بەڵام کوردەکان لەبەرەکانی جەنگدا لەعوسمانییەکان بێزار بون، وەکو پێشتر گوتمانو ملکەچی فەرمانەکانیان نەبوونو فەرمانی ئەفسەرە تورکەکانیان جێبەجێ نەکرد. هەروەها سەرکردایەتی سەربازی عوسمانی، کوردی فەرامۆش کردو ئازوقەی نەدەدایە، بەڵکو جەنگاوەری کورد دەبوو ئازوقەی خۆی پەیدا بکاتو ئەمەش زۆرکاری تێ کردنو بووە مایەی ئەوەی ریزەکانی سوپا بەجێ بهێڵنو هەرچی ئازووقەو چەکێکیان لەسەربازە عوسمانییەکان چنگ کەوت لەگەڵ خۆیان بردیان[٣]. ئەفسەرێکی ئینگلیز کەناوی نۆرمانە وتویەتی: کورد هیچ ئارەزوویەکی بۆ شەڕ دەرنەبڕی[٤]، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەزۆریان ناچار کرابوون شەڕ بکەنو لەم سۆنگەیەوە ئازایەتیو توانای خۆیان بەهۆی ستەمی عوسمانییەکانەوە دەرنەبڕی. شەڕی رووسیا- عوسمانی کارێکی گەورەی کردە سەر کورد، بەتایبەتی لەڕووە کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسییەکانەوە[٥]، چونکە ژمارەیەکی زۆریان کوژران و
زیانە ماددییەکانیش بۆ ناوچە کوردنشینەکان زۆر بوون، جگە لەوەی کەبەشێکی زۆریان دەربەدەر بون و بەهۆی هێرش و پەلاماری هێزەکانی سوپای عوسمانیو سوپای رووسیاوە بۆ سەر ناوچە کوردنشینەکان گوندەکانیان وێران بون وئازوقەیان لەبەن هات[٦].

لەوەی باسمان کرد دەردەکەوێ کەخالفین بۆی روون نەکردینەتەوە کەکێن ئەو کوردانەی ئەو کارانەیان دژی دەوڵەتی عوسمانی کردووە، لەکاتێکدا سەرچاوەکان روونی دەکەنەوە کەکورد لەم جەنگەدا بەشدار بوە، لەوانە شێخ عوبەیدوڵڵاو کوڕانی بەدرخانو هێندێ لەرۆڵەکانی عەشیرەتی هەمەوەندو خانمی کورد قەرە فاتمە.

---

[١] زكي: تاريخ السليمانية، ص٢٢٤.

[٢] زكي: مشاهير، ج١، ص٢٤٧.

[٣] خالفين: الصراع، ص١٠٦.

[٤] خالفين: الصراع، ص١٠٧.

[٥] Kandal and othes, peagle With aut Acountry, London ١٩٧٠, P.٣٠

[٦] العدول: الحرب الروسية- العثمانية، ص٨٩.

هەروەها سەرچاوەکان باسی ئەو تالآن و راوو رووتەشیان نەکردووە کەخالفین اماژەی بۆ کردووە، بۆیە ئێمە پێمان وایە ئەو کردەوانەی کەخالفین باسی کردوون بێ گومانن[1].

## هەردوو پەیمانی ساڵی ١٨٧٨ی سان ستیفانۆو بەرلین

دەوڵەتی عوسمانی بەشکست خواردوویی لەشەڕ دەرچوو و لە١٨٧٨/٣/٣ دا پەیمانێك لەنێوان هەردوو دەوڵەتی رووسیاو عوسمانییدا بەسترا، لەلایەن عوسمانی‌یەکانەوە سەفوەت پاشای وەزیری دەرەوە مۆری کرد، کەلەکاتی مۆرکردنەدا دەگریاو لەلایەن روسیاشەوە جەنرال ئەگناتیف مۆری کرد. پەیمانەکە لە(٢٩)مادە پێکهاتبوو[2] کەزۆربەیان لەبەرژەوەندی روسیادا بوون و مەرجی زۆر بەسەر دەوڵەتی عوسمانی سەپێنرا. هەندێ لەبەندە گرنگەکانی پەیمانەکە باس لەوە دەکەن کەرووسیا ناوچەکانی باتووم و قارس و بایەزیدو ئەشگرد دەباو هەموو ئەو قەڵایانە دەبێ بڕوخێنرێن کە بەسەر رووباری دانوبەوە دروست کراون، حکومەتی عوسمانیش پەیمانی دا بەبێ دواکەوتن ریفۆرم لەو ناوچەیەدا بکات کەئەرمەنی تێیدا دەژین[3]. سەبارەت بەهەڵوێستی ئەورووپاش بەرانبەر پەیمانەکە، ئەوا ناڕازیبون سەرتاسەری ئەورووپاو بەتایبەتی بریتانیای گرتەوە[4]، لەبەر ئەوە رووسیا هەستی بەمەترسی کرد، بریتانیاش بەهەموو تواناوە هەوڵی دا پەیمانەکە بەیەکێکی دیکە بگۆڕێت، چونکە روسیا وای لێ هاتبوو هەڕەشەی لەبەرژەوەندییە بازرگانی‌یە جیهانی‌یەکانی بریتانیا[5]دەکرد، بۆیە پەیمانەکە هەڵوەشێنرایەوەو پەیمانی بەرلین جێی گرتەوە.

کۆنگرەیەك لەبەرلین لە١٨٧٨/٦/١٣ تا١٨٧٨/٧/١٣ بەستراو بسمارك راوێژکاری ئەڵمانیا سەرۆکی بوو و دزرائیلی سەرەك وەزیرانی بریتانیا نوێنەری حکومەتەکەی بوو. هەروەها نوێنەرانی ئیتالیاو فەرەنساو ئیمپراتۆری نەمساو مەجەرو یۆنانیش[6] ئامادەی کۆنگرەکە بوون.

---

[1] زكي: تاريخ السليمانية، ص ١٩١-٢٢٤. زكي: مشاهير، ج٢، ص٢٤٧، نيكيتين: الاكراد، ص١٤٣.

[2] علي، اورخان محمد: السلطان عبدالحميد الثاني- حياته وعهده، ط١، رمادي، ١٩٨٧، ص١٢٨-١٢٩.(لەمە بەولاوە: علي، اورخان: السلطان عبدالحميد).

[3] لبيب، حسين: تاريخ المسألة الشرقية، ١٩٢١، ص٨٢.

[4] خالفين: الصراع، ص١٠٩.

[5] باتريك، ماري ملز: سلاطين بني عثمان الخمسة، ترجمة: حنا خضن واخرون، ١٩٣٣، ص٩٣-٩٤.

[6] زلوم، عبدالقديم: كيف هدمت الخلافة، دار الامة ١٩٦٢، ص٤٣-٤٤.

ئەو پەیمانەی لەو کۆنگرەیەدا مۆرکرا لە٦٤ بەند پێکهاتبوو، هێندێکیان پەیوەندییان بەناوچە کوردییەکانەوە هەبوو، وەکو گێڕانەوەی قەزای قوتور بۆ ئێران و دەست هەڵگرتنی رووسیا لەبایەزیدو مەلازکوردو گێڕانەوەیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی[1] هەروەها هێندێ بەندی دیکە باسیان لەوە کرد بابی عالی ریفۆرم لەناوچەکانی ئەرمەندا بکات و ئەوەمەن بپارێزێ و دەوڵەتانی ئەورووپا سەرپەرشتی جێبەجێ کردنی ئەم هەنگاوە ریفۆرمیستانە بکەن. هەروەها کۆنگرە قایل بوو بەوەی رووسیا ناوچەی رۆژهەڵاتی دەریای رەش بۆ خۆی ببات کە هەردوو شاری باتووم و قارس دەکەونە ناریەوە[2]. سوڵتان عەبدولحەمید بەنهێنی پاداشتی بریتانیای دایەوە ئەویش بەوەی کەدوورگەی قوبرسی بەرانبەر بەکرێیەکی ساڵانە پێ بەخشی و بریتانیا بەڵێنی دا کەیارمەتی دەوڵەتی عوسمانی بدات بۆ پاراستنی موڵکەکانی رۆژهەڵاتی لەکوردستان و ئەرمەنستاندا. حکومەتی بریتانیا بەبێ ئاگاداری دەوڵەتانی ئەورووپا دوورگەی قوبرسی دەست کەوت[3]، کاتێك دزرائیلی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی گوتی: "ئاشتییەکی شەرەفمەندانەم بۆ هێنان"[4]. دەوڵەتی عوسمانی ناچار بوو دەست لەئیمتیازێکی زۆر بۆ دەوڵەتانی دیکەش هەڵبگرێ[5]، لەوانە: پشت گوێ خستنی داگیرکردنی تونس لەلایەن فەرەنساوە[6].

ئەگەر بەوردی لەبەندەکانی پەیمانەکە بڕوانین دەبینین هیچی لەبارەی ناوچەکانی کوردەوە باس نەکردوە، ئەوە نەبێ کەیەك جار ناوی کوردی هێناوە، ئەویش لەبواری پاراستنی ئەرمەن لەکورد، لەلایەکی دیکەشەوە پەیمانەکە جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی بەئەرمەن بەخشی و کوردی پشتگوێ خست، بەڵام حکومەتی عوسمانی بەڵێنەکانی خۆی سەبارەت بەریفۆرم لەناوچەکانی ئەرمەندا جێبەجێ نەکرد.

---

[1] خالفین: الصراع، ص ١٠٩.

[2] الحنبلي، شاكر الندي: تلخيص التاريخ العثماني، دون سنة ومكان الطبع، ص١٤٦/ الهلالي، محمد مصطفى: السلطان عبدالحميد الثاني، الموصل، ١٩٩٤، ص١٨. Jonns. Guest. Op.cit.p.١٢٠

[3] د. الماردلن: عبدالحميد ظل الله على الارض، ترجمة: راسم رشدي، ١٩٥٠، ص ١٠٦/ لبيب، حسين: تاريخ المسألة الشرقية، ص ١٨٣.

[4] باتريك: سلاطين بني عثمان، ص ٩٣- ٩٤.

[5] ستيورد، دزموند: تاريخ الشرق الاوسط الحديث، ط٢، ترجمة: زهدي جارالله، بيروت، ص ١٣٦.

[6] Johns, Guest. O. p. cit, p. ١٢٠.

## بزووتنەوەی کوڕانی بەدرخان لەساڵی ۱۸۷۹ دا

بزووتنەوەی کوڕانی بەدرخان بەیەکێك لەگرنگترین دەرەنجامەکانی جەنگی رووسیا-عوسمانی ۱۸۷۷- ۱۸۷۸ دادەنرێت[1]. کاتێك جەنگەکە دەستی پێ‌کرد دەوڵەتی عوسمانی هێزێکی گەورەی خۆبەخشە کوردەکانی کۆکردەوەو سەرکردایەتی ئەو هێزەی بەهەردوو کوڕی بەدرخان: عوسمان پاشاو حسێن پاشا سپارد کەئەفسەر بوون لەسوپای عوسمانیدا[2]، هەردوو برا هەلەکەیان قۆستەوەو بەشێوەیەکی نهێنیی رێککەوتن لەگەڵ ئەو رێبەری عەشیرەت‌و ئەفسەرە کوردانەی لەخزمەتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون تا بچن بۆ کوردستان‌و سەربەخۆیی رابگەیەنن[3]. هەردوو برا لەساڵی ۱۸۷۹ دا دزەیان بۆ کوردستان کردو ژمارەیەکی کوردەکان لەدەوریان کۆ بوونەوە. کەگەیشتنە شاری جزیرەی پایتەختی میرنشینی بۆتان لەسەردەمی میر بەدرخانی گەورەدا، بەبێ بەرگرییەکی ئەوتۆ رزگاریان کرد، چونکە فەرماندە تورکەکان هەڵاتن، هەروەها چەکدارەکانی سەربازگەکەش. بەمە دەستیان بەسەر چەك‌و تەقەمەنییەکاندا گرت‌و سەربەخۆیی کوردستانیان راگەیاند[4]. رۆژ بەرۆژ ژمارەی ئەوانەی دەچوونە پاڵ بزووتنەوەکە لەزیادبووندا بوو و توانییان ئەم ناوچانە رزگار بکەن: جۆلەمێرگ، نسێبین، ماردین، جزیرە، زاخۆ، ئامێدی، هەکاری‌و مریات[5]. عوسمانی برا گەورە بەمیری کوردستان دانراو لەمینبەری رۆژانی جومعەوە بەناوی ئەوەوە خوتبە خوێنرایەوە[6] ناوی سوڵتان لەخوتبەی هەینی سڕایەوە، ئەمەش بەبۆچوونی تێکڕای توێژەرەوەکان مانای سەربەخۆیی دەبەخشێ.

کەحکومەتی عوسمانی درکی بەمەترسیی هەلومەرجەکە کرد هێزی گەورەی لەدیاربەکرو ئەرزەرۆم‌و سێرتەوە کۆکردەوە بۆ هێرش بردنە سەر شۆڕشگێڕان، بەڵام کوردەکان توانییان شکستێکی گەورە دەرخواردی هێزە هێرشبەرەکە بدەن[7]، پاش ئەم سەرکەوتنە گەورەیە بزووتنەوەکە لەنێو کورداندا دەنگی دایەوە. بۆیە دەوڵەت شالآرێکی گەورەی دیکەی بەسەرکردایەتی عیززەت پاشا بۆ هێرش بردنە سەر

---

[1] لازاریف: کێشەی کورد، ل ٥٤.
[2] جەلیل: راپەڕین، ل ٧٤.
[3] زکي: خلاصة، ص ٢٣٩/ سەجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل ٤٨.
[4] بلەج: القضية الكردية، ص ٥٧/ سەجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨.
[5] بلەج: سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٨/ زكي: خلاصة، ص ٢٣٩/ درة: القضية الكردية، ص ٢٩.
[6] بلەج: القضية الكردية، ص ٥٨/ زكي: خلاصة، ص ٢٣٩/ قەفتان: مێژووی گەلی کورد، ل ٣٧٦.
[7] خالفين: الصراع، ص ١١٧/ جەلیلی: راپەڕین، ل٤٩.

هێزەکانی دوو براکە ئامادە کردو هەردوو برا پاش شەڕوشۆڕێکی زۆر ناچار بوون بۆ جزیرەی پایتەختی بزووتنەوەکە بکشێنەوە لەوێش ژمارەیەکی زۆری کوردان بڵاوەیان لێ کرد[1]، بەڵام هێزەکانی کورد بەتەواوی تێك نەشکێندران، بەڵکو جارێکی دیکەش خۆیان ئامادە کرد تا دوژمن بشکێنن. بەڵام دەسەڵاتدارە عوسمانییەکان پەنایان بردە بەر فێڵ و وەکو دەستپێشخەرییەکی نیازپاکی هەموو ئەو کەسوکارەی بەدرخانیان ئازاد کرد کە لەئیستانبول گیرا بون[2]. سوڵتان عەبدولحەمید نوێنەری تایبەتی خۆی بۆ لای هەردوو برا ناردو بەناوی ئیسلامەوە، بۆ پاراستنی خوێنی موسڵمانان داوای وتووێژی لێ کردن[3]. سوڵتان ئامادەیی خۆیشی راگەیاند بۆ جێبەجێ کردنی داخوازییەکانیان. دوو براکە

بەقسەی خۆش هەڵخەڵەتان و چوونە وتووێژەوە. وتووێژ چەند قۆناغێك بەردەوام بوو و وتووێژکارە عوسمانییەکان نەرم بوون، بۆیە بڕوای دوو براکەیان پێ بەهێزتر بوو، شوێنی وتووێژەکەش هەموو جارێك دەگۆڕدرا. جارێکیان وا رێك کەوت کەژمارەی ئەو هێزەی دوو میرەکەی دەپاراست لەژمارەی هێزە تورکەکە کەمتر بوو، لەو کاتەدا تورکەکان هەلەکەیان قۆستەوەو هەردوو میریان گرت و بەدەستبەسەری ناردیانن بۆ ئیستانبول و لەوێ خرانە زیندانەوە پاش ماوەیەك بەر دران، بەڵام بەچاودێرییەوە ناچار کران لەئیستانبول بەزۆر نیشتەجێ بن[4].

بەم شێوەیە ئەم بزووتنەوەیە کۆتایی هات و شکست خواردنی بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە، وەکو: نەبوونی ئامادەیی تەواو بۆ بزووتنەوە، چونکە بڕیاری راگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستان کتوپڕ بوو و لەماوەیەکی کورتدا درا، جگە لەبەهێزی سوپای عوسمانی بەبەراوردکردن لەگەڵ هێزی کورد لەو کاتەداو خەریك نەبوونی ئەو سوپایە بەشەڕی دەرەکییەوە. ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کەسوپای عوسمانی لەو کاتەدا دەستی ئاوەڵا بوو بۆ لەنێوبردنی بزووتنەوەی دوو براکە بەتایبەتی کەئەو بزووتنەوەیە بەدەست چەند خاڵێکی لاوازییەوە دەیناڵاند، وەکو خراپی رێکخستن و کەمی چەك لای کورد، جگە لەمەش، رووسەکان دەستی یارمەتییان بۆ بزووتنەوەکە درێژ نەکردو رەنگە هۆی

---

[1] جەلیلی، راپەڕین، ل ٧٦- ٧٧.

[2] بڕوانە: القضية الكردية، ص ٥٨/ زكي: خلاصة، ص ٢٣٩/ ژمارەی ئەندامانی کەسوکاری بەدرخان لەئیستانبول بە سێ هەزار کەس دەخەمڵێنرا بڕوانە: جليلي: نهضة الاكراد، ص ٧٠.

[3] بڕوانە: القضية الكردية، ص ٥٨/ زكي: خلاصة، ص ٢٣٩.

[4] بڕوانە: المصدر السابق، ص ٥٨- ٥٩/ زكي: خلاصة، ص ٢٣٩- ٢٤٠/ بۆ زیاتریش، بڕوانە: الجاف، حسن احمد: صفحات مشرقة من تاريخ الاسرة البدرخانية، مجلة كاروان، العدد ٣، السنة ١٩٨٢، ص ١٠٠- ١٠٢.

مە بگەڕێتەوە بۆ ئەو هەلومەرجە سەختەی رووسیا پێیدا تێ دەپەڕی بەهۆی ئەوەی ەکۆنگرەی بەرلین مەرجی قورسی بەسەردا سەپاندبوو، لەلایەکی دیکەشەوە ئامادە نەبوونی رووس بۆ یارمەتی دانی کورد. هۆی دیکەی شکستی بزووتنەوەکە بریتییە ە: لاوازی ئابووری کورد، چونکە بزووتنەوەکە بەهۆی ئەوەی کە لەو سەردەمەدا باج و سەرانەیەکی زۆر بەسەر کورد سەپێنرا بوو، هەژاروکەم دەرەتان بوو.

## دووەمین بزووتنەوەی کوڕانی بەدرخان لەساڵی ١٨٨٩دا

ئەم بزووتنەوەیە ئەمین عالی[١] و مەدحەت بەگ رێبەرایەتییان کرد کەهەردوکیان لەپایتەخت بوون و توانییان بەشێوەیەکی نهێنی بۆ شاری ترابزۆن[٢] بڕۆن و لەوێ لەماڵی یەکێك لەپیاو ماقوڵاندا گیرسانەوە کەمستەفا نووری ئەفەندییە کەپەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی بەدرخاندا هەبوو. لەرێگای ئەوەوە پەیوەندییان بەهەندێ سەرخێڵەوە کرد و لەسەر ئەوە رێك کەوتن کەهێزێك بێتە ئەو شوێنەی پێی دەگوترێ (جوێزلك) لەنزیك ترابزۆن بۆ ئەوەی لەوێوە بچنە شوێنی دیکە بۆ کۆکردنەوەی جەنگاوەر و دەست کردن بەبزووتنەوە. پاش گەیشتنیان بۆ ئەو شوێنەی لەسەری رێك کەوتبوون حکومەتی عوسمانی ئاگای هەبوو لەوەی رووی دەدا[٣] و هۆی ئەمە بەچەند شێوەیەك دەگێردرێتەوە، هێندێکیان دەڵێن: جاسووسەکان جموجۆڵی مستەفا نوری ئەفەندییان خستبووە ژێر چاودێرییەوە و[٤] گومانیان لەجموجۆڵی هەبوو، سەرچاوەیەکی دیکە دەڵێ: مستەفا نوری حکومەتی لەجموجۆڵی دوو براکە ئاگادار کردبۆوە[٥] بۆیە هەردوو میر لەپڕ لەباشووری بایبۆرد کەوتنە نێوان دوو هێزی دەوڵەتی عوسمانییەوە و پێکدادان لەنێوان هەردوولادا روویدا[٦]، بەڵام هێزە کوردەکە لەگەڵ هەردوو میر کشایەوە بۆ چیای ئەرغەن و مەعدەن. کاتێك هەردوو میر درکیان بەوە

---

[١] ئەمین عالی لەساڵی ١٨٥١دا لەدایك بوو و دەرچووی کۆلێجی مالتەلسی بوو. ئەندامی شاهەی کورد حاجی قادری کۆیی بوو. پاش شکستی لەبەرپاکردنی بزووتنەوەیەکی چەکدار، دەوڵەتی عوسمانی پایەی دادنەلسی لەئیستانبوڵ و قۆنیە پێ بەخشی. کوڕی رەش: الامیر جلادت بدرخان، حیاته وفکره، دمشق، ١٩٩٢، ص ٢٣، ٢٤- ٢٦.

[٢] بلەج: القضیة الکردیة، ص٥٩/ زکي: خلاصة، ص٢٤٠.

[٣] بلەج: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠.

[٤] زکي: خلاصة، ص٢٤٠

[٥] بلەج: القضیة الکردیة، ص٦٠/ لازاریف: الاکراد في ترکیا، ص٦٢-٦٣.

[٦] زکي: خلاصة، ص٢٤٠.

کرد کە ئەو هێزەی دوایان کەوتوەو چەند هێزێکی دیکە وازیان لێ نەهێنن، خۆیاز بەدەست عوسمانییەکانەوە دا[1]، ئەوانیش بەدەست بەسەری ناردیانن بۆ ئیستانبول[2]. بەم شێوەیە تەنها لەماوەی یەك دەیەدا دو بزوتنەوەی چەکدارانەی کورد شکستیان خوارد.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەئەم دوو بزوتنەوەیە دوو بزوتنەوەی ناوچەیی بوون و گوزارشتیان لەبەشێکی خواستەکانی کورد کرد، بەلاّم هیچیاز نەیتوانی سەرنجی دەوڵەتانی گەورە یان دراوسێ رابکێشێ. سەرنجی ئەوەش دەدرێ کەئەوانەی بزوتنەوەکانیان بەرپاکرد بەپەلەپروزێ توانییان هەندێ سەرخێڵ و ژمارەیەکی زۆری جوتیارە زەحمەتکێشەکان لەدەوری خۆیان کۆ بکەنەوە، نیازیشیان پاك‌و راستگۆیانە بوو، بەلاّم ئایدیۆلۆژیایەکی روونیان نەبوو کەئامانجەکانیانی پێ دیاری بکەن‌و تاکتیکێکی قۆناغ بەقۆناغی ئەوتۆ دابڕێژن کەستراتیجەکەی خۆیانی پێ جێبەجێ بکەن، هەروەها ئامانجێکی سیاسی وایان نەبوو کەلەکاتی وەدەست هێنانی سەرکەوتندا جێبەجێ بکەن. سەرنجیش دەدرێ کەهەر لەگەڵ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی توانی لەڕووی سەربازییەوە ئەم راپەڕینانە لەناو ببات، ژیان لەناوچە راپەڕیوەکاندا جۆرە سەر دۆخی ئاسایی‌و جوتیاران بۆ سەر زەوییەکانیان‌و رێبەرانی عەشیرەتەکانیش بۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕانەوە.

---

[1] بلەج: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠/ زكي، خلاصة، ص٢٤٠.

[2] سەجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل٤١.

## سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرانبەر بەخێڵە کوردەکان و تایفە ئایینییەکان

مەبەستی دەوڵەتی عوسمانی لەکۆنترۆڵ کردنی کوردستاندا ئەوە بوو عەشیرەتەکان ئەو باجانە بدەن کە بەسەریاندا سەپێنراوە و ئامادە بن لەشەڕەکاندا بەشدار بن. عوسمانییەکان لەدژی کوردان سیاسەتی ((جیا بکەرەوە زاڵ دەبیت))یان بەکار دەهێنا[1] و بەو پێیەش نەیاندەویست خۆشەویستی و یەکێتی لەنێوان عەشیرەتە کوردەکاندا هەبێ، چونکە ئەمە دەبووە مایەی هەڕەشە بۆ سەر دەوڵەت، بۆیە زۆر جار ناکۆکییان لەناویاندا دروست دەکرد. سیاسەتی عوسمانی سیاسەتێکی چەند لایەنە بوو، نەیدەویست عەشیرەتە کوردەکان یەکگرتوو بن نەبا بەرهەڵستی دەوڵەت بکەن، بۆیە چەند شێوازێکی وەك بەرتیل و بەشەڕهێنانی سەرخێڵەکانی پەیڕەو دەکرد لەپێناوی بەردەوامی دەسەڵاتی ناوەندی لەکوردستاندا. نموونەی ئەوەش زۆرە، هەندێکی پەیوەندی بەعەشیرەتی میلانەوە هەیە، کەتیرەیەکی خێڵی میللییەو لەناوچەی رۆژهەڵاتی گۆلی وان نیشتەجێ بوو. ئەم عەشیرەتە لەشەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا دووچاری هێندێ کێشە بوو لەگەڵ چەند عەشیرەتێکی وەکو شوکاك و باموری، کە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا هاوپەیمان بوون، لەچوارچێوەی نەخشەیەکی پیلانگێڕانە بۆ دەرپەڕاندنی بۆ ناو خاکی کوردستانی ئێران.

عەشیرەتی هەمەوەندیش نموونەیەکی ترە. ئەم عەشیرەتە یەکێ لەعەشیرەتە هەرە ئازاکانی کورد بوو، ئازایەتی ئەم عەشیرەتە تەنها پیاوەکانی نەگرتبۆوە، بەڵکو ژنەکانیشی گرتبۆوە کە لەچەندەها نەبەردو شەڕدا دلاوەری و ئازایەتی و مێرخاسییان نواند[2]. ئەم عەشیرەتە لەپێنج تیرە پێکدێ کەبریتین لە: بەگزادە، رەشۆند، رەمۆند، سەفرۆندو سێتابەسەر[3].

دەوروبەری ساڵی ١٧٠٠ ئەم عەشیرەتە روی کردە ناوچەی بازیان و تێیدا نیشتەجێ بوو[4]. سەبارەت بە پەیوەندیی ئەم عەشیرەتە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا، دیارە ئەم پەیوەندییە لەسەر یەك ئاواز نەڕۆیوە و بەردەوام لەهەڵبەزو دابەزدا بوە بەڵام بەشێوەیەکی گشتی

---

[1] ابوبکر، احمد عثمان: اکراد الملي، ص١٦.

[2] زکي، تاریخ السلیمانیة، ص ١٨٨/ زکي، خلاصة، ص ٢٨٢/ للموصلي، للقلم منذر، عرب واکراد، ص ٤٣٦.

[3] زکي، تاریخ السلیمانیة، ص ١٨٧. عەباس عەززاوی بەرەبابێکی تریش دەخاتە پاڵ کەمەوردە هەمەوەندە. بڕوانە: عشائر العراق، ج ٢، بغداد، ١٩٤٧، ص ٧٨.

[4] زکي، تاریخ السلیمانیة، ص ١٨٩-١٩٠/ نوار، تاریخ العراق الحدیث، ص ٦٨، لەم روەوە سۆن وتویەتی کە ئەم عەشیرەتە ناوچەکەی لەقەرەداغ دایە.

E. B. Soane, Confidentia Report on the Sulaimania District of Kurdistan, Calcutta, India, ١٩١٨, p. ٧٧.

پەیوەندییەکی باش نەبوو. ساڵی ١٨٧٢ والیی بەغدا رەووف پاشا هەندێ لەو عەشیرەتەو وەك سەرباز بەکار هێناو یەك سەریەی لێ پێك هێنان[1]. هەروەها بەشێك لەو عەشیرەتە لەساڵی ١٨٧٧-١٨٧٨دا بەشداریی لەجەنگی روسیا-عوسمانیدا کردو رۆڵێکی کاریگەریی تێدا گێڕا. لەساڵی ١٨٧٨ەوە بەرە بەرە پەیوەندیی نێوان ئەم عەشیرەتەو عوسمانییەکان روی لەخراپی کرد ئەویش بەهۆی پشتیوانی دەوڵەتی عوسمانی لەعەشیرەتی زەنگەنە لەململانێیدا لەگەڵ عەشیرەتی هەمەوەند کە لەئاکامدا سوپای عوسمانی بەقازاجی عەشیرەتی زەنگەنە رۆڵی گێڕا. بەڵام هەمەوەندەکان هێرشی عوسمانییەکانیان شکاندو فەرماندەی هێزەکەشیان دەستگیر کرد کەناوی ئەدهەم پاشا بوو و دواتر ئازادیان کرد[2]. ئەم عەشیرەتە هێرشی دەکردە سەر زۆر ناوچەو لەهەندێ هێرشدا گەیشتبوە دەوروبەری شاری سامەڕا[3]. لەم سەروبەندەدا قایمقامی سامەڕا پێی راگەیەنرا کەهەندێ لەکەسانی سەر بەعەشیرەتی هەمەوەند گەیشتونەتە ئاقاری شاری سامەڕاو دەستدرێژییان کردۆتە سەر خەڵکی، ئەویش هێزێکی بۆ راوەدونانیان پێك هێناو دواتریش چوار کەسی لێ گرتن[4]. دواتر عەشیرەتەکە گەیشتە ناو سنوری ئێرانو دواتر گەیشتە ناوچەی زەهاوو لەوێوە دەستی بەهێرش کرد بۆ سەر هەردو دەوڵەت. لەئاکامدا هەردو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی بڕیاریان دا لەدژی ئەم عەشیرەتە بوەستنەوە. ئەمەش رەنگدانەوەی جێبەجێکردنی خاڵەکانی ئەو رێککەوتننامانە بوو کە هەردو دەوڵەت لەگەڵ یەکتریدا مۆریان کردبو. لەم سۆنگەیەوە هەردو دەوڵەت هێزیان ناردە سەر عەشیرەتەکە بەڵام هەمەوەندەکان توانییان وا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا رێککەون کەرێیان پێ بدا بگەڕێنەوە بۆ ناوچەی بازیان[5]. ساڵی ١٨٨٠ ململانێیەك لەنێوان هەردو عەشیرەتی هەمەوەندو جافدا رویداو دەوڵەتی عوسمانی لەدژی هەمەوەند پشتگیریی لەجاف کرد[6]. لەئاکامدا شەڕ لەنێوان عەشیرەتی هەمەوەندو عوسمانییەکاندا قەوما. لەو کاتەدا جوامێر ئاغا سەرۆکی هەمەوەند بوو. پاشان دەوڵەتی عوسمانی لەبەغداوە هێزی بەسەرکردایەتی تەقییەددین پاشا نارد، لەئەنجامدا جوامێر ئاغا بۆ دەوروبەری ناوچەی زەهاو رایکردو لەقەسر شیرین نیشتەجێ بوو و قەڵایەکی بەناوی خۆیەوە دروست کرد. پاشان زل ئەلسولتان حاکمی ئەسفەهان کردی بەحاکمی زەهاو بەڵام

---

[1] الزوراء، العدد ٣١٦، ١٩ ذي القعدة ١٢٨٩ هـ.
[2] زكي، تاريخ السليمانية، ص ١٩٢.
[3] الزوراء، العدد ٨١١، ٢٤ ربيع الاول ١٢٩٦ هـ.
[4] هەمان سەرچاوە.
[5] العزاوي، عباس، تاريخ العراق، ج ٨، ص ٨٤/ حسن، العراق في العهد الحميدي، ص ١٩٠.
[6] ي. ي. فاسيليفا، حول القبائل الرحالة في الجنوب الشرقي من كردستان، مجلة المؤتمر العلمي السنوي، معهد الاستشراق، موسكو، كانون الثاني ١٩٨٢، ص ١٢١/ حسن، العراق في العهد الحميدي، ص ١٩٠.

ڕێککەوتنی هەردو دەوڵەت بوە هۆی لەناوبردنی جوامێر ئاغا بەهۆی فرتوفێڵەوە لەساڵی ١٨٨٦[1].

یەکێ لەبەڵگەنامە عوسمانییە گرنگەکانی ساڵی ١٨٨٦ سەبارەت بەهەمەوەندەکان دەڵێ[2]:

بەڵگەنامەی ژمارە ٢٦

لە ٧ی جەمادەی ئولای ساڵی ١٣٠٤- ژمارەی ٤٨٨

قبوڵ کردنی چەتە هەمەوەندەکان کە لەئێرانەوە هاتونو نیشتەجێکردنیان:

((راکردنی یەکێك لەسەرانی چەتە هەمەوەندەکان کەناوی تاقی قادرە بەیاوەریی ٢٠٠ سوارە. ئەمەش لەبەر ڕۆشنایی ئەو تەلگرامانەی لەموسڵەوە پێمان گەیشتون. هەروەها بەگوێرەی بروسکەی ڕۆژی ٧ی جەمادەی ئولای ساڵی ١٣٠٤ی هیجری سوپای شەشی عوسمانی، چەتەکان داوای دالّدەدانیان لەدەوڵەتی باڵا کردوە)).

لەبەر ڕۆشنایی ئەم تەلگرامە، ئەم بڕیارە درا:

بڕیار

((لەبەر ڕۆشنایی بروسکەی ناوبراو، تاقی قادر کە ٢٠٠ سوارەی لەگەڵ دایە قبوڵ کراو بڕیار درا هەمەوەندەکان کە لەسنورەوە رایانکردوە دالّدە بدرێن. ڕێوشوێنی پێویست پەیڕەو کراوەو ئەو جێیانەش دیاری کران کەچەتەکانی تێدا نیشتەجێ دەکرێ. ولایەتی موسڵو وەزارەتی ناوخۆو سەرعەسکەریش لەم بارەیەوە ئاگادار کرانەوە)).

سەرچاوە: ئەرشیفی وەزارەتی ناوخۆ، چاپخانەی ئەنجومەنی وەزیران، ژمارە ٦/٧٣.

هەروەها بەپێی بروسکەی ئیسماعیل حەققی بەڕێوەبەری ڕیفۆرمەکان بۆ سەرۆك وەزیران، ٤٤ خێزان لەهەمەوەند لەموسڵ نیشتەجێ کران، ٣٣ لەماردینو ٤٦ لەهەکاری بەڵام هەمەوەندەکان پاش ئەوەی لەو شوێنانە گیرسانەوە گیروگرفتیان لەگەڵ دانیشتواندا بۆ پەیدا بوو، بۆیە خەڵکی موسڵ لەهەمان ساڵی ١٨٨٦دا سکاڵانامەیەکیان بۆ سەدری ئەعزەم بەرز کردەوە.

بەپێی بەڵگەنامەیەکی تریش کەژمارەکەی ٣١ ـە لەساڵی ١٨٨٦دا بۆ سەدری ئەعزەم بەرز کراوەتەوە، هاتوە کە[3]:

((نیشتەجێکردنی هەمەوەند لەموسڵ زیانی لەدانیشتوان داوە... سزادانی چەتەکان شتێکی پێویستە. بەشێکی چەتەکان لەولایەتی ئێمەدان کەسنوری تا ماردین درێژ دەبێتەوەو بەشێکی تریشیان لەناو سەنتەری ولایەتدا نیشتەجێکراون. تێکەڵ بونی

---

[1] زکي، مشاهیر، ص ١٦٧-١٦٨.

[2] Musul-Kerkuk: Ileigili, Arsiv Belgeleri (١٥٢٥-١٩١٩) Ankara, ١٩٩٣.

[3] Musul-Kerkuk. O. p. cit.

رۆڵەکانی ئەوان بەرۆڵەکانی ئێمە مایەی زیانە بۆ ئێمە. ئەوانەش کە ٨ رۆژ لێمانەوە دورن زیانیان بۆ گوندەکان هەبوەو لەم روەوە گێوگرفتی بەربلاو پەیدا بوە. لەم سۆنگەیەوە هەژارەکان دەربەدەرتر بونو خەڵکی چاویان لەدەستی ئێوەیە بۆ دورخستنەوەی ئەمانە چ بۆ تەرابولس چ بۆ شوێنێکی تر. ئێمەش چاوەری فەرمانی جەنابی سوڵتانین)).

۱۹ی شەوالی ۱۳۰٤ی کۆچی

۱۳۰۲/٦/۲۷ی رۆمی کەبەرامبەر بە ساڵی ۱۸۸٦ی زاینییە

ئیمزا: نوێنەرانی موسڵو ئیمامو موختارەکان

هەروەها وەك لەم بەڵگەنامەیەی خوارەوە دەردەکەوێ، هەمەوەندەکان لەبەر نارەزایی خەڵکی موسڵ لەشوێنی تر نیشتەجێ کران:

((لەبەر رۆشنایی بروسکەکەی یاوەری ئەکرەمو لێپرسراوی ئیسلاحات ئیسماعیل حەقی کەتیایدا رونی کردۆتەوە کەهەمەوەندەکان بەشێوەی ٤٦ خێزان لەموسڵو ۳۳ خێزان لەماردینو ٤٦ خێزان لەحەکاری نیشتەجێ دەکرێن، فەرمانی سوڵتان بەوە دەرچو کەئەمانە جارێکی تر لەویلایەتی ئەنادۆل نیشتەجێ بکرێن ئەویش لەبەر کێشەیان لەگەڵ خەڵکی‌داو بۆ دورخستنەوەیان لەسنور[1]. لەم روەشەوە بەمەبەستی دابین کردنی پەروەردە بۆ رۆڵەکانیان، خوێندنگەیان بۆ تەرخان دەکرێو بۆ نیشتەجێکردنیان بەرێکوپێکی، بەجۆرە دابەش کران: ۱۰۰ خێزانیان لەسیواس، ۲۳ خێزان لەقۆنیە، ٥۰ خێزان لەئەدەنەو ٥۰ خێزان لەویلایەتی ئەنقەرە. لەبەر ئەوە فەرمانگەکان لەم مەسەلەیە ئاگادار دەکرێنو هەنگاوی پێویست دەنێن.

۱۳ی زلقوعدەی ۱۳۰٤ی کۆچی ۱۸۸٦ ی زاینی

ئیمزا: سەدری ئەعزەم مەحمەد کامل، شەیخولئیسلام ئەسعەد ئەحمەد ئەفەندی، سەرۆکی شورای دەوڵەت عارف پاشا، سەرعەسکەر عەلی سائیب، وەزیری دەریاوانی حەسەن حەسەن، وەزیری ناوخۆ مونیر مەحمەد، وەزیری دەرەوە مەحمەد سەعید، وەزیری داد ئەحمەد جەودەت، وەزیری دارایی مەحمەد زوهدی، وەزیری بازرگانی مستەفا پاشا، وەزیری مەعاریف مونیر، وەزیری ئەوقاف هومایۆنی.

[1] بعيو، مصطفى عبدالله، المشروع الصهيوني لتوطين اليهود في ليبيا، طرابلس، ١٩٧٥، ص ٢٥ (لمعمولا: بعيو، المشروع الصهيوني).

جگە لەمە، بەڵگەنامەیەکیتر نیشانی دەدا کە سەدری ئەعزەم محەمەد کامل پاشا ڕەزامەندیی لەبابی عالی وەرگرتبو بۆ دابەشکردنی هەمەوەندەکان بەسەر ناوچەکاندا، ئەمەش بەڵگەنامەکەیە:

بابی عالی

بەرێز جەنابی عالی، بەپێی تەلگرافی جەنابی ئیسماعیل حەقی پاشاو بەگوێرەی مەزبەتەی ئەنجومەنی تایبەت، سەبارەت بەو هەمەوەندانەی کەبڕیارە سەد خێزانیان لەسیواس نیشتەجێ بکرێو ۲۳ خێزانیان لەقۆنیەو ۵۰ خێزانیان لەئەدەنەو ۵۰ خێزانیان لەویلایەتی ئەنقەرە، هەنگاوی پێویست لەم بارەیەوە نراوە. لە ۱۳ی زیلقوعدەی ساڵی ۱۳۰٤ی کۆچی.

سەدری ئەعزەم

محەمەد کامل

ئنجا پاشان بابەتی نیشتەجێکردنی هەمەوەندەکان بەدەرچونی فەرمانێك لەسەرکاتبەوە کۆتایی دێ، ئەویش بەمجۆرە:

وا لەخوارەوە فەرمانی سەدری ئەعزەمتان بۆ دەنێرین کەتێیدا ڕەزامەندی نیشان دراوە لەسەر یاداشتەکەی ئەنجومەنی نوێنەرەکانو ڕەزامەند بون لەسەر ئەو پێشنیارانەی کە لە ۱٤ی زیلقوعدەی ساڵی ۱۳۰٤ی کۆچی خراونەتە بەرچاو.

سەرکاتب شەهریاری　　　　ئەرشیفی سەرۆکایەتی وەزیران

عەمید　　　　ژمارە ۳۸۸۸

دەوڵەتی عوسمانی تەنها بەوە دانەکەوت کە ئەو هەمەوەندانە بۆ شارە ناوبراوەکان دور بخاتەوە بەڵکو لەساڵی ۱۸۹۰دا کەوتە دورخستنەوەیان بۆ لیبیا[1]. لەو کاتەدا ئەحمەد ڕاسم حوکمی لیبیای دەکرد ئەویش ویستی چارەسەرێك بۆ گیروگرفتی هەمەوەندە سورگومکراوەکان بدۆزێتەوە، بۆیەکا ویستی هەندێکیان لەسرت بۆ کێڵانی زەوی نیشتەجێ بکاو هەندێکی تریان لەشاری تەرابلسو چیای سەوزو بەنغازی[2] بەڵام ئەوانەی لەسرت نیشتەجێ کران ڕازی نەبون زەوی بکێڵن. لێرەدا ئەحمەد ڕاسم ویستی زۆرگورێکەکانیان بنێرێتە سوپا بەڵام دیسان ئەم فەرمانەیان ڕەت کردەوەو پێیان خۆش بوو بگەڕێنەوە بۆ

[1] بعیو، المشروع الصهیوني، ص ١٦.

[2] علي، حامد محمود عیسی، المشکلة الکردیة في الشرق الاوسط، ص ٢٤. وەرگیاوە لە:
Antony J. Cachsu-Libla Under the Second Ottoman Occupation, ١٨٣٥/١٩٩١, p. ١٩٣, Trips.

وڵاتی خۆیان[1]. هەندێ لەسەرکردەکانیان هەوڵیاندا بەسەرکردایەتیی حەسەن بەگ بگەڕێنەوە بۆ کوردستان بەڵام هێزەکانی لیبیا شوێنی پێیان هەڵگرتن و پاش ئەوەی پێکدادان لەنێوانیاندا رویدا حەسەن بەگ شەهید بوو، باقیەکەش گیران[2]. پاش ئەم هەوڵەی راکردن، ئەحمەد راسم پێشنیاری بۆ کاربەدەستانی ئیستانبول کرد رێگا بدەن هەمەوەندەکانی سەرت بگەڕێنەوە بۆ ناوخۆی تورکیاو حکومەتیش رازی بوو و لەناکاودا ئەمانە گەڕانەوە بۆ شوێنی جارانیان[3].

بەمجۆرە پرۆژەی نیشتەجێکردنیان لەسەرت شکستی هێنا. ئەوانەش کە لەتەرابلس نیشتەجێکران، لەساڵی ١٨٩٦دا پاش ئەوەی نەخشەیەکی پوخت و رێکوپێکیان دانا، بەخاوو خێزانەوە توانییان بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، ئەویش بەوەی کەجلوبەرگی عەرەبەکانیان لەبەر کردو دواتریش بەیارمەتی خێڵی شوان گەیشتنە ناوچەی بازیان[4]. بەڵام ئێمە هیچ زانیارییەکمان لەو بارەیەوە نیە کە ئایا ئەوانە بەهۆی دەریاوە گەڕاونەتەوە یاخود بەڕێی وشکانی و هیچ شتێکیش دەربارەی ئەو ناخۆشییانە نازانین کە لەم گەڕانەوەیەدا هاتۆتە بەر رێیان چونکە سەرچاوە مێژووییەکان زانیاریی وردمان ناخەنە بەردەست. ئەوانەش کە بۆ ئەدەنە دور خرابونەوە، توانییان لەساڵی ١٩٠١دا راکەن، خێزانەکانیشیان لەوێ بەجێ هێشت. حکومەت کەپێی زانی، هێزێکی بەدوایاندا نارد بەڵام ئەو هێزە بەدەستبەتاڵی گەڕایەوە. راکردووەکان لەدەوروبەری موسڵ کۆبونەوەو چەند تەتەرێکیان بۆ لای لێپرسراوانی موسڵ ناردو داوایان لێکردن خێزانەکانیان بۆ بگێڕنەوە دەنا دەست بەراوو روت و رێگری دەکەن. حکومەتیش لەترسان خێزانەکانیان بۆ گێڕانەوە[5].

[1] علي، حامد محمود، المصدر السابق، ص ٢٤. وەرگیراوە لە: بەڵگەی ژمارە ٢٧١٩ لەخانە دیکۆمێنتە ئەدەبییەکان لەتەرابلس، بەڵگەنامەیەکی تایبەت بەناوڵەوەگێرییەکانی خێڵی هەمەوەند. حاج عەبدولسەلام لەدەهەم (دۆسێی دورخراوە کوردەکان) لەتورکییەوە کردویەتی بەعەرەبی.

[2] علي، حامد محمود، المصدر السابق، ص ٢٤.

[3] زكي، تاريخ السليمانية، ص ١٩٥/ ادمونز، كرد وترك وعرب، ص ٤٣-٤٤/ العشائر الكردية، ترجمة فؤاد حمه خورشيد، بغداد، ١٩٧٩، هامش ٣١، ص ٦٧-٦٨.

[4] زكي، تاريخ السليمانية، ص ١٩٥/ العشائر الكردية، ترجمة فؤاد حمه خورشيد، ص ٦٩.

[5] Musul-Kerkuk. O. p. cit. P. ٢٧٤.

ئەمەش بەڵگەنامەیەکی عوسمانی گرنگە کەتێیدا رەزامەندی نیشان دراوە لەسەر هانا بردنی هەمەوەندەکانی بۆ ویلایەتی موسڵ و ئەم بەڵگەنامەیە لەکۆشکی یلدز هەمایۆنی دەرچووە[1]:

کۆشکی یلدز هەمایۆنی

فەرمانگەی لێپرسراوی نوسەرەکان

٥٩٤٧

بەرێز جەنابی خەلیفە رەزامەندیی نیشان داوە لەسەر قبوڵکردنی داڵدەدانی هەمەوەندەکان لەویلایەتی موسڵ کەهانایان بۆ دڵنەوایی و بەزەیی سوڵتان بردوەو سوڵتان رازییە هەمان کۆمەکی رۆژانەیان بدرێتێ کە کاتی خۆی لەویلایەتی ئەدەنە پێیان دەدرا. ئەمرو فەرمانیش لەم رووەوە بۆ خاوەن ئەمرە.

١٣ی شەعبانی ١٣١٩ی کۆچی

بەرامبەر بە ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٠١ی زایینی

نوسەری تایبەتی سوڵتان

تەحسین

یەکێ لەچیرۆکەکانی ئاوارەبونی ئەو هەمەوەندانە ئەوەیە کە یەکێکیان ٢٠٠ لیرە مەجیدیی لەبەریدی ئەسکەندەرۆنە رفاندو لەسەر ئەم دزییە حوکم دراو زیندانی کرا بەڵام دواتر خەندەقی لەدیوار لەزیندان رایکردو پاشان پەیوەندیی بە برایم پاشاوە کرد[2].

## خێڵەکانی دەرسیم

ناوچەی دەرسیم ناوچەیەکی شاخاویی سەخت بوو و هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەئەستەم دەگەیشتنێ و بەزەحمەت دەیانتوانی راستەوخۆ ملی پێ کەچ بکەن[3]. زۆربەی دانیشتوانەکەشی لەسەر مەزهەبی عەلی ئیلاهی (ئەهلی حەق) بون[4] کە مەزهەبێکە پەیوەندیی بەشیعەگەرییەوە هەیە. لای ئەم گروپە پەیوەندیی مەزهەبی وەك پەیوەندیی خێڵەکی، پتەوو سەقامگیر بوو. لەو روانگەیشەوە کە ئەم خەڵکە بەهۆی مەیلی شیعەگەرییەوە کەیفیان بەمەزهەبی رەسمی سوننی دەوڵەتی عوسمانی نەدەهات، رقیان لەدەسەڵاتی عوسمانی دەبۆوەو گوێڕایەڵی نەدەبون. پێش ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم حسێن بەگ سەرکردەی بزوتنەوەی خێڵەکانی دەرسیم بوو لەدژی دەوڵەتی عوسمانی و کاتێك جەنگی کریما (١٨٥٣-١٨٥٦) هەڵایسا، حکومەتی عوسمانی لەشکرێکی ١٥ هەزار جەنگاوەریی

---

[1] ابوبکر، احمد عثمان، اکراد الملي، ص ٢٩.

[2] جەلیلی، راپەڕین، ل ٤٣.

[3] نیکیتین، الاکراد، ص ٢١٤/ مینورسکي، الاکراد، ص ٥٦-٥٧.

[4] جليلي واخرون، من تاريخ الحركة الكردية، ص ٢٦-٢٧.

نارده سەر کوردەکانی دەرسیم بۆ دابین کردنی سەنگەری پشتەوەی سوپای عوسمانی ئەبا خێڵەکانی دەرسیم و خێڵەکانی تری کورد رێککەون لەنێوان یەکتریدا بۆ هەڕەشەکردن لەئاسایشی دەوڵەتی عوسمانی. لەو کاتەدا عەلی بەگ کوڕی حسێن بەگ رابەرایەتی خەڵکی دەرسیمی دەکردو لەکاتێکدا سوپای تورك کەوتبوە سوتاندن و وێرانکردنی گوندەکان، علی بەگ بۆ رێکخستنی بەرگری و خۆڕاگری، بەرەو شاخەکان کشایەوە. بەڵام سوپای عوسمانی کتوپڕ ناوچەکەی بەجێ هێشت و هەندێ هێزی کەمی بۆ پاراستنی فەرمانبەرە تورکەکان لەپاش خۆی هێشتەوە. لەم سەروبەندەدا عەلی بەگ دەمو دەست هێرشی کردو فەرمانبەرە تورکەکانی دەرکردو هێزەکانی تریشی ناچار کرد دەرسیم بەجێ بێڵن. بەمەش دەرسیمییەکان ئەو جارەش عوسمانییەکانیان لەکۆڵ بۆوە[1].

پاش برانەوەی جەنگی کریما حکومەتی عوسمانی درکی بەمەترسی کوردی دەرسیم کرد بۆیە ئەمجارە ویستی رێوشوێنی تازە بۆ ملکەچ پێکردنیان بگرێتە بەر ئەویش پاش ئەوەی لای ساغ بۆوە کەبەزەبروزەنگ و هێز دەرەقەتیان نایە. لەم بوارەدا عوسمانییەکان کەوتنە چاندنی تۆوی فتنەچێتی و کڕینی ویژدانی هەندێ کەس. جگە لەمە، رێ بەخەڵکی دەرسیم درا باج بەدەوڵەت نەدەن بەرامبەر بەکردنەوەی رێوبان بەڵام دەرسیمییەکان بەرپەرچی ئەم هەوڵەیان دایەوەو لەساڵی ١٨٨٥دا جلابی بەگیان کوشت کەیەکێ لەدەرەبەگە گەورەکانی هاوکارو ئەڵقە لەگوێی عوسمانییەکان بور و هەندێ لەخزم و کەسوکارەکانیشیان لەگەڵدا کوشت. حکومەتیش بەو بیانووەی کەئەمە لەکێشە ناوخۆییەکانە تەوخنی ئەم مەسەلانە نەکەوت[2]. کاتێك جەنگی ساڵانی ١٨٧٧-١٨٧٨ لەنێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانی هەڵایسا، کوردی دەرسیم بەشدارییان تێدا نەکردو سەرباری ئەمە کەوتنە ئاشوب نانەوەو داوای مافەکانی خۆیان کرد. سەمیح پاشای فەرماندەی سوپای چواری ئەناتۆلیا رایگەیاند کە کوردی دەرسیم سەربازی ناکەن و لەم سەروبەندەدا دەرسیمییەکان دەرفەتی چونی سوپایان بۆ شەڕگە قۆستەوەو کارمەندەکانیان دەرکرد، مۆڵگاکانی سوپایان روخاندو رازی نەبون باج و پیتاك و سەرانە بدەن[3]. کاربەدەستانی عوسمانی داوایان کردبو کوردی دەرسیم ٢٥ هەزار جەنگاوەر پێشکەش بکا بەڵام دەرسیمییەکان ئەمەیان رەت کردەوەو لەم سۆنگەیەوە دەوڵەت لەشکری نارده سەریان. دەرسیمییەکان لەچیای تۆژیك خۆیان قایم کردو بەدرێژایی ١٥ رۆژ پاڵەوانێتییەکی بێ وێنەیان نواندو ئەرمەنەکانیش پشتیوانییان لێ کردن و یارمەتییان دان. هێزەکانی عوسمانی کەوتنە بڕینی سەرچاوەکانی ئاوو ئازوقەو بەخستی تۆپبارانی چیاکەیان کرد. دەرسیمییەکان چیاکەیان جێهێشت و دەستیان بەشەڕی

---

[1] خالفین، الصراع، ص ٩٠-٩١.

[2] خالفین، المصدر السابق، ص ١٠١.

[3] جەلیلی، راپەڕین، ل ٥٥-٥٩/ جليلي وآخرون، من تاريخ الحركة الكردية، ص ٢٨-٢٩.

پارتیزانی لەدژی دوژمن کرد[١]. لەم روەوە خەباتی دەرسیمییەکان روالەتێکی جەماهیری پێوە دیار بوو چونکە دەرسیمییەکان بەپیاوو ژنو منداڵو پیرەوە بەشداریان لەشەڕەکەدا کرد[٢].

یاکیماسکی کۆنسولی روس لەدیاربەکر لەساڵی ١٨٨٠، گێراویەتییەوە کە شا حسێن دەروێش، یەکێ لەرابەرانی کوردی دەرسیم، بەخۆیو دو سەد سوارەوە بەگوندەکانی دەرسیمدا دەگەڕانو خەڵکییان هان دەدا باج بەدەوڵەت نەدەنو لەدژی کاربەدەستانی عوسمانی راپەڕن[٣]. ساڵی ١٨٩١ حکومەتی عوسمانی ویستی باجی کەڵەکەبوی سەر خەڵکی دەرسیم کۆ بکاتەوە، بەڵام کەس رازی نەبو هیچ بدا. ساڵی ١٨٩٣ دەوڵەت ویستی لەشکریان بنێرێتە سەر تاکو ناچار بن باج بدەن بەڵام دواتر خۆی لەم کارە پەشیمان بۆوەو کەوتە وتووێژ لەگەڵ سەرانی دەرسیمدا. لەو وتووێژەدا سەرانی دەرسیم پەیمانیان دا کەبچنە نێو ریزی سوپای عوسمانییەوە بەڵام بەکردەوە هیچیان نەکرد[٤]. بیلیۆت یاریدەدەری کۆنسوڵی بریتانیا لەترابزون کەسەرەرای ئەوەی رقی لەکورد دەبۆوە، لەم بارەیەوە وتویەتی: کوردەکانی دەرسیم ئامانجیان سەربەخۆییو رزگاربون بوو و زۆر عەیبە پێیان بگوترێ چەتەو رێگر[٥].

ساڵی ١٩٠١ حکومەتی عوسمانی سوپای تری ناردە سەریان بۆ ناچارکردنیان بەدانی باج بەدەوڵەت بەڵام لەشکرکێشییەکە شکستی خواردو دەوروبەری دو سەد سەرباز لەسوپاکە کوژرانو باقییەکەش کشایەوە دواوە[٦]. لەمانگی تشرینی دوەمی ساڵی ١٩٠٧دا دیسان حکومەتی عوسمانی هێرشی تری کردە سەریان بەڵام ئەرمەنەکان پشتیوانییان لەکورد کردو لەشکرکێشییەکە شکستی خوارد. ساڵی ١٩٠٨ پشێویو ئاشوب سەرلەبەر ناوچەی دەرسیمی تەنییەوەو نەچارەش کاربەدەستانی عوسمانی وتووێژیان هەڵبژاردو لەم روەوە جەنراڵ کازم پاشا بۆ لایان نێردرا بەڵام وتووێژەکە هیچی لێ سەوز نەبوو و شەڕ سەرلەنوێ هاتە ئاراوە[٧]. تەنانەت پاش کودەتای ساڵی ١٩٠٨ یش هێرشەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر ناوچەی دەرسیم پەکیان نەکەوت. هەر ئەوەندە ئیتتیحادییەکان هاتنە سەر کار، یەکسەر لەشکری چوار بەسەرکردایەتی جەنراڵ عەلی پاشا هێرشی کردە سەر ناوچەی دەرسیم بەڵام هیچی بەهیچ نەکردو کاتێك زستان داهات جەنراڵ عەلی پاشا کەوتە وتووێژکردن لەگەڵ دەرسیمییەکاندا بەڵام هەر ئەوەندە وەرزی زستان کۆتایی هات، لەشکری چوار دەستی

---

[١] جەلیلی، راپەڕین، ل ٥٩.

[٢] خالفین، الصراع، ص ١١٤-١١٥.

[٣] خالفین، المصدر السابق، ص ٩٠-٩٥.

[٤] Furthter Corres Pondence respecting the affairs of Turky. No. ٤٤, ١٨٤٨, p. ٨٧.
وەرگیراوە لە: جەلیلی، راپەڕین، ل ٥٦.

[٥] الجمیلي، قاسم خلف عاصي، العراق والحركة الكمالیة ١٩١٩-١٩٢٣، رسالة دكتوراه غیر منشورة، كلیة الاداب-جامعة بغداد، ١٩٩٠، ص ٩٠-٩١.

[٦] هەمان سەرچاوە، ل ١٨٠-١٨٢.

[٧] لازاریف، کێشەی کورد، ل ٢٣١.

بەئۆپەراسیۆنە سوپاییەکانی خۆی لەدژی خەڵکی دەرسیم کردەوەو نەجارەش کورد خۆی بەدەستەوە نەداو بەرگری کردو[1] لەشکرکێشییەکەی پوچەڵ کردەوە.

## ئێزدییەکان

ئێزدییەکان گروپێکی کوردنو[2] لەسەدەی شانزەهەمدا میرنشینێکیان بەناوی میرنشینی داسنییەوە هەبو کەسلێمانی قانونی میرنشینی سۆرانیشی خستە پاڵو ئەوسا میرنشینەکە لەژێر ڕێبەرایەتی حسێن بەگدا بوو بەڵام حسێن بەگ نەیتوانی میرنشینی سۆران لەبەر دەستی خۆی بهێڵێتەوەو دواتریش سلێمانی قانونی بۆ ئیستانبولی بانگ کردو لەوێ کوشتی. هۆی کوشتنەکەشی نەزانراوە. لەسەردەمی قانونیدا فەتوایەك بۆ حەڵاڵ کردنی کوشتنی ئێزدییەکان دەرچو، لەو ڕوانگەیەوە کەبیروباوەڕیان لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا ناگونجێ[3]. پاشان لەسەردەمی سولتان مرادی چوارەمدا پەیوەندیی نێوان ئێزدییەکانو دەوڵەتی عوسمانی چاکبونەوەی بەخۆوە دیو یەکێك لەمیرانی ئێزدی بەشداری کرد لەوەرگرتنەوەی بەغدا. بەڵام دیسان زۆری نەبرد پەیوەندییەکە گرژیی تێکەوتەوەو ئەمەش دەوڵەتی هاندا لەساڵی ١٦٥١دا سزایان بداو زۆریان لێ بکوژێ[4]. ناوی میرنشینەکەش لەمیرنشینی داسنییەوە گۆڕدرا بۆ میرنشینی شێخان[5].

دەکرێ بگوترێ کەسیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بەئێزدییەکان بەگۆڕانی سوڵتانو فەرماندەو والییەکان گۆڕانی بەسەردا دەهات. لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا ئێزدییەکان لەسەر دەستی کاربەدەستانی ویلایەتی موسڵ مەینەتییەکی زۆریان چەشت بەتایبەتی لەچیای شنگار[6]. لەسییەکانی سەدەی نۆزدەهەمیش لەلایەن محەمەد ئینجە بەیرەقدارەوە توشی گەلێك چەرمەسەریو نەهامەتی بونو لەساڵی ١٨٣٧دا مەسەلەکە گەیشتە ئەو ئەندازەیەی کەحافز پاشای فەرماندەی سوپا بەناوی دینەوە لەشکرکێشییەکی فراوانی کردە سەریانو لەکوشتنو بڕیندا هیچ جیاوازیی لەنێوان ژنو پیاوو منداڵو پیر نەکرد، تەنانەت لەناو ئەشکەوتەکاندا زۆری لێ‌سوتاندنو ژنو منداڵەکانیانی برد بۆ

[1] العزاوي، عباس، تاريخ اليزيدية وأصل عقيدتهم، بغداد، ١٩٣٥، ص ٨/ جەلیلی، کوردەکان، ل ١٨٩.

[2] العزاوي، عباس، تاريخ العراق، ج ٥، ص ١١٢/ لازاریف، کێشەی کورد، ل ١١٢/ بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: کاروان، ژمارە ٤٣، ١٩٨٦.

[3] العزاوي، عباس، المصدر السابق، ص ٤٣.

[4] حسين، سعدي عثمان، كردستان والامبراطورية، ص ٨٤.

[5] گلشن خلفا، ترجمة موسى كاظم، النجف، ١٩٧١، ص ٣٢٩/ رؤوف، عماد عبدالسلام، الموصل في العهد العثماني، النجف، ١٩٧٥، ص ١٧٣/ الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد، ترجمة موسى كاظم نورس، بيروت، ١٩٦٣، ص ٦٥.

[6] الموصلي، سليمان صائغ، تاريخ الموصل، ج ١، القاهرة، ١٩٢٣، ص ٣١٧/ جەلیلی، کوردەکان، ل ١٨٩/ الاحمد، سامي سعيد، اليزيدية ومعتقداتهم، ج ١، بغداد، ١٩٧١، ص ٨٩-٩٢.

فرۆشتنیان لەشارەکاندا[1]. یەکێ لەوانەی بەچاوی خۆیان ئەو کوشت‌و کوشتارەیان دیوە، ئاوەها مەسەلەکە دەگێڕێتەوە: ((گوندەکان خاپور کران‌و سەربازەکان دەستدرێژییان کردە سەر ناموسی ژنەکان...))[2].

لەشکرکێشییەکانی دژی ئێزدییەکان بەبیانوی جۆراوجۆر درێژەیان کێشا. مەدحەت پاشا لەساڵی ١٨٦٩دا هێزێکی گەورەی ناردە سەریان کە لەماردین‌و شارەزورو موسڵەوە هێنابوونی‌و تۆپخانەشی بۆ دابین کردن، بەو بیانووەی ئێزدییەکان دو قەسابی خەڵکی شنگاریان کوشتوە دەبێ ئێزدییەکانیش خزمەتی سەربازی بکەن[3].

ساڵی ١٨٩٢ دەوڵەت مەسعود ئەفەندی مفتی دیاریەکرو کۆمەڵێك مەلای بۆ ناردن تاکو قەناعەتیان پێبکەن ببن بەموسڵمان بەڵام ئێزدییەکان نەیانهێشت وەفدەکە سەردانی ناوچەکەیان بکا[4]. دەوڵەتیش جەنراڵ عومەر وەهبی پاشای ناردە سەریان کە کابرایەك بوو بەرپشە خەڵکی شاری حەڵەب بوو[5] بۆ ئەوەی ناچاریان بکا ببن بەموسڵمان. پاش وتووێژێك کەماوەیەکی پێ چو، هیچ ئەنجامێك نەهاتە دی‌و جەنراڵ عومەر وەهبی هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەریان‌و بێ بەزەییانە کەوتە ڕێژەیان‌و زۆری لێکوشتن‌و پەرستگاکانی شێخانی وێران کرد، لەم سۆنگەیەوە ئێزدییەکان چیتر ئۆقرەیان نەگرت‌و شۆڕشیان ڕاگەیاند. ئەگەرچی لەشکرەکەی جەنراڵ عومەر لەشکرێکی بەهێز بوو و چەندەها خێڵ پشتگیریان دەکرد بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێ[6]. ئیتر عومەر پاشاش - پاش ئەوەی لەگەڵیاندا ئاشت بۆوە - سەرلەنوێ کەوتەوە هەوڵدان بۆ ئەوەی قەناعەتیان پێ بکا تەرکی دینی خۆیان بکەن‌و ببن بەموسڵمان[7]. پاشان ئیستانبوڵ لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی دەرحەق بەعومەر پاشا نارد چونکە دڵڕەقانەو بێ بەزەییانە لەگەڵ ئێزدییەکاندا هەڵسوکەوتی کردبوو و شکاتەو سکاڵایەکی زۆری لەسەر بوو. لیژنەکە جەنراڵ عومەر پاشای سەرزەنشت کردو حکومەتیش بڕیاری لەکارخستنی دەرکرد[8]. ئێزدییەکان بەوپەڕی خۆشییەوە پێشوازییان لەبڕیارەکەی لەکارخستن کردو بەناوی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە هوتافیان کێشا چونکە

---

[1] Anisworth W.F. Travels and Reserches in Asia Minor, Mesopotamia Chaldea and Armenia, Vol. ١-١١١, London, ١٩٤٢, p. ٢٩٣.

وەرگیراوە لە: جەلیلی، کوردەکان، ل ١٩٠.

[2] نوار، تاریخ العراق الحدیث، ل ١٣٢.

[3] الاحمد، سامي الاحمد، الیزیدیة، ص ٩٣.

[4] الدملوجي، صدیق، الیزیدیة، الموصل، ١٩٤٩، ص ٥٠٦.

[5] Jhons. Guest. O. p. cit. Pp. ١٢٣-١٢٤.

[6] الدملوجي، المصدر السابق، ص ٥٠٩.

[7] Jhons. Guest. O. p. cit. P. ١٨٤.

[8] الدملوجي، المصدر السابق، ص ٥٠٩.

فەرمانی لەکارخستنەکەی دەرکرد بوو[1]. بەڵام ئەم پێکەوەسازانە زۆری نەخایاند چونکە لەساڵی ١٨٩٥دا دەوڵەتی عوسمانی هێزێکی نارده سەریان کەزیانێکی زۆری پێ گەیاندن و زۆر کەسیان لەناوچەو گوندەکانی نزیك شنگار ناچار بون خۆیان بەدەستەوە بدەن[2].

پاشان حکومەتی عوسمانی لەساڵی ١٩٠٤دا هەنگاوێکی باشی بۆ چاککردنی پەیوەندیی لەگەڵ ئێزدییەکاندا ناو لەم بوارەدا پێشنیارەکەی والیی موسل نوری پاشای پەسەند کرد کەداوای کردبوو واز لەئێزدییەکان بهێنرێ و خزمەتی سەربازییان پێ نەکرێ بەڵکو تەنها بەدەلیان لێ وەربگیرێ[3]. بەڵام سەرەڕای ئەمەش پەیوەندییەکانی نێوان هەردولا هەر بەگرژی مایەوە[4]. لەبەر ئەوەش کە ئینگلیزەکان پەیوەندیی چاکیان لەگەڵ حکومەتی عوسمانیدا هەبو، ئێزدییەکان داوای یارمەتییان لێکردن بۆ ئەوەی زوڵم و زۆریان لەسەر هەڵبگیرێ. باڵیۆزی بریتانیا لەئیستانبول راپۆرتێکی دایە بابی عالی و تییدا چەرمەسەری و نەهامەتی ئێزدییەکانی لەسەر دەستی والی و فەرمانداکان رون کردەوە. بۆیە بابی عالیش فەرمانێکی دەرکردو داوای رێزگرتنی ئێزدییەکانی کرد، لێ نەگەڕا منداڵەکانیان وەك کۆیلە بفرۆشرێن، رێی پێدان پەرستنی خۆیان بەئازادی بکەن و یەکسان بن لەگەڵ تایفە ئاینییەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی. بەمەش حکومەتی بریتانیا رێزو نەوازشێکی تایبەتی بۆ خۆی لەلای ئێزدییەکان پەیدا کرد[5].

## بارودۆخی گشتی کوردستان پێش هەڵایسانی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا

پاش روخانی میرنشینەکان، کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی ناوەندیی ئیستانبول. بەمەش خەون و ئاواتی سوڵتانە عوسمانییەکان هاتە دی کە لەمێژ بوو خەویان پێوە دەبینی، ئەمەش زۆر گران لەسەریان کەوت و باجەکەی، زیانی گیانی و ماددی زۆر بوو.

هێشتا سێ ساڵ بەسەر روخانی دوایین میرنشینی کورد تێنەپەڕی بوو کاتێك دەوڵەتی عوسمانی دوچاری گرفتێکی گەورە بوو کەبریتی بوو لەهەڵایسانی جەنگی کریما لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و روسیای تزاری. کوردەکان ئەم هەلەیان قۆستەوەو بەرابەرایەتی یەزدان شێر راپەڕینێکی فراوانیان ساز کرد بەڵام ئەم راپەڕینە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.

بیست ساڵی تر جەنگێکی تر لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و روسیای تزاری لەساڵانی ١٨٧٧-١٨٧٨دا قەوما کەدەوڵەتە گەورەکان خۆیان تێ هەڵقورتاندو وەك باسمان کرد کۆنفرەنسی بەرلینیان بەسەر روسیادا سەپاند. ئەم جەنگە بەرەی قەفقاس-کوردستانیشی گرتەوەو کورد بەهۆیەوە زیانێکی زۆریان لێ کەوت چونکە جەنگەکە بەخراپی کاری کردە

---

[1] نفس المصدر، ص ٥١٠.

[2] الحسني، عبدالرزاق، اليزيديون في حاضرهم وماضيهم، ط ٢، صيدا، ١٩٥٣، ص ١٠٠.

[3] الدملوجي، نفس المصدر، ص ٥١٢.

[4] نوار، تاريخ العراق الحديث، ص ١٣١-١٣٢.

[5] جليلي جليل وآخرين، تاريخ الحركة الكردية، ص ٣٥.

سەر بارودۆخی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی بەتایبەتی لەویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی ئەناتۆلیا کەزۆرینەی دانیشتوانیان کوردو ئەرمەن بوو. دەوڵەتی عوسمانی لەشستەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە کەوتە سەپاندنی باجێکی زۆر بەسەر هاووڵاتییاندا بۆ پڕکردنەوەی قاسە بەتاڵەکەی دەوڵەت. ئەمەش بوە مایەی بێزارکردنی جوتیارەکان کە نەیاندەتوانی ئەو باجە زۆرو قورسە بدەن کە لەئاکامدا حکومەتی عوسمانی ناچار بوو سوپا بۆ پاراستنی کارمەندەکانی کۆکردنەوەی باج بخاتە گەڕو[1] بەزۆر لەجوتیارانی بستێنێ.

لەئەنجامی ئەمەدا بەشێکی زۆری کوردەکان ناوچەو گوندەکانیان بەجێهێشت بەتایبەتی لەساڵانی حەفتای سەدەی نۆزدەهەم، ئەمەش بوە مایەی نیگەرانی کاربەدەستان، لەبەر ئەوە سەمیع پاشای فەرماندەی سوپای ناوچەی ئەرزەرۆم داوای لەقایمقامی باسینا کرد بەگوندەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا بگەڕێ‌و داوا لەدانیشتوان بکا یاداشت بۆ سوڵتان بنوسن‌و تێیدا دان بەدەسەڵاتەکەیدا بنێن، بەڵام ناوبراو ئەم کارەی پێ نەکرا. پاشان کۆچ لەناوچەکانی ئەرزەرۆم‌و قارس‌و بایەزیدو موش پەرەی سەندو کۆچکەرەکان رویان کردە سنوری روسیا[2]. برسێتیش لەناوچە کوردنشینەکان ئاوەها پەرەی سەند کەساڵانی ۱۸۷۹-۱۸۸۰ بەساڵانی برسێتی ناویان دەرکرد. لەئاکامدا زۆر مردن‌و زۆر کەس ناچار بون منداڵەکانی خۆیان بفرۆشن‌و شاری دیلمان بوو بەناوەندێکی گرنگی ئەم بازرگانییە. کوردەکان بەهەرزان منداڵەکانیان دەفرۆشت‌و[3] سەرباری ئەمەش حکومەتی عوسمانی بەزۆر کەوتە قەرزکردن لەهاووڵاتییان‌و بەرامبەر بەمە پسوڵەی دەدانێ کەچی پاش ئەوەی جەنگ برایەوە قەرزەکانی نەدایەوە. لەئاکامی ئەمەدا گەندەڵی‌و بەرتیلخۆری بڵاوبۆوەو لەو نێوانەشدا سەربازەکان‌و باجگرەکان لەسەر ورگی جوتیارانی هەژارو نەدار دەژیان بەتایبەتی کە لەشکری چواری کوردستان سێ ساڵ بوو موچەی وەرنەگرتبوو ولەئاکامدا سەربازەکان ریزەکانی سوپایان بەجێهێشت‌و گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان، بەمەش توانای شەڕکردنی سوپا دای لەکزی. حکومەت بەزەبری زۆرداری، پارەو ئازوقەی لەجوتیارانی کورد سەند، جگە لەوەی کەسەربازەکان درێغییان لەدزی‌و جەردەیی‌و راورِوت نەدەکرد، سەرباری هەمو ئەمەش نەخۆشیی گرانەتا کوردستانی تەنییەوە.

لەم سەروبەندەدا خێڵەکانی کورد بەهۆی باری نالەباری ئابوری‌و گرانبونی نرخی دانەوێڵەوە زۆر جار لەگەڵ یەکتریدا بەشەڕ دەهاتن[4]. لەم نێوانەشدا حکومەتی عوسمانی پێشەکی کەوتە باج سەندن لەجوتیارە کوردەکان.

---

[1] جەلیلی، راپەرین، ل ۳۹-٤۲.

[2] رۆژنامەی (مشاک)ی ئەرمەنی، ژمارە ۱۱۲، ۱۸۸۰. وەرگیراوە لە: جەلیلی، راپەرین، ل ۷۲.

[3] بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: خالفین، الصراع، ص ۱۱۱-۱۱۷.

[4] هەمان سەرچاوە، ل ۸۹.

لەماوەی نێوان ١٨٥١-١٨٨٠ دا بۆشایی هەبو لەسەرکردایەتیی سیاسیی کورددا چونکە روخانی میرنشینە کوردەکان بوە هۆی نەمانی ئەو سەرکردایەتیە سیاسییەی کەسەرکردایەتی کوردی دەکرد. پێش ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم سەرکردایەتی کورد بەدەست میرەکان بوو کەدەسەڵاتێکی فراوانیان هەبوو و ئەو دەسەڵاتە لەلایەن سوڵتانە عوسمانییەکانەوە درابوو پێیان. پاش ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم کەس نەیتوانی جێی ئەو میرانە بگرێتەوە لەسەرکردایەتیدا بۆ تێکۆشان لەپێناوی بەدەست هێنانی مافە رەواکاندا ئەگەرچی لەو ماوەیەدا دەرەبەگو سەرخێڵەکانیش هەبون بەڵام ئەوانە لێوەشاوە نەبون بۆ ئەنجامدانی ئەم رۆڵە گرنگە لەبەر ئەوەی بەبەراورد لەگەڵ میرەکاندا کەم دەسەڵاتیان بەسەر خێڵەکاندا دەشکا. جگە لەوەی کەململانێیان لەگەڵ یەکتریدا هەبوو و هەندێکیشیان بەلای دەسەڵاتی فەرمانڕەوادا دایشکاند بوو و زۆربەی جار رەعیەتەکەیان بۆ بەزەیی باجگرەکانو جەندرمە تورکەکان بەجێ هێشتبوو. لەئاکامدا گەلی کورد دادو بێدادی بوو لەدەرەبەگو سەرخێڵەکان کەبوو بوونە هۆی زوڵمو زۆرو ستەمو بڵاوبونەوەی برسێتیو پەتاو سەپاندنی باجێکی زۆر. بەهۆی ئەو ستەمەی کەدەرەبەگەکان بەپشتیوانیی کاربەدەستانی عوسمانی بەسەر جوتیاراندا سەپاندبویان، نفوزو دەسەڵاتی تەریقەتە ئاینییەکان پەرەی سەند وەك تەریقەتی نەقشبەندیو قادری. ئەم تەریقەتانە کەسانێکی شارەزا لەبواری ئاین رێبەرایەتییان دەکردن کە لەکاتی سەرهەڵدانی کێشەو ململانێدا رۆڵی میانکاریان دەبینیو لەو ستەمەیان کەم دەکردەوە کە بەرۆکی جوتیارانی دەگرت، بۆیە سەنگیان لەنێو کورددا پەرەی سەند، سەرباری ئەوەی کەهەندێکیان بەخواپەرستیو دەستپاکی ناویان دەرکرد[1].

---

[1] علي، جواد ملي، الشيخ خالد النقشبندي ومنهجه في التصوف، رسالة دكتوراه غير منشورة، كلية العلوم الاسلامية- جامعة بغداد، ١٩٩٧، ص ١١-١٤/ للوصلي، عرب واكراد، ص ٢٧٠-٢٧٥.

ئەوانە لەفتواناياندا بوو باشتر گوزارشت لەو زوڵم و زۆرە بکەن کەکورد دوچاری هاتبوە. ئەگەرچی دەوڵەتی عوسمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا دو جەنگی لەدژی روسیای تزاری کردبو بەڵام لەهیچیاندا کورد بەپێی دەوڵەتەوە نەچو ئەوەش لەبەر ئەوەی دەوڵەت کوردی دەچەوساندەوەو لەکاتی ئاشتیدا بەناشیرینترین شێوە ستەمی لێ دەکرد. دەوڵەت لەکاتی تەنگانەدا بەچەند فەتوایەك خەڵکی دەوروژاندو داوای لێ دەکردن یەك دەست کار بکەن بۆ پاراستنی ئاینی ئیسلام کەکافرەکان هەڕەشەی لێ دەکەن. بەڵام ئەم بانگەوازو فەتوایانەی عوسمانییەکان تەنها وەسیلەیەك بوو بۆ ئەوەی خەڵکی بچن بۆ جەنگێك کەکاری بەسەریانەوە نەبوو و خودی ئەو خەڵکەش دەبون بەسوتەمەنییەکەی. ئنجا هەر ئەوەندە جەنگەکە دەبڕایەوە، دەوڵەت دەچۆوە سەر پیادەکردنی خراپترین رێوشوێنی ستەم و چەوسانەوە دەرهەق بەکوردو هەست و پێداویستییەکانیان پشت گوێ دەخست.

لەو کاتەدا هەست و نەستی کورد روی لەکابرایەك کرد کەبەناوبانگ بوو بەدەستپاکی و خواپەرستی و لێزانی، ئەویش شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییە کە لەو قۆناغەدا وەك رابەرێکی نەتەوەیی دەرکەوت، جگە لەوەی کەرابەرێکی ئاینی شیاوی رێزو حورمەتیش بوو[1]. ناوبراو لەلایەن ژمارەیەکی زۆری کوردەوە پشتیوانیی لێ کراو دەشێ بزوتنەوەکەی بەسەرەتای بزوتنەوەی نەتەوایەتی مۆدێرنی کورد بژمێرین[2].

لەچارەکی دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا هۆشیاریی نەتەوەیی کورد تا دەهات زیاتر گەڵاڵە دەبوو و ئەمە وەنەبێ تەنها لەلای کورددا وابێ بەڵکو لەلای عەرەبەکان[3] و ئەرمەنەکان و ئاشورییەکان و نەتەوەکانی تریش وابو. بەڵام ئێمە سەرنجی ئەوە دەدەین کەدەوڵەتە گەورەکان یارمەتی هەندێ لەو نەتەوانەیان داوە بەتایبەتی ئەرمەن کەچی زۆر دژی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بون و بەوەش دانەکەوتن بەڵکو توانا و ئامرازی وایان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەستەبەر کرد کەبەهۆیەوە توانی بزوتنەوەی کورد سەرکوت بکات. لەو قۆناغەدا بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لەجاران خەملیوتر بوو[4].

---

[1] خالفین، الصراع، ص ١١٨

Edgar D.ball ance O.P. Cit. P.٢٤.

[2] David Medo Wall O.P. Cit. P.٢٩.

٣ جورج انطونیوس، یقظة العرب، ترجمة د. ناصرالدین و د. احسان عباس، ط٦، ١٩٨٠، ص ١٤٩-١٥١.

٤ خصباك، الكرد والمسألة الكردیة، ص ٢٩.

## شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری

شێخ عوبەیدوڵڵا کوڕی سەید تەهای کوڕی شێخ ئەحمەد شیهابەددینە[1]، لەگوندی نەهری لەناوچەی شەمزینان دادەنیشت[2]. ساڵی ١٨٣٠ لەگوندی نەهری لەدایك بوو و باوکی، سەید تەها، توانی شێخنشینییەك لەنەهری دابمەزرێنێو پاش مردنی، کوڕەکەی، شێخ عوبەیدوڵڵا، جێی گرتەوە کەکاراکتەرێکی بەهێزی هەبوو و بوە رابەری دینی تەریقەتی نەقشبەندی[3].

لەکوردستاندا دو تەریقەتی دینی بەناوبانگ هەبون کەتەریقەتی قادریو تەریقەتی نەقشبەندی بوون. پاش مردنی مەولانا خالد هەندێ لەبنەماڵە دینییەکان، لەوانە بنەماڵەی شێخ عوبەیدوڵڵا، سەرکردایەتیی تەریقەتی نەقشبەندییان کرد[4]. وەك گوتمان، شێخ رێزێکی ئاینی دیاری هەبوو ولەهەمان کاتدا زەویدارێکی گەورە بوو، نزیکەی دو سەد گوندی هەبو[5] لەئێرانو دەوڵەتی عوسمانیدا. لەلای سەرۆك عەشرەتانی کورد قسەی گوێی لێ دەگیرا. شێخ کەوتە یەکخستنی خێڵەکانو بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئامانجە نیشتمانیو سیاسییەکانی، پشت ئەستور بوو بەدەسەڵاتی ئاینیو رێزو حورمەتی خۆی[6]. لەم سەروبەندەدا سیمای سەرکردایەتییەکی داناى پێوە دیار بوو وەك دادپەروەریو بەخشندەییو ئازایەتیو جوامێریو فریاکەوتنی لێقەوماوانو دیوەخانەکەی لەبەر میوانان وەجاخی نەدەکوژایەوە[7].

لەبەر ئەوە کوردەکان ناویان نابو((باوکی کورد))[8]و شۆڕشەکەشی لەگرنگترین شۆڕشەکانی کوردە لەسەدەی نۆزدەهەمدا، ئەویش لەبەر فراوانی پانتایی شۆڕشەکەو ئامانجە نەتەوەییە روونەکانی[9]. یەکێ لەلێکۆڵەرەوەکان[10] شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا بەشۆڕشی ئیسماعیلی سەفەوی دەچوێنێ چونکە لەهەردوکیاندا دەسەڵات هەڵقوڵاوی

---

[1] شای قاجار محمد شا(١٨٣٦-١٨٤٨) ئەلوچەی مەرگەوەری دایە سەید تەها. بڕوانە: خالفین، الصراع، ص ٨٧.

[2] زکي، مشاهير، ج٢، ص ٥٢.

[3] خالفين، الصراع، ص١١٨/ قاسملو، عبدالرحمن، اربعون عام من الكفاح من اجل الحرية، ترجمة د. عزالدين مصطفى رسول، اربيل، ص٢٣.

[4] علي، جواد فكي، الشيخ خالد النقشبندي، ص ٤١٤/ئەمین، ساڵح محەمەد، کوردو عەجەم، ل١٥٨.

[5] جەلیلی، راپەرین، ل٧٩-٨٠/ ئەمین، ساڵح محەمەد، کوردو عەجەم، ل١٥٧.

[6] پێ رەش، بارزان، ص٣١.

[7] احمد، كمال مظهر، دراسات في تاريخ ايران الحديث و المعاصر، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٣٦.

[8] جەلیلی، راپەرین، ل١٠٧.

[9] نيكيتين، الاكراد، ص١٨١/ الطالباني، كردستان، ص١٩٣.

[10] زكي، خلاصة، ص ٢٩.

مەيلى ئاينى بوو و بانگهێشتكارانى هەردو شۆڕش ئەو مريدانە بون كەبۆ پڕوپاگەندەكردنو وەدەست هێنانى راى گشتى دەگەڕانو ئامانجى هەردو رابەر دامەزراندنى حكومەتێك بوو كە لەڕوى ئيدارىو ئابورىو سياسييەوە سەربەخۆ بێ، جگە لەوەى كەهەردو رابەر ئازاو دلێرو مێرخاس بون.

ئامانجى شێخ عوبەيدوللا زۆر رونو ئاشكرا بوو ئەويش دامەزراندنى دەوڵەتێكى يەكگرتو بوو[1] كەڕێوبانى بازرگانىو مافەكانى مەسيحييەكانو كەمينەكان دابين دەكا[2]. شێخ هەوڵيدا مەسەلەى كورد لەقاوغى ناوچەكە بباتە دەرێو[3] ديدێكى نەتەوەيى هەبو چونكە بەيەك چاو سەيرى گەلى كوردى كرد لەدەوڵەتى عوسمانىو ئێرانو لەساڵى ١٨٨٠دا دو كۆنفرەنسى بۆ سەرانى خێڵەكانى كورد گرێداو كۆمەڵەى كوردى دروست كرد[4].

رەنگە ئەمە سەرەتاى پێكهوەنانى رێكخستنو كۆمەڵەى سياسى بێ لەنێو كورددا، پاشان لەشكرێكى دامەزراندو رێكى خستو بەهەر بەشێك ئەركێكى تايبەتى سپاردو لاپەڕەيەكى پاكى پەيوەنديى نێوان موسڵمانانى كوردو تايفە ئاينييەكانى تر كردەوە[5]. شۆڕشەكەى شێخ گوزارشتى لەحەزو ئاواتى گەلى كورد دەكرد كەدەيويست بارو ژيانى چاك بێو كورد لەئێرانو دەوڵەتى عوسمانيدا يەك بگرێتەوە، چونكە كورد يەك ئامانجى هەيە كەسەربەخۆيىو رزگاربونە لەدەسەڵاتى بيانى. هۆكارە سياسييە نێودەوڵەتييەكانيش بۆ ئەم شۆڕشە هۆكارى يارمەتيدەر بون[6] چونكە شۆڕشەكە لەلايەن خديێوى ميسرو شەريفى مەككەوە پشتيوانى لێ كرا[7]. شێخ كەوتە نامە نوسين بۆ ژمارەيەك لێپرسراوى دەوڵەتانى ناوچەكەو نوێنەرانى هەندێ لەدەوڵەتە ئەوروپاييەكانو[8] ئەو زوڵمو زۆرەى بۆ رون كردنەوە كەكورد لەسەر دەستى هەردو دەوڵەتى عوسمانىو ئێران چەشتويەتىو داواى لەو لێپرسراوانە كرد ئەم مەسەلەيە بۆ

---

[1] بلمج، القضية، ص٩٥.

[2] فوزي، احمد، قاسم والاكراد خناجر وجبال، ١٩٦١، ص٧٥.

M.M. VAN, bruine ssen Agha. Shaikn and state, p. ٢٢٤.

[3] كتيبى شينى ساڵى ١٨٨١ى ژمارە ٥ى توركيا، ل١٦. وەرگيراوە لە: خالفين، الصراع، ص ١٢٦.

[4] بۆ زياتر، بڕوانە: جەليلى، راپەڕين، ل ١٠٤-١٠٦.

[5] خالفين، الصراع، ص١٠٣/ جەليلى، راپەڕين، ل ١٤٨-١٥٢/ الطالباني، كردستان، ص ١٩٧.

[6] خالفين، الصراع، ص ١٢٦.

[7] خالفين، الصراع، ص ١١٨/لازي، الاكراد في تركيا، ص ٨٥.

[8] ابوبكر، احمد عثمان، نصوص ثلاث رسائل للشيخ عبيدالله النهري، مجلة شمس كردستان، العدد٦٩، نيسان ١٩٨٥/ الوائلي، اكراد العراق، ص٢٧٢-٢٧٣/ نەمين، سالح محمد، كوردو عەجەم، ل١٥٦.

بەرپرسەکانیان باس بکەن و ئەوە بەگەلانیان بناسێنن کەگەلێك هەیە بەناوی گەلی کوردەوە هەوڵ دەدا ئامانجەکانی خۆی بەدی بێنێ. لەم سەروبەندەدا شێخ چەند هەنگاوێکی نا بۆ یەکپارچەکردنی کوردو یەکخستنی هەڵوێستیان و لەم بوارەدا کۆمەڵەی کوردی پێك هێنا.

## روداوەکانی شۆڕش

شێخ عوبەیدوڵلا هەر لەسەرەتاوە هەوڵیدا کورد یەکخاو دژی هەردو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران هانیان بدات چونکە ئەم دو دەوڵەتە کوردستانیان داگیر کردبوو و گەلەکەیان دەچەوساندەوە. شێخ پێی وابو پێویستە لەسەری هەڵوێستی رابەران و سەرخێڵە کوردەکان یەکخا ئنجا دەست بەئۆپەراسیۆنی سوپایی بکا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کاریگەر بەشداری لەشۆڕشدا بکەن و دەرفەت بەهیچ کەلێنێك نەدەن کە لەوانەیە پاشان روو بدا. لەهەمان کاتدا شێخ داوای لەدەوڵەتی عوسمانی کرد بارودۆخی کورد چاك بکاتەوە ئەگینا خۆی و پشتیوانەکانی دەچنە ناو خاکی ئێران. پاش ئەوەی کاربەدەستانی عوسمانی هەستیان بەجدییەتی هەڵوێستی شێخ کرد، مفتی وانیان بۆ لای نارد تا وتووێژی لەگەڵدا بکاو واز لەچونە ناو ئێران بێنێ. رەنگە هۆکەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەدەوڵەتی عوسمانی دەترسا حکومەتی ئێران بکەوێتە هاندانی شێخ و یارمەتیدانی بۆ نانەوەی ئاژاوەو گێرەشێوێنی لەدژی دەوڵەتی عوسمانی.

شێخ خواستەکانی گەلی کوردی دایە مفتی وان کەبریتی بون لەبواردنی کورد لەباجدان بەهۆی باری خراپی گوزەرانیانەوەو راپێچ نەکردنیان بۆ شەڕەکان. مفتیش بەڵێنی جێبەجێ کردنی ئەم داوایانەی دا. پاشان حکومەتی عوسمانی سەمیح پاشای فەرماندەی هێزەکانی رۆژهەڵاتی ئەناتۆلیاشی بۆ وتووێژکردن ناردە لای بەلام وتووێژەکانی هیچیان لێ وەدەست نەهات بەڵکو لەکۆتایی ساڵی ١٨٧٩و سەرەتای ساڵی ١٨٨٠دا بارودۆخەکە گرژییەکی زۆرتری تێکەوت، کاتێك حکومەتی عوسمانی هێزی سوپای بەیاوەری باجگرەکان بۆ کۆکردنەوەی باج لەلایەنگرانی شێخ نارد. ئیدی‌کاتێك کوردەکان رازی نەبون باج بدەن، پێکدادانی چەکدار لەنێوان هەردولادا رویداو لەئەنجامدا چل کەس لەهێزەکەی تورك کوژران[١].

---

[١] خالفین، الصراع، ص١١٩/ جەلیلی، راپەرین، ل٨٢.

پاش ئەم ڕووداوە، شێخ وتووێژێکی زۆری لەگەڵ پیاوانی ئاین و سەرخێڵەکاندا کرد بۆ سازکردنی کۆبوونەوەیەك هەموو لایەنەکانی تێدا کۆ ببێتەوە بەمەبەستی باسکردنی کاروبارەکان. هەندێ لەسەرخێڵەکان ئامادەی کۆبوونەوەیەکی بەراییی بوون لەمانگی تەمووزی ١٨٨٠دا لەگوندی نەهری[1]، پاشان بڕیاریان لەسەر پێکهوەنانی کۆمەڵەی خێڵە کوردەکان دا. ئامادەکاری بۆ کۆبوونەوە چاوەڕوانکراوەکە دەوروبەری مانگێکی خایاند لەسەرەتای مانگی ئابی ساڵی ١٨٨٠دا زیاد لەدوو سەد سەرخێڵ و پیاوی ئاین و دەرەبەگ بەشدارییان لەکۆبوونەوەکەدا کرد. ئەمە یەکەم جار بوو کۆبوونەوەیەك ساز بکرێ ئەو ژمارە زۆرەی سەرانی خێڵی تێدا ئامادە ببێ، ئەمەش لەمێژووی سیاسیی کورددا ڕووداوێکی گرنگ بوو چونکە لەمەوبەر هیچ میرێك و هیچ سەرخێڵێك پێی نەکرابوو ئەو ژمارە زۆرەی ڕابەرانی کورد بۆ باسکردنی چارەنووسی نەتەوەی کورد کۆ بکاتەوە. ئەوانەی لەکۆبوونەوەکەدا ئامادە بوون تەنها سەرانی کوردی کوردستانی عوسمانی نەبوون بەڵکو چەندەها ڕابەری کوردی ئێرانیشی تێدابوو[2]. ئامادەبوونی نوێنەرانی کوردستانی باشووریش مانایەکی زۆر گرنگی هەبوو چونکە ئەمە یەکەم جار بوو ئەوانە بەشداری لەکۆبوونەوەیەکی ئاوەهادا بکەن. کاتێك بەدرخان لەساڵانی چلی سەدەی نۆزدەهەمدا هاوپەیمانێتییەکی پیرۆزی بۆ خێڵەکان پێکهێنا، لەبەر ئەو هۆیانەی کە لەمەوبەر چوونە سەریان، تەنها ژمارەیەکی کەمی کوردی کوردستانی باشوور ئامادەی هاوپەیمانێتییەکە بوون. بەڵام ئێستا، بەشداریی نوێنەرانی کورد لەسەرانسەری کوردستاندا مەغزای خۆی هەیە لەوانە: سەرکردایەتیی مێژوویی شێخ و کاریزمای شێخ لەنێو کورددا، ڕازیبوونی کورد بەسەرکردایەتیی شێخ، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەکورد یەك ئامانجی هەیەو پارچە پارچە ناکرێ.

دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ کەکاتێك حکومەتی عوسمانی درکی بەوە کرد کەشێخ خەریکی سازکردنی کۆبوونەوەکەیە، بەهەموو جۆرێك ویستی پەشیمانی بکاتەوە، بۆیە سوڵتان یاوەرەکەی خۆی، عەقید بەحری کوڕی بەدرخان، بۆ لای نارد بۆ وتووێژ. ناوبراویش بەدیارییەکی زۆرەوە چوە لای شێخ بەڵام شێخ پەشیمان نەبۆوەو سوور بوو

[1] حسن، جاسم محمد، العراق في العهد الحميدي، ص ١٤٨/الطالباني، كردستان، ص ١٩٤.

[2] جليلي، جليل واخرون، الحركة الكردية، ص ٣٤/حسن، جاسم محمد، العراق في العهد الحميدي، ص١٤٨. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: خيالي، لقمان، ثورة الشيخ عبيدالله النهري، جريدة الاتحاد، العدد ١٨٢، ايار ١٩٩٦.

لەسەر بۆچوونی خۆی سەبارەت بەیەکخستنی کوردو دەرکردنی داگیرکەر، لەم سۆنگەیەوە تەقەللا دیپلۆماسییەکەی بەدری بەگ شکستی خوارد[1].

ئینگلیزەکان پێیان ناخۆش بوو ئەم کۆمەڵەیە دروست بوەو لەم رووەوە هەندێ لەئەندامانی پەرلەمانی بریتانیا ئەم مەسەلەیەیان وروژاندو حکومەتی بریتانیایان سەغڵەت کرد، ئەمەش هانیدا زیاتر دژایەتی کورد بکا. ئەمە وەك هاندرسن ساغی کردۆتەوە، بەڕوونی لەدانیشتنەکانی پەرلەمانی بریتانیادا دەردەکەوێ[2].

لەسەرەتادا پرنسیپی شۆڕش بریتی بوو لەوتوێژ نەکردن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بەڵام هەندێ لەسەرخێڵەکانی کورد کەبەرتیلیان لەحکومەتی عوسمانی وەردەگرت، چەند دروشمێکیان لەناو کۆنفرەنسەکەدا بەرز کردەوە بۆ دژایەتی کردنی ئەرمەن لەباتی دژایەتی کردنی دەوڵەتی عوسمانی. ئەمەش شتێك بوو کەشێخ عوبەیدوڵڵاو پشتیوانەکانی هەستیان بەمەترسییەکانی دەکرد چونکە ئەوان دەیانزانی کێ دوژمنی راستەقینەیەو کێ کوردستانی زەوت کردوە، جگە لەوەی کەئەم بانگەوازە بۆ دورخستنەوەی شۆڕش بووە لەئامانجی راستەقینەی خۆیو بۆ هاندانی دەوڵەتانی ئەورووپا بوە لەدژی شۆڕش چونکە روبەڕوبونەوەی کوردو ئەرمەن دەبو بەهۆی توڕەبونی دەوڵەتانی ئەورووپا کە لەکۆنفرەنسی بەرلیندا خاڵی ٦١یان سەپاند بوو کەداوای ئەنجامدانی ریفۆرمی لەناوچە ئەرمەن نشینەکاندا دەکرد، سەرباری ئەوەی کەئەم روبەڕوبونەوەیە دەبوو بەملململانێیەکی ئاینی کەهەم رۆژئاوا رەتی دەکردەوەو هەم شێخ عوبەیدوڵڵاو لەئاکامدا دەبو بەهۆی خۆتێهەڵقورتاندنی دەوڵەتانی ئەورووپاو ئاڵۆزکردنی مەسەلەکە.

پاشان شێخ عوبەیدوڵڵا لەبەردەم ئامادەبووەکاندا وتارێکی خوێندەوە کەرۆڵێکی گرنگی لەیەکخستنی ریزەکانیاندا هەبو. شێخ لەوتارەکەیدا وتی:

((٥٥٠ ساڵ لەمەوبەر ئیمپراتۆری عوسمانی دامەزرا. عوسمانیەکان بەناڕەوایی هاتنە سەرکار، دوای ٤٠٠-٥٠٠ ساڵ دەوڵەتی عوسمانی لەرێی ئیسلامەتی لایداو رێگای خوانەناسی گرتە بەر، لەوساوە لاوازو بێدەسەلاتەو تا دێت لەروخانو هەرەس هێنان نزیك دەبێتەوە. ئەم هەرەس هێنانە بەئەندازەیەك خێرا دێتە پێش کەئیتر کەس گومانی لەوەدا نیە کەئیمپەراتۆریەت بەم زوانە تیا دەچێ. رۆڵە ئازیزەکانم با گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی باوباپیرانمان شل کەینو چیتر سەر بۆ ستەمو چەوسانەوەی تورکە

[1] خالفین، الصراع، ص١٢٧/ جلیلی، راپەرین، ل٨٨-٨٩.

[2] جەلیلی، راپەرین، ل٩٥-٩٦.

خوانەناسەکان شۆڕ نەکەین، نەك هەر ئێمەی کوردی تورکیای عوسمانی بەڵکو کوردی ئێرانیش دەبێ لەم دوو دەوڵەتە کەتەگەرە لەپێشکەوتنمان دەدەن، رزگار بێ. باپیرانمان داواکارن هەمومان لەپێناوی ئاین و رزگاری نیشتماندا تێ بکۆشین، بلیمەت و زانایان وتویانە: کەڵك وەرگرتن لەباروۆخی لەبار ژیری و زیرەکییە. ئەمڕۆ فارسەکان بەشەڕی تورکمانەکانەوە خەریکن و هەمو هێزەکانیان بۆ شەڕ ناردوە، کەواتە ئەمڕۆ هەلومەرجی هەڵگیرساندنی جوڵانەوەیەك دژی دەوڵەتی ئێران زۆر لەباروگونجاوە. دەبێ ئەوەش بزانین کەئەگەر فارسەکان بەشەڕیشەوە خەریك نەبونایە ئێمە هەر لێیان نەدەترساین چونکە فارسەکان ئەوپەڕی پێیان بکرێ لەسەد هەزار شەڕکەر زیاتریان پێ کۆ ناکرێتەوە، جارێ زیاتر لەنیوەی ئەو شەڕکەرانە برا کوردەکانی خۆمانن کە لەژێر چەپۆکی دەوڵەتی ئێراندان و بەنۆرەی خۆیان هەمان هەستی ئێمەیان هەیە.

لێرەدا لەبەر ئەوەی بەشێکی بەپیت و دەوڵەمەندی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی ئێراندایە، ئێمە لەسەرەتادا دژی دوژمنی بێ هێز جوڵانەوەکە بەرپا دەکەین و لەئەنجامدا دەتوانین براکانمان و وڵاتە هەرە بەپیت و دەوڵەمەندەکەیان رزگار بکەین. ئەوەش کارێکی وا دەکا سەرچاوەیەکی گرنگمان چنگ بکەوێ. دەتوانین بەم سەرچاوەیە لەشەڕدا دژی دوژمنی دوەم و بەهێز، واتە تورکە عوسمانییەکان، پشت ئەستور بین.

بەڵام ئەگەر هەر بەکێوەکانی خۆمان پشت ئەستور بوین، ئەوا ناتوانین مەسەلەی ئازوخە دابین کەین. ئایا هەڵوێستی ئێوە لەم بارەیەوە چیە؟ ئایا ئێوە ئامادەن رێبازی بەرەو پێشەوە چون بگرنە بەر؟ ئەگەر لەم بارەیەوە هیچ شتێکتان هەیە، تکایە بفەرمون))[1].

لەبەر ئەوە شێخ عوبەیدوڵلا وای پێ باش بوو رو بکرێتە رزگارکردنی کوردی دەوڵەتی لاوازی ئێران چونکە ئەو دەوڵەتە لەو کاتەدا شەڕی خێڵە تورکمانەکانی دەکردو هەندێ لەهێزەکانی ناردبوە سەرسنوری ئەفغانستان- ئێران بەهۆی ململانێی ئەفغانستان لەگەڵ بریتانیادا[2]، جگەلەوەی کەهەلایسانی شۆڕش لەکوردستانی ئێراندا بنەمایەکی ئابوری دابین دەکا کەدەبێتە هۆی کەم کردنەوەی ئەو برسێتییەی کەکوردی کوردستانی عوسمانی بەدەمییەوە دەتلێنەوە، بەتایبەتی کەشێخ چەندەها گوندی لەکوردستانی ئێران بەمیرات لەباوکییەوە بۆ مابۆوە دانیشتوانەکەی خۆیان

---

[1] شەمزینی، جوڵانەوەی رزگاری، ل٨٤-٨٥/ الوائلي، اكراد العراق، ص ٢٨٧/ ئەمین، سالح محەمەد، کوردو عەجەم، ل ١٥٨-١٥٩.

[2] جەلیلی، راپەرین، ل١١٦-١١٧/ جەلیلی واخرون، من تاريخ الحركة الكردية، ص ٣٥/ شەمزینی، جوڵانەوەی رزگاری، ل٨٥.

بەپشتیوانی شێخی نەهری دادەنا نەك بەلایەنگری حکومەتی قاجار[1]. شێخ عوبەیدوڵڵا لەو بڕوایەدا بوو کەزۆر کەس لەسەربازانی سوپای ئێران کوردن، ئەوانەش دەشێ لەو سوپایە هەڵگەڕێنەوەو بچنە ریزی شۆڕشەوە بۆ بەدیهێنانی ئاواتە نەتەوەیییەکانیان[2].

هاندەر لەم بارەیەوە بونی ناکۆکی بوو لەنێوان ئێران‌و دەوڵەتی عوسمانی لەسەر ناوچەی قوتورو رەنگە جیاوازیی مەزهەبیش رۆڵی هەبو بێ لەراکێشانی کورد کەسوننەن بەلای خۆدا، لەکاتێکدا کەزۆربەی ئێرانییەکان شیعەن، سەرباری ئەوەی کەحکومەتی ئێران بەردەوام کوردی دەچەوساندەوەو بەزۆر باجی لێ دەسەندن. موڵکەکانی شێخ عوبەیدوڵڵاش لەناوچەی تەرگەوەڕ باجیان لێ دەسەنرا.

وەك نمونەیەك کەگوزارشت لەو چەوسانەوەیە دەکا کەحکومەتی ئێران لەدژی کورد بەکاری دەهێنا، جارێك ئێرانییەکان لەکاتی باج کۆکردنەوەدا ٤٥ پیاوو ژنیان کوشت[3]. رۆژ بەرۆژیش ئەو چەوسانەوەیە پەرەی دەسەند. لەم بارەیەوە شێخ عوبەیدوڵڵا ئیقبالوددەولەی فەرمانڕەوای ورمێی لەنامەیەکدا ئاگادار کردەوە کە((گومان لەوەدا نیە کەتۆ دەزانیت ٥٠٠ هەزار خێزانی کورد لەکوردستاندا دەژین‌و پێمان وا نیە کەئەم وڵاتە بەر تووك‌و نفرین کەوتبێ تا گەلی کورد خۆی لەخراپترین بارو دۆخدا بدۆزێتەوە، سەرباری خراپیی بەڕێوە بردن.. بۆیە کورد بڕیاری یەکگرتن‌و دروستکردنی نەتەوەیەکی یەکگرتوی داوەو بڕیاری داوە خۆی ئەم سیستمە بپارێزێ چونکە کەس ناتوانێ شۆڕشی ئەجارە بشکێنێ..))[4].

بەجۆرە، پەیوەندیی نێوان هەردولا تا بڵێی گرژ بوو. کاتێك شێخ عوبەیدوڵڵا بڕیاری دا سەرەتا شۆڕش لەکوردستانی ئێران هەڵ بگیرسێ، حکومەتی ئێران بەم بڕیارە پەست بوو وکەوتە کۆکردنەوەی هێزەکانی سوارەو پیادەی ئازەرەکانی ماکۆ بۆ خۆسازدان بۆ بەرگری‌و داوای لەحکومەتی عوسمانیش کرد هێز بۆ سەر سنوری هاوبەشیان بنێرێ تاکو هاوکاریی یەکتر بکەن[5].

---

[1] جەلیلی، راپەڕین، ل١١٦-١١٧.

[2] نەمین، سالح محمد، کوردو عەجەم، ل١٦٩.

[3] میرزا، نادر، ثورة الشیخ عبیدالله النهري ضد الحکومة القاجاریة، ترجمة محمد جمیل الروزبیاني، مجلة المجمع العلمي العراقي-الهیئة الکردیة، العدد١٢، ق١، ١٩٨٥، ص٢٤١.

[4] جلیلي، الثورة الکردیة، ترجمة احمد عثمان ابوبکر، مجلة شمس کردستان، العدد١، ١٩٧١، ص١٢-١٥.

[5] زکي، خلاصة، ص ٢٢٤.

Namo Aziz, Kurdistan, O.P.Cit. P. ١٣٠.

کاتێک کاربەدەستانی عوسمانی درکیان بەوە کرد کەشێخ لەئێرانەوە دەست بەشۆڕشەکەی دەکا، دو هەڵوێستی جیاوازیان گرتە بەر، یەکەمیان: بڕیاردان بوو لەسەر پشتگیری کردنی شێخ چونکە درکیان بە ڕێزو پایەی شێخ کردبوو لەسەرانسەری کوردستانداو دەیانزانی سەنگێکی زۆری هەیە لەدەرباری سوڵتان لەپایتەختدا. بۆ نمونە، کاتێك شێخ بەڕێوە بوو بۆ مەککە بۆ حەج، وەزیرەکان لەپێشوازیەدا بون و دەستیان ماچ دەکرد. دەوڵەتی عوسمانیش بەو هیوایەوە بوو سەرانی کورد بۆ فشار خستنە سەر حکومەتی ئێران، بەکار بهێنێ[1]. دووەمیشیان: کاتێك شێخ شۆڕشەکەی لەکوردستانی ئێرانەوە دەست پێ کرد، حکومەتی عوسمانی کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ هەر تەنگاریەك و هێزێکی زۆری لەئەرزڕۆم کۆکردەوە، ١٦ بەتەری و ٢٨ تۆپی بۆ ئەرزڕۆم نارد کەبارەگای لەشکری چواری لێ بوو، پاشان هێزێکی زۆری تریشی بۆ وان نارە تاکو لەنزیك ناوچەی ڕوداوەکانەوە بن[2]. پاش دەرکردنی بڕیاری پێویست بۆ دەست پێکردنی شۆڕش لەکوردستانی ئێران، خۆبەخش لەشەمدینان و موکریان و سۆران و بادینانەوە[3] بەلێشاو چونە ڕیزی شۆڕشەوە.

شێخ هێزەکانی کرد بەسێ بەشەوە: بەشێك بەسەرکردایەتیی کوڕی خۆی، عەبدولقادرو حەمزە ئاغای سەرخێڵی مەنگوڕو مامش[4] و ئەرکەکەی ڕزگارکردنی ناوچەکانی موکری و سابلاغ و میاندوارو مەراغە بوو[5]. بەشی دووەم سەرکردایەتییەکەی بەکوڕی خۆی، محەمەد سدیق، سپاردو ئەرکەکەی ڕزگارکردنی شاری ورمێ بوو و سێیەمیان درا بەخەلیفە محەمەدو ئەرکەکەی ڕزگارکردنی شارەکانی خوی و سەلماس بوو و بەشی یەکەم و دوەم لەژێر سەرپەرشتیی خودی شێخدا بون. خالفین دەڵێ شێخ لەنەخشەیدا بوو ڕواندزو موسڵ و بەغداو ئامێدی بگرێ و لەم ڕووەوە یەکێ لەسەرخێڵەکانی بەغدا کە فەرحان پاشای شێخی خێڵەکانی شەمەر بوو، ڕایگەیاند کەئەگەر هێرش بکەنە سەر موسڵ یارمەتییان دەدا[6].

---

[1] خالفين، الصراع، ص٨٨-٨٩.

[2] جەلیلی، ڕاپەڕین، ل١٣٣.

[3] الطالباني، كردستان، ص١٩٦.

[4] خالفين، الصراع، ص١٢٨/جەلیلی، ڕاپەڕین، ل٨٩. ئەم خێڵە لەنێوان هەردو شاری مەهابادو نەغەدەدا دەژین لەم لقانە پێکدێن: قادری، مەلا سلێمانی، بایەزیدی، ئەحمەدی و عەزیزی. بڕوانە: سەید عەلی مەم تیبیا، خێڵ و تایەفەکانی عەشایەری کوردی ئێران، وەرگێڕانی شەوکەت شێخ یەزدین، ١٩٩٥، ل٧٩.

[5] خالفين، الصراع، ص ١٢٨/ جەلیلی، ڕاپەڕین، ل٨٩.

[6] خالفين، الصراع، ص١٢٨.

سەرنج دراوە کەرێکخستنی هێزەکانی شۆڕش زۆر کەموکوڕیی تێدابوو، لەوانە نەبونی شارەزایی لەبواری شەڕدا لەلای سەرکردەکانی بەرەکان وەك شێخ عوبەیدوڵڵاو دو کوڕەکەی، جگە لەوەی کەهەر خێڵێك هێزەکانی خۆی لەژێر سەرکردایەتیی رابەرەکانی خۆی هێشتەوەو چەکی پێویستیشیان نەبو، سەرباری ئەوەی کەئەو هێزانە کەم مەشق بون‌و لەدابەشکردنی ئازوقەدا ناوەندێتی نەبو بەڵکو دەبوایە هەر عەشیرەتێك خۆی ئازوقەی خۆی دابین بکات[1]. هەروەها تێبینی کراوە کەشێخ هەر لەسەرەتاوە هەڵەی گەورەی کرد کاتێك شێوازی شەڕی بەرەیی لەگەڵ دوژمندا هەڵبژارد لەبری ئەوەی شێوازی شەڕی پارتیزانی پیادە بکا بۆ سەرلێشێواندنی دوژمن‌و رێ خۆش کردن بۆ ئەنجام دانی هێرشێکی بەرەیی گشتی پاش پەرتەوازەکردنی هێزەکانی.

بڵێسەی شۆڕش کاتێك داگیرسا کەپارێزگاری ورمێ داوای لەشێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵا کرد بکەوێتە باج کۆکردنەوە بۆ حکومەتی ئێران لەگوندەکانی باوکی بەڵام شێخ عەبدولقادر باجی نەداو بەم هۆیەوە هێزەکانی ئێران لەگەڵ هەمزە ئاغای سەرخێڵی مەنگوڕدا بەشەڕ هاتن‌و بەپێی رێککەوتنی عەشیرەتەکان شێخ هەزار چەکداری بەسەرکردایەتیی عەبدولقادری کوڕی بۆ یارمەتیدانی عەشرەتی مەنگوڕ نارد[2]. ئەم رووداوە بوە هۆی لەدەستدانی دەرفەتی جێبەجێ کردنی نەخشەی سازکراوی شۆڕش‌و لەم روەوە پێشبینی نەکرابوو رووداوەکان بەو خێراییە پەرە بسەنن چونکە کوردەکان هێشتا خۆیان بۆ دەست پێکردنی ئۆپەراسیۆن ئامادە نەکردبو. هێزەکانی شۆڕش پێشڕەوییان دەکردو ئەندامانی عەشرەتەکان پەیوەندییان پێوە دەکردن‌و خەڵکی گوندەکانیش بەتەپڵ‌و شەیپورو زوڕنا پێشوازییان لێ دەکردن. ئەو هێزانە چەند پێشڕەوییان بکردایە، ژمارەیان زیادەتر دەبو[3]. هەر لەعەشرەتی مەنگوڕ پێنج هەزار جەنگاوەر چونە ریزی شۆڕشەوەو پێنج هەزار کەس لەعەشرەتی مامش‌و هەشت هەزار لەعەشرەتی زازاو دە هەزار لەگاورێك‌و شکاك‌و خێڵی تر[4].

---

[1] ئەمین، سالح محمد، کوردو عەجەم، ل١٦٨.
[2] جەلیلی، راپەڕین، ل١١٩-١٢٠.
[3] ئەمین، سالح محمد، کوردو عەجەم، ل١٧٠.
[4] جەلیل، راپەڕین، ل١٢٥.

پێش دەست پێکردنی پەلامار، شێخ خێڵەکانی مامش و پیرانی ئاشت کردەوە چونکە ململانێی خێڵەکییان لەنێواندا هەبو[1]. کاتێك شەڕ دەستی پێ کرد هێزی یەکەم بەکۆمەکی هێزی خێڵە خۆماڵییەکان سەرکەوتنی دیاری بەدەست هێنا و شارەکانی لاهیجان، شنۆ، مەهاباد، میاندواو و مەراغەی رزگار کردو گەیشتە دەوروبەری شاری تەوریز[2] بەڵام ئەم هێزە نەچوە ناو شار بەڵکو بەشتی ترەوە کە دور بوو لەبیروباوەڕی شۆڕش خۆی خەریك کرد.

لەناو شاری تەوریز هەراو شێواوی پەیدا بوو چونکە ترسی هێرش کردنە سەر شارەکە لەئارادا بوو، بۆیە هەندێ لەکۆنسولگەریە بیانییەکان کەوتنە گواستنەوەی ئەرشیفیان بۆ دەرەوەی شارو لەهەمان کاتیش بارودۆخی ناو تارانیش شڵەژا چونکە گرتنی شاری تەوریز لەلایەن کوردەوە بەو مانایە دەهات کەئیتر لەوێوە رێ بەئاسانی خۆش دەبێ بەرەو تاران[3]. رۆژی ١٧ی تشرینی دووەم رۆژنامەیەکی لەندەنی نوسی: سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی کورد ئەنجامی پشتیوانیی کوردی کوردستانی ئێرانە لەسەرکردایەتیی سیاسیی شێخ عوبەیدوڵلا چونکە شێخ فریاڕەسی کوردە. عوسمانییەکان بەخۆشییەوە هەواڵی سەرکەوتنەکانی شۆڕشگێڕانیان بیست ئەگەرچی دەوڵەتی عوسمانی لەپەرەسەندنی بزوتنەوەکە نیگەرانە[4].

حکومەتی عوسمانی لەساڵی ١٨٧٩ەوە هێزی لەشوێنە ستراتیجییەکان کۆ کردبۆوەو ئەو دەروازانەی داخستبو کەناوچە کوردنشینەکانی ئێرانیان بەناوچەی هەکارییەوە گرێ دەدا[5].

سەبارەت بەو هێزەش کەراسپێردرا بوو ورمێ رزگار بکا، ئەوە بەخێرایی جموجۆڵی کردو لەدەوروبەری شارەکە نزیك بۆوە بەڵام نەیتوانی زاڵ بێ بەسەر خۆڕاگریی هێزەکانی ئێران، بۆیە شێخ عوبەیدوڵلا خۆی سەرکردایەتیی لەشکرەکەی کردو هێزێکی تریشی لەهەکاری و هێزێکی نەستورییەکانیشی لەگەڵ خۆیدا برد[6]. کاتێك شێخ گەیشتە شارۆچکەی شنۆ، ژمارەیەکی زۆری رۆڵەی عەشرەتەکان بەچەکەوە

---

[1] لاڤی، الاکراد في ترکیا، ص٥٨.

[2] خالفین، الصراع، ص١٣٠.

G.N. Curzon, Persia and persin Question, London, ١٩٦٦,Vol. P. ٥٥٤.

[3] جەلیلی، راپەڕین، ل٢٧/خالفین، الصراع، ص١٣٠.

[4] رۆژنامەی لەندەنی((تایمس)). وەرگیراوە لە: جلیلی‌و اخرون، الحرکة اکردیة، ص٣٦/الراڤلي، اکراد العراق، ص٢٨٨.

[5] جلیلي واخرون، الحرکة الکردیة، ص٣٣.

[6] خالفین، الصراع، ص١٣٠.

پەیوەندییان پێوە کردو دەنگۆی ئەوە بڵاو بۆوە کەگوایە شێخ دوانزە هەزار تفەنگداری بەتفەنگی مارتینییەوە لەگەڵ خۆیدا هێناوە. ئەمەش ورەی خێڵەکانی بەرز کردەوە[١].

کاتێك شێخ گەیشتە نزیك شاری ورمێ، دو نامەی بۆ شارەکە نارد، یەکێکیان بۆ شێخو لئیسلام میر جەمالەددین‌و ئەوی تر بۆ گەورە ئاخوندی شیعەی شارەکە میرزا حسێن ئاغا. لەنامەی دواییدا هاتبو((هاتوم بۆ دامەزراندنی دادپەروەری لەنێوان خێڵەکانداو لابردنی زوڵم‌و زۆر لەسەر رەعیەت... بۆ دو رۆژ دەبمە میوانتان لەشاری ورمێ‌و هیچم لەئێوە ناوێ دابین‌کردنی ئازوقەی لەشکر نەبێ. هەروەها بەنیازم لەمزگەوتی گەورەی شارەکەدا لەگەڵ موسڵمانانندا نوێژ بکەم‌و کاسبکارانیش لەشوێنی کارەکانیان دەمێننەوە... منیش دەچمە شاری تەورێز... ئەگەر ئیقبالوددەولەی فەرمانڕەوای شارەکە گوێڕایەڵم بێ، موچەیەکی بەرزی دەدەمێ‌و ئەگەر گوێ ڕایەڵم نەبو، لێ مەگەرێن بچێتە ناو شار

کەس نەکوژرێ بەڵام فەرمانڕەواکە ئەم ئامۆژگارییەی ڕەت کردەوەو خەڵکی لەدژی ئامۆژگارییەکەی کۆنسوڵ هاندا[1].

پاشان پزیشك کوەران کە لەکۆمیسیۆنی مژدبەرانی ئەمریکایی کاری دەکرد، چوە کامپی شێخ و تکای لێ کرد مەرجەکانی خۆبەدەستەوەدان ڕون بکاتەوەو وریای کردەوە کەنابێ هیچ زیانێك بەفەلەکانی شارەکە بگات. شێخ وەڵامی دایەوە کەپێویستە لەسەر فەلەکان ئاڵای شین لەسەربانی ماڵەکانیان هەڵکەن بۆ ئەوەی لەکوشتن و ئەهامەتی بپارێزرێن. بەم شێوەیە شێخ فاکتەری هەڵکوتانی کتوپڕی لەدەست دار لەنێو کامپەکەیدا تۆوی دوبەرەکی دەستی بەسەردەرهێنان کرد[2].

دو ڕۆژی پێ چو هێز گەیشتە شارەکەو چەك بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش کرا، ئیتر بۆ ماوەی دە ڕۆژ شەڕ قەوما بەبێ ئەوەی شێخ بتوانێ سەرکەوتنی تێدا بەدەست بێنێ، بگرە شێواوی و لێك ترازان بەئاشکرا بەهێزەکانییەوە دیار بو[3]. ئەو هێزەی بۆ فریاکەوتنی شارەکە هاتبو، هێزێك بو جوان ڕێکخرا بو و لەسەر دەستی ئەفسەرانی ئینگلیزو فەرەنسایی و ئیتالیایی و ئەمسایی و ڕوس مەشقی پێ کرابو، سەرباری ئەوەی کەوەك سوپا ئەوروپایییەکان بەتۆپخانەی مۆدێرن ساز کرابو[4].

سوپای ئێران کەوتە ڕاوەدونانی شۆڕشگێڕانی کوردو کوشتن و سوتاندن و وێرانکردنی هەر چی دێتە بەر ڕێی و ئۆپەراسیۆنەکان دەوروبەری سێ مانگ درێژەیان کێشا بەبێ ئەوەی هێزەکانی شێخ ئامانجەکانی خۆیان بەدەست بێنن[5] و زۆری نەبرد نیشانەکانی هەرەس هێنان و شکست و ماندوبون پێیانەوە دەرکەوت، بۆیە دەوڵەتی عوسمانیش هێزەکانی خۆی لەکوردستانی عوسمانیدا قایمتر کردو دوانزە تیپی پیادەو تۆپخانەی لەمانگی تشرینی دوەمی ١٨٨٠دا ناردە وان ئەوەك ڕوداوێکی چاوەڕواننەکراو ڕو بدات. ڕەنگە هۆی ناردنی ئەم هێزانە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەدەوڵەتی عوسمانی دەترسا هێزەکانی ئێران لەسنور بپەڕنەوە. لەهەمان کاتدا شێخ حەسەن ئاغاو دلاوەر ئۆغلی دو کارمەندە گەورەکەی شاری وان و قایمقامی شتاخ لەسەر

---

[1] خالفين، الصراع، ص١٣٠-١٣١.

[2] محمود، محمود، تاريخ روابط سیاسی ایران و انگلیس در قرن نوزدهم میلادی، جلد چهارم، چاپ دوم، تهران، ١٣٢٨، ص٣.

[3] نەمین، سالح محەمەد، کوردو عەجەم، ل ١٧٢-١٧٣.

[4] G.N.Curzon, O.P.Cit.P. ٥٥٩-٥٦٠.

[5] الشابجي، علي خضر، ايران في عهد ناصرالدين شاه ١٨٤٨-١٨٩٦، رسالة ماجستير مقدمة لكلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٨٧، ص٢٥٠.

ڕاسپاردەی ئیستانبول سەردانی کوردستانی ئێرانیان کرد بۆ ئەوەی قەناعەت بەشێخ بکەن هێزەکانی کۆ بکاتەوەو بێتەوە بۆ ناو خاکی عوسمانی[1].

توێژەران باسیان نەکردوە کەئایا شێخ بەم داوایە ڕازی بوە یان نا، بەڵام لەڕەوتی ڕوداوەکان پێدەچێ شێخ لەژێر فشاری هێزەکانی ئێران کشاوەتەوە بۆ ناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی. بەمەش لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٨٠دا کوردەکان لەکوردستانی ئێران کشانەوەو گەڕانەوە بۆ ناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی.

کوردی ئێران کەوتنە نێوان دو ئاگرەوە. ئاگری یەکەم، هێزی هەندێ لەدەرەبەگە کوردە خۆماڵییەکان بوو کەپشتیوانییان لەحکومەتی ئێران کردو کەوتنە سوتاندن‌و تاڵان کردنی گوندە کوردنشینەکان. ئاگری دوەم، هێزی سوپای ئێران بوو کە بەرقەوە تۆڵەی لەکورد کردەوە بەتایبەتی لەجوتیارەکان‌و لەئاکامدا بەشێکی زۆری دانیشتوان گوندەکانیان چۆڵ کردو پەنایان بۆ چیاکان برد[2]. هێزەکانی ئێران لەناو سنوری دەوڵەتی عوسمانی شۆڕشگێڕە کوردەکانیان ڕاو تەناو ڕەنگە هۆکە ترس بوو بێ لەگرژبونی باروودۆخی نێوان ئێران‌و دەوڵەتی عوسمانی‌و لێ کەوتنەوەی جەنگ لەنێوانیاندا کەدیارە ئەو جەنگەش لەبەرژەوەندیی ئێراندا نابێ. حکومەتی ئێران داوای لەحکومەتی عوسمانی کرد سەرانی شۆڕش دەستگیر بکات لەوانە شێخ عوبەیدوڵڵاو هەر یەك لەحکومەتەکانی نەمساو بریتانیا لەم داوایەدا پشتگیریی ئێرانیان کرد[3].

هەڵوێستی حکومەتی عوسمانی بەرامبەر بەوانەی گەڕانەوە بۆ ناو خاکی، ئەوە بوو کەهیچ کردارێکی وای پیشان نەدا نیازی سزادانی شێخ‌و لایەنگرەکانی لێ هەڵکرێنرێ بەڵکو جۆرەها یارمەتیی پێشکەش بەو سەرکردانە کرد کەگەڕانەوە بۆ ناوچەی هەکاری. پاشان شێخ بەنهێنییەوە پەیوەندیی بەو کارمەندە عوسمانییانەوە کرد کەزیان لەپلە ئاینییەکەی دەگرت بۆ بەدەستهێنانی چەك‌و تەقەمەنی، هەروەها پەیوەندیی بەقایمقامی شتاخەوە کردو داوای تفەنگی لێ کرد[4]. لەهەمان کاتدا کاربەدەستانی عوسمانی قایمقامی قەزای شتاخی ویلایەتی وانیان بۆ خزمەتی نارد تا دڵی بداتەوە. پاشان شێخ لەڕەشید پاشای والی وان داوای چەك‌و تفاقی کرد بۆ ئەوەی دیسان خۆی بۆ ڕوبەڕوبونەوەی حکومەتی ئێران ئامادە بکا. حکومەتی عوسمانیش

---

[1] خالفین، الصراع، ص١٣٤.

[2] د. جلیلی، جلیل، نضال الشعب الکردي(باللغة الروسیة)، ص١٥/ خالفین، الصراع، ص ١٣٤-١٣٥.

[3] جلیلی، جلیل واخرون، تاریخ الحرکة الکردیة، ص٣٨.

[4] جەلیلی، ڕاپەڕین، ل١٤٧.

بەپێ خواستەکەی شێخەوە چوو و لەمانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٨٨١ دا سێ و نۆ سندوقی تفەنگ و ١٢ سندوق تفاق و ٨ سندوق کەرەستەی چیایی بۆ نارد، ئیتر شێخیش نوێنەری خۆی بۆ گوندەکان نارد تا چەکداری بۆ کۆ بکاتەوە[1].

تێبینی کراوە کەدەوڵەتی عوسمانی لەقۆناغی یەکەمی شۆڕشەکەدا یارمەتیی شێخی نەداوە بەڵکو لەقۆناغی دواتردا یارمەتیی داوە بەڵام وردە وردە کەوتە ژێر گوشاری روس- ئینگلیزو بەئاشکرا یارمەتیی شێخی نەدا. کاتێك روسیا بەوەی زانی کەدەوڵەتی عوسمانی بەنیازە ژێر بەژێر پشتیوانی لەشێخ بکا، داوای لێ کرد پێشنیاز بۆ شێخ بکا سەردانێکی ئیستانبول بکا بۆ ئەوەی ناچاری بکا لەوێ بمێنێتەوەو وەك کارتێك بۆ مەرامەکانی خۆی بەکاری بێنێ و لێ نەگەڕێ شۆڕش لەئێران هەڵگیرسێنێ، مەگەر بەرەزامەندیی خۆی نەبێ[2].

لەمانگی تەموزی ساڵی ١٨٨١دا شێخ چو بۆ ئیستانبول و لەوێ زۆر بەگەرم و گوڕی لەلایەن گەورە کارمەندانەوە پێشوازیی لێ کراو حکومەتی عوسمانی بەم رێوشوێنە ویستی لەلایەك سنورێك بۆ شۆڕشی کوردان دابنێ و لەلایەکی ترەوە کەڵك لەشێخ وەرگرێ وەك کارتێك بۆ کاریگەری خستنە سەر حکومەتی ئێران ئەویش لەو رێیەوە کەداوای لەئێران کرد ئەو زیانە بۆ شێخ و پشتیوانەکانی ببژێرێتەوە کەبەهۆی ئۆپەراسیۆنە سوپاییەکانی ساڵانی ١٨٨٠-١٨٨١ـەوە لێیان کەوتوە، ئەمەش لەرێی باڵیۆزی دەوڵەتی عوسمانی لەتاران فەخری بەگ لەکۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٨١دا. حکومەتی عوسمانی حکومەتی ئێرانی لەوە ئاگادار کردەوە کەئەگەر ئەم داوایانە جێبەجێ نەکات، باروودۆخەکە گرژیی تێدەکەوێ و کوردەکانی ناوچە سنوورییەکانی نێوان هەردو دەوڵەت پشێوی دەنێنەوە، بەڵام وەزیری دەرەوەی ئێران میرزا سەعید خان داواکەی رەت کردەوە بەبیانوی ئەوەی کەئەو ناوچانەی لەو ساڵانەدا زیانیان بەرکەوتوە موڵکی شێخ نەبون بەڵکو بەکرێ پێی درابون، جگە لەوەی کەگوایە شێخ بەفرۆفێڵ و تەڵەکەبازی دەستی بەسەر هەندێ زەویدا گرتبو، بۆیە دەست بەسەر موڵکەکانیدا گیاوە. پاشان باڵیۆزی روسیا لەتاران ئەو پێشنیازەی بۆ وەزیری دەرەوەی ئێران کرد کەحکومەتی ئێران داوا لەکاربەدەستانی عوسمانی بکات ئەو

---

[1] خالفین، الصراع، ص١٣٧-١٣٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٢٨.

زیانانەی بۆ ببژێرێتەوە کەبەهۆی شێخ عوبەیدوڵڵاوە لەئێران کەوتوەو یاداشتەکەشی بکێشێتەوە بەڵام حکومەتی عوسمانی داواکەی رەت کردوە[1].

دەتوانین بڵێین کەدەوڵەتی عوسمانی لەو کاتەدا پشتگیریی شێخی کردوە نەك بۆ بەرژەوەندیی کورد بەڵکو بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانی کەبریتی بوە لەوەرگرتنەوەی ناوچەی قوتور کە بەپێی کۆنفرەنسی ساڵی ١٨٧٨ی بەرلین درا بەئێران. بەم جۆرە، ململانێی دیپلۆماسی لەنێوان هەردو حکومەتدا بەهۆی مەسەلەی کوردەوە پەرەی سەندو لەگەرمەی ئەم هەلومەرجەدا شێخ توانی لەئیستانبول راکاو لەساڵی ١٨٨٢دا بەدزییەوە بگەرێتەوە بۆ کوردستان[2]. لەوێ زۆر بەگەرمەو گوڕی پێشوازیی لێ کراو عەشرەتەکانی کورد لەدەوری کۆ بونەوە. ئەم گەڕانەوەیەش تارانی خستە دڵەڕاوکێو نیگەرانییەوە[3]. پاشان شێخ لەرێی نوێنەرەکەیەوە، عەلی قاسم ئۆغلو، هەوڵیدا لەروسیا نزیك بێتەوە ئەویش لەرێی کامەساراکانەوە کەجێگری کۆنسوڵی روس بوو لەشاری وان بەڵام ئەم هەوڵەی سەری نەگرت چونکە روسەکان پەیمانی یارمەتیدانیان پێ نەدا ئەگەرچی شێخ ئامادەیی دەربڕی بوو بەپێی فەرمانەکانی حکومەتی روس کار بکات[4]. کاتێك کاربەدەستانی عوسمانی بەمەرامەکانی شێخیان زانی، کۆلۆنێل یوسف بەگیان ناردە لای بۆ وتووێژ بەڵام وتووێژەکە هیچی لێ سەوز نەبو. پاشان کاربەدەستانی عوسمانی کەمال بەگی سکرتێری سێیەمی سوڵتان عەبدولحەمیدیان بۆ لای نارد بۆ ئەوەی قەناعەت بەشێخ بکات یەکێ لەشارە عەرەبییەکان هەڵبژێرێ تاکو تێیدا بژیو دەوڵەتیش ئامادەیە موچەیەکی مانگانەی ١٥٠ لیرەی تورکی بۆ ببڕێتەوە. بەڵام شێخ خۆی لەقەڵای ئۆرمار قایم کردو پاش بەرگرییەکی سەخت ناچار بوو خۆی بەدەستەوە بدا[5].

دواتر شێخ لەگەڵ سەد خێزاندا بۆ حیجاز دور خرایەوەو لەساڵی ١٨٨٣دا لەوێ مرد[6]. ساڵی ١٨٩٣ حکومەتی عوسمانی رێی بەخێزانەکان دا بگەرێنەوە بەو مەرجەی کوڕانی شێخ عوبەیدوڵڵا لەئیستانبول نیشتەجێ بن[1].

---

[1] خالفين، الصراع، ص١٤٠-١٤١/ نعمين، سالح محمد، کوردو عەجەم، ل١٩١.

[2] جەلیلی، راپەرین، ل١٥٢.

[3] هەمان سەرچاوە، ل١٥٣.

[4] خالفين، الصراع، ص١٤٤-١٤٥.

[5] زكي، خلاصة، ص ٢٤٤/ لازي، الاكراد في تركيا، ص٦١.

[6] بلەج، القضية الكردية، ص٥٩/ حلمي، رفيق، الاكراد منذ فجر التاريخ الى سنة ١٩٢٠، ١٩٣٢، ص٥٦/ خالفين، الصراع، ص١٤٦.

## پەیوەندیی شێخ عوبەیدوڵڵا لەگەڵ تایفە ئاینییەکاندا

شێخ عوبەیدوڵڵا وەك رابەرانی تری کورد هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵ مەسیحییەکاندا بەهەمو تایفەکانیانەوە نواندەو هیچ لێکۆڵەرەوەیەك باسی ئەوەی نەکردوە کەشێخ ئازاری مەسیحییەکانی داوە یاخود فەرمانی بەلایەنگرەکانی داوە ئازاریان بدەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەمیشە ئامۆژگاریی لایەنگرەکانی دەکرد[2] هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵ مەسیحییەکاندا بکەن، رێزیان بگرن‌و ئازاریان نەدەن چونکە ئاینی ئیسلام بەڤیۆدانی خوێنی مەسیحییەکان یاخود ئازاردانیان بەرەوا نازانێ.

تەموزی سالی ۱۸۸۰ کاتێك کۆبونەوەی سەرانی خێڵە کوردەکان ئەنجام درا، هەندێ لەسەر خێڵەکان مەسەلەی لێدانی ئەرمەنیان هێنایە پێش بەڵام شێخ بەتەواوی ئەم مەسەلەیەی رەت کردەوەو بەئاشکرا پێی گوتن: لێدانی ئەرمەن وا دەکا لەئایندەدا ببنە پاروەکی سانا لەبەردەم دوژمنەکانماندا، بەخێرایی لەناومان دەبەن، هیچ بەهایەکمان نامێنێ، دەوڵەتە ئەوروپاییەکانیش دژمان دەبن‌و هەر لەئێستاوە شۆرشەکمان شکست دەخوا[3]. بەمە هەمو لایەنگرانی لێدانی ئەرمەنی دەمکوت کرد. دەوڵەتی عوسمانی بەئاشکرا حەزی دەکرد کوردەکان بکەونە گیانی ئەرمەنەکان، بۆیە شێخ گوتی: ((تورکەکان دەیانەوێ ئێمەی کورد بکەونە چەوساندنەوەی برا مەسیحییەکانمان، ئنجا سبەی کە لەم کارە دەبینەوە، ئەوان دەکەونە گیانمان. نامانەوێ کەس بچەوسێنینەوەو کەس بمانچەوسێنێتەوە))[4].

شێخ پێی وابو هاوکاری کردنی مەسیحییەکان سۆزی ئەو دەوڵەتانەی پارێزگاری لەمەسیحییەکان دەکەن، بەلای کورددا رادەکێشێ. ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دوژمنایەتی لاوەکی کەببێتە مایەی سنوردانان بۆ هەوڵ‌و تەقەللاکانی بۆ رزگارکردنی کوردو لەم روانگەیەوە کەوتە وتوێژکردن لەگەڵ مار شیمۆنی سەرۆکی تایەفەی ئاشوری[5]. بەڵام مار شیمۆن رازی نەبو مەسیحییەکان بەشداریی

---

[1] لازاریف، کێشەی کورد، ل۱۱۹.

[2] پێویستە لەم بارەیەوە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کەشێخ داوای لەلایەنگرەکانی کرد بەهیچ شێوەیەك ئەرمەنەکان نەچەوسێننەوە. بڕوانە: جەلیلی، راپەرین، ل١٤٦.

[3] رۆژنامەی کوردستان، ژمارە۲۷، ۲۲ی زیلقەعدەی سالی ۱۳۱۸ی کۆچی. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: کارلینی چەچانی، الصداقة الارمنیة الکردیة في القرنین التاسع عشر والعشرون(باللغة الروسیة)، یریڤان، ۱۹٦٥، ص۱۱.

[4] نیکتین، الاکراد، ص١٧٤.

[5] جەلیلی، راپەرین، ل۸٦.

شۆڕش بکەن بەڵام لایەنگرەکانی هاندا تازاری کورد نەدەن و هاوکارییان بکەن. ئەم هاوکارییەش بوە هۆی تورە کردنی ئینگلیزەکان کەداوایان لەئاشورییەکان کرد هاوکاری کورد نەکەن[1]. کاتێك هێزەکانی شێخ گەیشتنە دەوروبەری شاری ورمێ، دانیشتوانە مەسیحییەکانی شارەکە ترسان کوردەکان بیانکوژن، بۆیە قەشە سۆلۆمۆنیان بۆ لای شێخ عوبەیدوڵڵا نارد ئەویش داوای لەشێخ کرد ئەوە ڕەچاو بکات کەشارەکە ژمارەیەکی زۆری مەسیحی تێدا دەژی. شێخیش دڵنیای کردەوە کەپەیوەندیی مێژوویی نێوان هەردولا ڕێ نادا دوژمنایەتی لەنێوانیاندا پەیدا ببێ[2].

کاتێك شۆڕشەکەی شێخ لەکوردستانی ئێران شکستی خواردو شێخ گەڕایەوە بۆ کوردستانی عوسمانی، کاربەدەستان ناچاریان کرد سەردانی ئیستانبول بکاو لەوێ گل درایەوە، پاشان- وەکو گوتمان- رایکردو گەڕایەوە بۆ کوردستان. لەڕێی گەڕانەوەیدا، لەشاری بتلیس سەردانی کەنیسەی قەشە فارفۆلۆمیای کردو وتارێکی بەنرخی تێدا خوێندەوە کەتیایدا جەختی لەسەر هاریکاریی نێوان کوردو ئەرمەن کرد. لەو کاتەدا هەرایەك رویداو بازاڕی سەرەکیی شار کەزۆربەی هەرە زۆری هی ئەرمەنەکان بوو، گڕی تێ بەردراو هەر لەو کاتەدا دەمگۆی ئەوە بلاوبۆوە کەئەم ڕوداوە بەفەرمانی شێخ عوبەیدوڵڵا رویداوە[3]. مەبەست لەو ڕوداوە لێك دورخستنەوەی کوردو ئەرمەن بوو چونکە شێخ هەمیشە هەوڵی دەدا لەئەرمەنەکان نزیك ببێتەوەو چەندەها جار داوای لەسەرۆکی تایفەی ئەرمەن ئەرخیما ندریت ئۆگانیس کردبو کۆ ببنەوە بۆ پێکەوە باسکردنی چارەنوسی گەلەکانیان[4]. لەم ڕووەوە یەکێ لەلێکۆڵیارەکان[5] باسی کردوە کەشێخ نامەو نامەکاریی لەگەڵ خدێوی میسر هەبو ئەویش لەو ڕوانگەیەوە کەمیسر ئەزهەری تێدایەو بایەخێکی ستراتیجیشی هەیە، هەروەها نامەو نامەکاریی لەگەڵ شەریفی مەککە هەبو، لەو ڕوانگەیەوە کەمەککە بایەخێکی گرنگی لەجیهانی ئیسلامدا هەیە.

---

[1] جەلیلی، ڕاپەڕین، ل١٩١-١٩٢/ئەمین، سالح محمد، کوردو عەجەم، ل١٦٥.

[2] دهقان، علی، رضائیة یا سرزمین زردشت، تهران، انتشارات ابن سینا، ١٣٤٨، ص٤١٠.

[3] جەلیلی، ڕاپەڕین، ل١٥٣.

[4] بۆ زانیاریی پتر دەربارەی هەوڵەکانی لێك نزیکبونەوەی کوردو ئەرمەن بڕوانە: جەلیلی، ڕاپەڕین، ل١٠٨، ١٤٦، ١٥٣.

[5] ئەمین، سالح محمد، کوردو عەجەم، ل١٦٦.

## پەیوەندیی شێخ لەگەڵ روسیادا

شێخ هەر لەسەرەتاوە هاوکاری کردنی روسیای تزاریی لەهاوکاری کردنی دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی تر پێ باشتر بوو، بەتایبەتی بریتانیا. لەوانەیە هۆی ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەروسیا لەساڵانی ۱۸۷۷-۱۸۷۸دا لەجەنگدا سەرکەوتنی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا بەدەست هێنابوو و لەلایەکی ترەوە بریتانیا لەکوردستانەوە دور بوو و هەڵوێستی بەرامبەر بەبزوتنەوەکانی کورد هەڵوێستێکی باش نەبو وەکو لەبزوتنەوەی یەزدان شێردا دەرکەوت. نزیکبونەوە لەروسیا لەو کاتەدا لەقازانجی جوڵانەوەی سیاسی کورددا بوو[1]. پاش جەنگی ساڵانی ۱۸۷۷-۱۸۷۸ی نێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانی، شێخ عوبەیدوڵلا لەساڵی ۱۸۷۹دا نوێنەری خۆی بۆ کۆنسوڵگەی روس لەئەرزرۆم نارد بۆ ئەوەی بزانێ هەڵوێستی روس چی دەبێ ئەگەر شێخ شۆڕش بکا. نوێنەرەکە بۆ کۆنسوڵی روون کردەوە کەشێخ یارمەتیو کۆمەکی روسەکانی لەهی هەر لایەنێکی تر پێ باشترە[2]. پاش ئەوەی روسیا کۆنسوڵگەی لەشاری وان کردەوە، شێخ نوێنەری خۆی سەید محەمەد سەعید بۆ لای کامساراکان ناردو نوێنەرەکە بۆ کۆنسوڵی روسەکانی روون کردەوە کەکورد دەتوانێ رۆڵێکی گرنگی هەبێ ئەگەر شەڕ لەنێوان روسیاو بریتانیا هەڵبگیرسێ چونکە کورد هەمو ناوچە ستراتیجیەکانو دەربەندە گرنگەکانیان لەکوردستاندا بەدەستەوەیە. کۆنسوڵ گوێی لێ گرت بەڵام بەپیر داواکانی شێخەوە نەچو بەڵکو داوای کرد شێخ داواکانی خۆی بخاتە بەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە چونکە لەو کاتەدا روسو عوسمانییەکان پەیوەندیی باشیان لەنێواندا هەبو[3]. پێدەچێ کۆنسوڵ کامساراکان دژی هاوکاری کردنی کورد بووبێ[4] و زیاتر لەگەڵ هاوکاری کردنی مەسیحیەکاندا بووە، بەتایبەتی ئەرمەنەکان. لەم بوارەدا تێبینی کراوە کەراوبۆچونی کۆنسوڵگەکانی روسیا سەبارەت بەمەسەلەی کورد راو بۆچونێکی یەکگرتو نەبوە بەڵکو لەم روەوە راوبۆچونی جیاواز هەبوە کەئەمانەن: روسەکان هیچ سۆزێکیان بەرامبەر بەئاوات و ئامانجەکانی کورد نەبو بەڵکو دەیانویست پەیوەندییەکانیان زیاتر لەگەڵ مەسیحییەکاندا پتەوتر بکەنو سودیان لێ وەرگرن. وەکو لەراپۆرتەکانی کۆنسوڵەکانی روسیش لەکورستاندا دەردەکەوێ، راپۆرتەکان

---

[1] جلیلی، جلیل، نهضة الاکراد، ص۱۳۹-۱٤۰.

[2] خالفین، الصراع، ص۱۲۰.

[3] خالفین، الصراع، ص۱۲۰/ ئەمین، ساڵح محەمەد، کوردو عەجەم، ل۱۸۲.

[4] جەلیلی، راپەڕین، ل۸٥.

وایان باس دەکرد کەگوایە ئنگلیزەکان شێخ عوبەیدوڵڵا هاندەدەن شۆڕش بکا، بۆیە لەبەر ئەم هۆیە پێیان وابو نابێ هاوکاری لەگەڵ کوردەکاندا بکرێ[1].

پاش ئەوەی شۆڕشگێڕەکان سەرکەوتنی بەرایییان لەکوردستانی ئێراندا بەدەست هێنا، حکومەتی ئێران داوای لەروسیای تزاری کرد هێزەکانی خۆی لەئازەربایجان ئامادە بکا، بەتایبەتی پاش ئەوەی کوردەکان هەڕەشەی گرتنی شاری تەورێزیان کردو لەم سەروبەندەدا حکومەتی ئێران داوای لەروسەکان کرد گوشار بخەنە سەر دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەوەی بکەوێتە سەرکوت کردنی یاخیبونەکەی شێخ. لە١٨ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٠دا ئەلیکزاندەری دووەم بەپێی داواکەی حکومەتی ئێرانەوە چوو و هێزەکانی خۆی نارده سەر سنوری ئازەربایجان‌و فەرماندەیی سوپای ئاگادار کردەوە کەبۆیان هەیە لەکاتی پەرەسەندنی روداوەکاندا یارمەتیی ئێرانییەکان بدەن. جگە لەوە ئەلیکزاندەری دوەم داوای لەباڵیۆزی خۆی لەئیستانبول کرد حکومەتی عوسمانی لەدژی کورد هان بدات. هێزەکانی روس نەچونە ناو خاکی کوردستان بەڵکو لەترسی هەڕەشە سیاسییەکان[2] تەنها بەوە داکەوتن کە لەسەر سنور بمێننەوە. سەرباری ئەمە، حکومەتی روسیا تیپێکی تایبەتی خەڵکی نەخجەوانی بەرفەماندەیی جەنرال ئیلخازۆف بۆ چاودێری کردنی جموجۆڵەکانی کورد دانا[3].

پاش کشانەوەی شێخ بۆ ناو کوردستانی عوسمانی لەساڵی ١٨٨١دا، یەکێ لەکەسانی جێ بڕوای خۆی کەناوی خەلیفە محەمەد سەعید بوو، بۆ لای روسەکان ناردو داوای لێ کردن رێ بەو کوردانە بدەن کە بەهۆی شۆڕشەکەی شێخەوە چونە ناو خاکی روسیا، بگەڕێنەوە بۆ کوردستان[4]. دیارە روسەکان بەتەنگ ئەم داوایەوە نەچون‌و پاش چونی شێخ بۆ ئیستانبول‌و دواتریش راکردنی‌و گەڕانەوەی بۆ کوردستان، شێخ نوێنەری خۆی، عەلی قاسم ئۆغلی، بۆ لای کامساراکان جێگری کۆنسوڵی روس لەورمێ، نارد، ئەویش بەناوی شێخەوە رایگەیاند کە((کورد چیتر ناتوانن بەرگەی دەسەڵاتی تورك بگرن...))[5]ناوبراو بەناوی شێخەوە داوای لەروسەکان کرد پشتگیری کورد بکەن لەململانێیاندا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا. شێخ هیچ داوای یارمەتیی

---

[1] نەمین، سالح محەمەد، کوردو عەجەم، ل١٨٢.

[2] زكي، خلاصة، ص٢٤٣/ خالفين، الصراع، ص١٢١-١٢٢.

[3] محمد قاسم واخرون، تاريخ القرن التاسع عشر، ص٢٨.

[4] جەلیلی، راپەرین، ل١٤٥.

[5] خالفين، الصراع، ص١٤٤.

دارایی و مەعنەوی لەروس نەکردبوو، بەڵکو نوێنەری شێخ بۆ کامساراکانی رون کردەوە کەئەوان بەهەوڵ و تەقەللای خۆیان هەوڵی دەرکردنی ئیدارەی تورك لەناوچەکانی هەکاری و وان و بتلیس دەدەن و پاشان ئەوە رادەگەیەنن کەدەیانەوێ ببنە هاوولاتی روسیاو لەم سەروبەندەشدا شێخ ئامادەیە لەژێر فەرمانی حکومەتی روس‌دا کار بکا. بەلام ئەو زانیارییانەی لەسەرکردایەتیی روسەوە لەبەر دەستی کامساراکان‌دا بون، ئامۆژگاریی ئەوەیان دەکرد کەنابێ هیچ بەڵێنێك بەشێخ بدرێ بەڵکو پێویستە داوای لێ بکرێ گوێڕایەڵی حکومەتی عوسمانی بێ بەبێ قەیدو شەرت[1]. ئەمەش وای لەشێخ کرد هیچ ئومێدێکی بەروس نەبێ.

## پەیوەندیی شێخ لەگەڵ بریتانیادا

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم‌دا حکومەتی بریتانیا ویستی پەیوەندیی سیاسی و بازرگانی خۆی لەگەڵ هەر یەك لەئێران و دەوڵەتی عوسمانی پەرە پێ بداو لەم سەروبەندەدا هەر یەك لەئەناتۆلیای رۆژهەلات و ئەرمەنستان و کوردستان بونە جێ بایەخی کاربەدەستانی بەریتانیاو لەم روەوە تایبەتمەندییەکانی بازاڕی ناوخۆیی و رێگاوبان تاوتوێ کران. پاش جەنگی ۱۸۷۷-۱۸۷۸ی نێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانی، ناوەندەکانی بریتانیا هەوڵێکی زۆریان دا تا تورکیا بەلای خۆیاندا راکێشن بۆ ئەوەی تورکیا ببێ بەلایەنگری بریتانیا لەململانێیدا لەگەڵ روسیاو لەم بوارەدا بریتانیا بەگوێرەی پەیمانی ساڵی ۱۸۷۸ی بەرلین زۆر دەستکەوتی وەدەست هێنا کەگرنگترینیان ئەوە بوو کەسوڵتان عەبدولحەمید قوبرسی پێشکەش بەبریتانیا کرد[2] لەپای ئەوەی کەهەندێ لەئەفسەرانی بریتانیا بەناوی خوازراوەوە بەشدار بون لەو جەنگە شانبەشانی دەوڵەتی عوسمانی.

لەم سەروبەندەدا ناوچەی دەسڕۆیی شێخ عوبەیدوللا بوو بەو شوێنەی کەئنگلیزەکانی سەر بەکونسوڵگەکانی بریتانیا لەناوچەکەدا بە بەردەوامی سەردانیان دەکرد. بەم پێیە، کریستیان رەسام سەردانی باشقەلای کرد کەیەکێ لەبارەگاکانی شێخ بوو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری[3]. هەروەها بریتانیا لەساڵی ۱۸۷۹دا لەژێر پەردەی یارمەتیدانی بۆ زاڵبون بەسەر برسێتیەدا دوا بەدوای جەنگی روسیا- عوسمانی لەکوردستان‌دا، هەندێ کۆمەکی پێشکەش بەشێخ کرد ئەگەرچی شێخ بەگومانەوە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٤٤-١٤٥.

[2] علي، اورخان، السلطان عبدالحميد، ص١٤٠.

[3] خالفين، الصراع، ص١٢١-١٢٣.

دەیڕانییە بریتانیاو لەم ڕووەوە دەوڵەتی عوسمانی ئاگاداری ئەو وەرگرتنی کۆمەکە بوو[1].

لەو ساڵەدا، واتە ساڵی ١٨٧٩، ئینگلیزەکان چەند جارێک سەردانی ناوچەی دەسڕۆیی شێخیان کرد. جێگری کۆنسوڵی ئینگلیز لەشاری وان، کلایتۆن، سەردانی ناوچەی هەکاریی کرد بۆ دیدەنی شێخ لەشەمدینان. لەوێ چاوی پێ کەوت و لەو چاوپێکەوتنەدا عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵاش ئامادە بوو. چەند دانیشتنێک لەنێوان کلایتۆن و شێخ ئەنجام دراو کلایتۆن داوای کرد دانیشتنێکیشی لەگەڵ سەرخێڵە کوردەکاندا بۆ ساز بکەن[2]. ئەوەش هاتە دی. پاشان شێخ پەیامێکی دایە کلایتۆن کە بەکاربەدەستانی ئینگلیز رابگەیەنێ کەکورد کۆمەک و یارمەتییان لێ ناوێ بەڵکو دەیانەوێ ئەو دابەشبوونەی کوردستان لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران نەمێنێ و داوایان لێ دەکەن ببنە پشتیوانی کورد بۆ یەکپارچەکردنی کوردستان. شێخ نامەی بۆ کۆنسوڵی ئینگلیز لەتەورێز، ئابۆت، ناردو هەروەها نامەیەکیشی بۆ کۆنسوڵی ئینگلیز لەورمێ ناردو لەو نامانەدا جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کەگەلی کورد گەلێکی دلێرەو دابەو نەریتی خۆی هەیەو دوژمنەکانی لەفارس و تورک هەمیشە هەوڵ دەدەن بەدڕندە ناوی ببەن. هەروەها شێخ لەنامەکانیدا ساغی کردەوە کەسەرانی کورد پێیان باشە چارەسەرێکی سیاسی گونجاو بۆ مەسەلەی کورد بدۆزرێتەوە چونکە کورد چیتر بەرگەی زوڵم زۆر ناگرن و ئامادەن کار بکەن بۆ رزگاربوون و هیچ درێغیش لەقوربانیدان و خۆبەخت کردندا ناکەن[3].

مانگی ئەیلولی ساڵی ١٨٨٠ ئابۆتی کۆنسوڵی ئینگلیز لەتەورێز فەرمانی لەتۆمسۆنی باڵیۆزی ئینگلیزەوە لەتاران پێ گەیشت کەسەردانێکی ناوچەکانی دەسڕۆیی شێخ بکا بەڵام دەرکەوت مەبەست لەو سەردانە کۆکردنەوەی زانیارییە لەسەر هێزو جموجۆڵەکانی شێخ. کاتێک ئابۆت گەیشتە شاری ورمێ. ئامۆژگاریی ئیقبالودەولەی فەرماندەی هێزەکانی شارەکەی کرد کەخۆی بەدەستەوە بدات بەڵام ئیقبالودەولە رازی نەبوو[4]. لەهەمان کاتدا ئابۆت داوای لەمەسیحییەکانی شارەکە کرد هیچ بەشدارییەک لەشۆڕشەکەی شێخدا نەکەن و خۆیانی لێ بپارێزن.

---

[1] خالفين، الصراع، ص ١٢٢/ الوائلي، اكراد العراق، ص١٧٤/ ئەمین، ساڵح محەمەد، کوردو عەجەم، ل١٨٢.

[2] جەلیلی، راپەڕین، ل١١١-١١٣.

[3] Safrastion, A. Kurd. O.P. Cit. P. ٢٤.

[4] خالفين، الصراع، ص١٢٠-١٢١.

لەسەردانەکەی ئابۆت سەرنج دراوە کەهیچ یارمەتییەکی پێشکەش بەشێخ نەکردوە بەڵکو هەر خەریکی زانیاری کۆکردنەوە بوە، ئەگەرچی لایەنگرەکانی شێخ لەشارو گوندەکاندا پارێزگاریان لێ دەکردو لەو سەردانەدا ئابۆت هیچ زیانێکی پێ نەگەیی. شێخ عوبەیدوڵڵا داوای لەئابۆت کرد بۆ بەرپرسەکانی خۆیو دەوڵەتە ئەوروپایییەکان باسی راستیو دادپەروەریی شۆڕشەکە بکا، هەروەها سەید محەمەد، نوێنەری شێخ، زوڵمو زۆری حکومەتی ئێرانی بەرامبەر بەکورد بۆ ئابۆت رون کردەوە[1].

کاتێك شێخ هەڕەشەی گرتنی شاری تەورێزی کرد، حکومەتی ئێران هاواری بردە بەر روسیاو باڵیۆزخانەی بریتانیا لەتارانو شای ئێران لە١١ی تشرینی دوەمی ١٨٨٠دا داوای لەتۆمسۆنی باڵیۆزی ئنگلیز کرد داوا لەحکومەتی عوسمانی بکا دژی کوردەکان جموجۆڵ بکاو هەر سەرکەوتنێکی کورد بەو مانایە دێ کەکورد لەروسیا نزیك دەبنەوە. دیپلۆماسیەتی ئنگلیز توانی حکومەتی عوسمانی ناچار بکا هێزەکانی لەوان کۆ بکاتەوەو شوێنە ستراتیجییەکان بگرێ[2]. لەو کاتەدا بەرژەوەندیی بریتانیا پێویستی بەهاریکاری کردنی ئێران هەبوو و نەیدەویست هیچ دەوڵەتێك دەست لەکاروباری ناوخۆی وەر بدات لەو روانگەیەوە کەئێران ولاتێکی گرنگە بۆ پارێزگاری کردن لەئیمپراتۆریەتی بریتانیا لەهندستان[3]. لێکۆڵیارێکی کورد وتویەتی[4] ئنگلیزەکان لەگەڵ داواکانی کورددا نەبونو دەکرێ هەڵوێستیان بەم شێوەیە کۆبەند بکرێ:

ئنگلیزەکان داواکانی گەلی کوردیان سەبارەت بەسەربەخۆیی پشت گوێ دەخستو داوایان لەکورد دەکرد مل بۆ هەردو حکومەتی ناوەندی تارانو ئیستانبوڵ کەچ بکات، مەسیحییەکانیشیان رادەسپارد لەکورد نزیك نەکەونەوەو لەهیچ بزاوتێکدا هاوبەشی لەگەڵ کورددا نەکەن، کوردیشیان تۆمەتبار دەکرد کەگوایە کۆمەك لەروسیا وەردەگرنو لەم روەوە زانیاریی نهێنییان سەبارەت بەبزاوتو جموجۆڵەکانی کورد دەدایە هەر یەك لەتارانو ئیستانبوڵ. لەهەمان کاتدا ئنگلیزەکان داوایان لەشێخ عوبەیدوڵڵا کرد واز لەداواکانی سەبارەت بەرزگاریو سەربەخۆیی بێنێو هەردو

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٢٩-١٣٢.

[2] جەلیلی، راپەڕین، ل١٤١/ الطالباني، کردستان، ص١٩٦.

[3] هلمز، سنشیا، زوجات السفراء في ایران، ترجمة سامي جابر، دار للروج، ١٩٨٦، ص١٥٤.

[4] نەمین، سائح محەمەد، کوردو عەجەم، ل١٨٥-١٨٩.

حکومەتی ئێران و عوسمانییان هاندا تەقەللاکانیان یەکبخەن بۆ کۆتایی هێنان بەشۆڕشی کورد.

### هۆکانی شکستی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا نەهری

چەند هۆیەك ڕۆڵیان لەشکستی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلادا هەبو کەدەکرێ بەم شێوەیە کورت بکرێنەوە: حکومەتی روسیاو باڵیۆزخانەی بریتانیا لەتاران ڕۆڵێکی گەورەیان لەشکست پێ هێنانی شۆڕشەکەدا بەهاندانی حکومەتی ئێران هەبوو و هەردوکیان فشاریان بۆ دەوڵەتی عوسمانی هێنا بۆ هاوکاری کردنی حکومەتی ئێران بۆ شکست پێ هێنانی شۆڕشەکەدا[1]. مژدەبەری ئەمریکایی کوهران ڕۆڵێکی گەورەی لەوەدا هەبو کەقەناعەت بەشێخ بکات هێرشەکەی بۆ سەر شاری ورمێ چەند ڕۆژێك دوا بخا[2]، ئەمەش کاری کردە سەر ورەی هێزەکانی شێخ چونکە وای لەشێخ کرد خاوخلیچکی بکا لەهێرشکردن لەکاتێکدا حکومەتی ئێران خەریکی ناردنی هێزی فریاڕەس بوو بۆ هێزە گەمارۆدراوەکانی ناو شاری ورمێ[3]. ئەگەر هێزەکانی شێخ سودیان لەباڵادەستی خۆیان لەناوچەی موکریان وەربگرتایەو ورمێیان بگرتایە، باروخێکی وایان وەدەست دەهێنا کەدەیانتوانی بەهۆیەوە گوشار بخەنە سەر حکومەتی ئێران بۆ وتووێژو لەوانەیە مەسەلەکە بەسەرهەڵدانی ناکۆکی لەنێوان روسیاو بریتانیا بگەیشتایە. هەندێ لەکوردەکان بەشداریان لەشۆڕشدا نەکردبو، بەڵکو لەگەڵ حکومەتی ئێراندا بون، کاتێك هێزەکانی شێخ کشانەوە، ئەوانە کۆ بونەوەو کەوتنە شەڕکردن لەگەڵ هێزە کشاوەکانداو زیانێکی زۆریان پێ گەیاندن[4].

هەروەها هەندێ لەهێزەکانی شێخ کەوتنە هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی هەندێ دەسکەوت بۆ خۆیان و فاکتەری نەتەوەییان فەرامۆش کرد، سەرباری ئەوەی کەسوپاکەی شێخ لەچەندەها خێڵ پێکهاتبوو و چەکی قورس و تۆپخانەشی نەبو سەرباری نەبونی کۆنترۆڵ و دیسپلین مەشق و ڕاهێنان.

---

[1] زکی، خلاصة، ص٢٤٣-٢٤٤/شریف، د. عبدالستار طاهر، الجمعیات والمنظمات والاحزاب الکردیة في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، بغداد، ١٩٨٩، ص٣٨/قاسملو، اریمون عاما، ص٢٢/ البریفکاني، عبدالقادر، مصطفی البارزاني زعیم الحرکة القومیة الکردیة المعاصرة، ١٩٩٦، القاهرة، ص٤٩.

[2] علي، حامد محمود، المشکلة الکردیة في الشرق الاوسط، ص٢٠.

[3] لاني، الاکراد في ترکیا، ص٩٠.

[4] جەلیلی، ڕاپەڕین، ل١٣١.

## سەرەنجامەکانی شۆڕش

لەناکامی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵادا حکومەتی ئێران بەکۆمەڵ سزای کوردەکانی داو زۆر گوندی لێ وێران کردن. ئەمەش بوە هۆی چەقینی بزوتنەوەی نیشتمانی کورد بۆ ماوەی دەوروبەری سی ساڵێك[1]. لەو ماوەیەدا کوردەکان هیچ رەنجێکی دیاریان نەدا بۆ بەدی هێنانی ئامانجە نەتەوەییە رەواکانیان، لەکاتێکدا شکستی شۆڕش لەکوردستانی عوسمانی بوە هۆی لاوازکردنی بزاڤی نەتەوایەتی‌و ئەنجام نەدانی هیچ بزوتنەوەیەکی چەکدارانە بۆ رزگارکردنی کورد جگە لەو هەوڵانەی کە لەساڵی ١٨٨٩دا کوڕانی بەدرخان ئەنجامیان داو چارەنوسەکەشیان ژێرکەوتن‌و شکست بوو.

یەکێ لەناکامەکانی شۆڕشەکە گۆڕانی سیاسەتی عوسمانی بوو بەرامبەر بەرۆڵی کوردو پێکهێنانی میلیشیای سوارەی حەمیدیەو کردنەوەی هەندێ فێرگەی خێڵەکی لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە. هەر چۆنێك بێ، سەرەڕای ئەو زیانەی کە بەر بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی چەکداری شێخ عوبەیدوڵڵا کەوت، هەستی نەتەوەیی کەوتە جۆش‌و خرۆش‌و لەمێژوی تازەدا درێژەی پێ درا، وەك لەساڵانی دواتردا دەرکەوت. هەروەها ئەو شۆڕشە کاری کردە سەر فراوانبون‌و گەشەکردنی بزاڤی رۆشنبیری‌و پەیوەندیکردنی ژمارەیەکی زۆری کورد بەدەرەوەی کوردستانەوە، بەتایبەتی بەئەوروپاوە[2].

لەو سەروبەندەشدا هەر یەك لەحکومەتەکانی ئێران‌و روسیا لەلایەك‌و حکومەتەکانی عوسمانی‌و ئنگلیز لەلایەکی ترەوە تۆمەتیان خستە پاڵ یەکترییەوەو لەم بوارەدا رۆژنامەکانی تاران‌و روسیا وایان بلاوکردەوە کەگوایە هەر یەك لەدەوڵەتی عوسمانی‌و بریتانیا دەستیان لەهاندانی شێخدا هەبوە لەدژی ئێران‌و هەروەها رۆژنامەکانی ئیستانبول‌و بریتانیا روسەکانیان بەوە تۆمەتبار کرد کەشێخیان هانداوەو یارمەتیشیان داوە[3]. ئەمەش بوە هۆی مانەوەی مەسەلەی کورد وەك بابەتێکی جێ باس لەنێوان لایەنە نێودەوڵەتییەکان.

---

[1] نەمیق، سالح محمد، کوردو عەجەم، ل١٩٣.

[2] سلوبی، زنار، في سبيل كردستان، ترجمة ر. علي، بيروت، ١٩٨٧، ص١٤٢/لەسعودوا، سلوبي، في سبيل كردستان.

[3] Hasan Arafa. O.P. Cit. P.٢٤.

هەروەها یەکێ لەسەرەنجامە لاوەکییەکانی ئەم شۆڕشە تورەبونی دانیشتوانی شاری ورمێ بوو لەمژدەبەرەکان بەتایبەتی و مەسیحییەکان بەگشتی گوایە لەکاتی شۆڕشەکەدا بەلای عوبەیدوللاّ دایانشکاندوە[1].

---

[1] S.G.wilson, Persin, Persin Life and Customs, New York, ١٩٦٦, P ١٢٢.

سولتان عەبدولحەمید چووە سەر عەرشی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو ئەم رووداوە لەسیاسەتی نوێی ئەو دەولەتەدا وەرچەرخانێك بوو چونكە ئەو لەكاتێكی دژواری مێژووی دەولەتی عوسمانیدا حوكمی گرتە دەست، واتە لەدوای مردنی سولتان عەبدولعەزیز لەبارودۆخێكی تەمومژاویداو پاش شێت بونی براكەی(سولتان مورادی پێنجەم). مەدحەت پاشا رۆلێكی گەورەی هەبوو لەوەی سولتان عەبدولحەمید عەرشی دەسەلات بگرێتە دەست، سەرباری دەركردنی فەتوایەك لەلایەن شەیخولئیسلامەوە بەلابردنی سولتان مورادی پێنجەمو دانانی عەبدولحەمید لەمانگی ئابی سالی ١٨٧٦دا[١]. ئەو رۆژەی عەبدولحەمید لەسەر عەرشی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دانیشت رۆژێكی دیارو پڕ لەرووداو[٢] بوو. حكومەت لەو دەمەدا دوچاری لاوازیو قەرزێكی زۆر ببوو و قەرزەكە بەدوو سەد ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی مەزەندە دەكرا[٣]. دوو سال بەسەر راگەیاندنی دەستوردا تێنەپەڕیبوو كەسولتان لە١٤/٢/١٨٧٨دا فەرمانی دەركرد كەچیتر كار بەو دەستورە نەكرێت[٤].

لەسەردەمی ئەودا جەنگی رووسی- عوسمانی لەسالانی ١٨٧٧-١٨٧٨ هەلگیرسا، جگە لەچەندین گێوگرفتی ناوخۆیی[٥]. هەلوێستی سولتان عەبدولحەمید لەئاستی نەتەوەكانـدا هەلوێستێكی دووفاقیانە بوو. ئەو لە١٣ی كانونی یەكەمی ١٨٧٧و لەمەراسیمی كردنەوەی پەرلەماندا رایگەیاند كەرێز لەمافی نەتەوەكان دەنێتو بڕوای بەهاتنەدیی یەكسانی هەیە[٦]، كەچی بەردەوام ئاستەنگو رێگریی لەبەردەم

---

[١] باتريك ماري ملز، سلاطين بني عثمان، ص ٧٦و ٧٧و ٨٠/الحنبلي، شاكر افندي، تلخيص التاريخ العثماني، ص١٤/ د. محمود صالح منسي، حركة اليقظة العربية في الشرق الاسيوي، القاهرة، ١٩٧٨، ص٧١.

٢ علي، اورخان، السلطان عبدالحميد، ص٩٢-٩٣.

٣ الهلالي، محمد مصطفى، السلطان عبدالحميد الثاني، الموصل، ١٩٤٤، ص١٥/ عبدالقادر، عصمت برهان الدين، دور النواب العرب في مجلس المبعوثان العثماني ١٩٠٨-١٩١٤، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الاداب بجامعة الموصل، ص١٩.

[٤] هالـلب، السلطان الاحمر، ص ٣١٤.

[٥]Edward Mead Earl, Turkey, The Great Powers and Baghdad railway, p.٩.

[٦] عبدالقادر، عصمت، دور النواب العرب، ص٩٧.

گەشەسەندنی بزاوتە نەتەوەییەکاندا دروست دەکرد[1]. سولتان عەبدولحەمید سیاسەتی دەولەتی بەرامبەر بەکوردەکان گۆڕی و کەبایەخی پێدان و لەدەولەتدا کاری گرنگی پێبەخشین بەهۆی ئازایەتییان و دلسۆزییان بۆ ئایینی ئیسلام و ڕێزگرتنیان لەسولتان وەکو خەلیفەی موسلمانان[2]. ئەم سولتانە لەکوردەکان نزیک بۆوە بەتایبەتی لەسەرۆک عەشیرەتەکان و کۆمەلێ ئیمتیازی فراوانی پێبەخشین[3] و لەکۆتایی سەردەمی عوسمانییدا کوردەکان پایەی گرنگیان لەسوپادا وەرگرت. یەکێ لەتوێژەرە هاوچەرخەکان دەلێت[4]: سەعید پاشا کە کوردەو خەلکی ناوچەی پشدەرە بوو بەوەزیری دەرەوە. بەلام لەهەمان کاتدا سولتان عەبدولحەمید سیاسەتێکی دوولایەنیی پەیڕەو دەکرد" حوکمی خۆی لەکوردستاندا پتەو دەکردو یارمەتی سەرکردە ئایینییەکانی دەدا[5]. سولتان عەبدولحەمید بایەخی بەلایەنی ئایینی دەدا چونکە گیروگرفتە ناوخۆییەکانی دەولەتی عوسمانی پەرەیان سەندبوو و نەتەوەکان داوای سەربەخۆییان دەکردو دەولەتە گەورەکانیش لەسۆنگەی بەرژەوەندییە ئابورییەکانیانەوە فشاریان دەخستە سەر دەولەتی عوسمانی. لەچارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەو بەرژەوەندییانە زیادیان کرد چونکە لەئەوروپادا پیشەسازی، پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە بینی و ئەلمانیا وەکو دەولەتێکی یەکگرتوو کەبەربەرەکانێی دەولەتە ئەوروپییەکانی دەکرد، دەرکەوت. سولتان عەبدولحەمید لەسەروبەندی جەنگی سالانی ١٨٧٧-١٨٧٨دا و لەڕێگەی شێخولئیسلامەوە دوو فەتوای دەرکرد، یەکەمیان بریتی بوو لەجیهادکردن لەدژی کافران و دووەمیشیان داهێنانی نازناوی((غازی))بۆ سولتان عەبدولحەمید. دەشێت دەرکردنی فەتوا بۆ جیهادکردن بەلگەی پەی بردنی بێ بەبروا نەهێنانی گەلانی عوسمانی بەدروشمەکانی ماف و یەکسانی دەولەت، ئەو دروشمانەی کەسولتان عەبدولحەمید لەکاتی کردنەوەی پەرلەمانی عوسمانییدا لەمانگی کانونی یەکەمی سالی ١٨٧٧دا بانگەشەی بۆ کرد.

عەلی وەردی دەلێت سولتان عەبدولحەمید دروشمی ((موسلمانانی دنیا یەکگرن))ی بەرز کردەوە[6]، لەپشتی ئەمەشدا دەیویست ئایین بۆ بەرەنگاریی

---

[1] منسي، محمود صالح، حركة اليقظة العربية، ص٩٣.

[2] الموصلي، عرب واكراد، ص١٩٤.

[3] Christian More: Les Kurds, oujourdhuis Hormattar, paris, ١٩٨٤, p.٤٣.

[4] الموصلي، عرب واكراد، ص ١٩٩.

[5] الارحيم، تطور العراق، ص٨٩.

[6] الوردي، لمحات اجتماعية، ج١، ص٢٤.

نەیارەکانی خۆی لەناوەوەو رووبەرووبونەوەی دوژمنەکانی لەدەرەوە، بەکار بهێنێت. لەبەر ئەوە بایەخێکی زۆری بەئاین دا. ئەو وایدەبینی کەبیرۆکەی پان ئیسلامیزم گرەنتییەکە بۆ ئەوەی موسڵمانان بەنەتەوە جیاجیاکانییانەوە لەدەوری عەرشی سوڵتاندا کۆ ببنەوەو بەرەنگاری هێزە بیانییەکان بکەن[1]. ئیدی لەم سۆنگەیەوە فەرمانی دا قورئانی پیرۆز چاپ بکرێ و بەسەر شارەکان و وڵاتە ئیسلامییەکاندا دابەش بکرێت، پاشان دەستی کرد بەدابەشکردنی مووی پێغەمبەر بەسەر مزگەوتەکاندا. گەیشتنی مووی پێغەمبەر بۆ هەرێمەکان لەوانە عیراق، رۆژێکی دیار بو[2]. یەکێك لەرواڵەتەکانی پان ئیسلامیزم ئاهەنگگێڕان بوو بۆ یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر. سوڵتان داوای لەزانا عەرەبە ئاینییەکان کرد بێن بۆ ئیستانبوڵ و لەوێدا بمێننەوە، هەروەها هەوڵیدا ژمارەی ئەفسەرە عەرەبەکان لەسوپادا زیاد بکات و هەندێکیانی لەپلەی بەرزی دەوڵەتدا دامەزراند. بۆ نموونە عیززەت پاشای کرد بەسکرتێری دووەمی دەربار، نەعوم پاشای کرد بەراوێژکاری وەزارەتی دەرەوە، نەجیب پاشایشی کرد بەسەرۆکی دەزگای ئاسایش، هەروەکو هەڵوێستی خۆی توند کردەوە لەبەرامبەر کۆچکردنی جولەکە بۆ فەلەستین[3] و لەم رووەوە بەتوندی پێشنیارەکەی هێرتزلی رەتکردەوە. جگە لەوە، ئازناوی خەلیفەی زیندو راگرت و بەشێکی زۆری رۆژنامە سوڵتانییەکانی بۆ پڕوپاگەندەکردن بۆ پان ئیسلامیزم تەرخان کردو جەمالەددین ئەفغانیی هێنایە ئیستانبوڵ[4]. هەروەها لەروخسارەکانی پان ئیسلامیزم هەوڵدان بوو بۆ باش کردنی پەیوەندیی نێوان سوننەو شیعە. هەموو ئەم شتانە دەوڵەتە ئەورووپییەکانیان بێزار کرد، بەڵام ئەوەی ئاگاداری رەوتی پێشکەوتنی پان ئیسلامیزم بێت، تێبینی ئەوە دەکات کەتوانای سەرکەوتنی ئەم بیروباوەڕە وەك چەکێك بۆ بەرەنگاری هێزە بیانییەکان زۆر لاواز بوو[5].

---

[1] منسي، محمود صالح، حركة اليقظة العربية، ص٧٤-٧٥.

[2] الوردي، لمحات، ج١، ص٢٥.

[3] بروندز، جوی واخرون، جذورنا لا تزال حية، ترجمة مكي حبيب المؤمن، بغداد، ١٩٨٢، ص ٣٠-٣١.

[4] جەمالەددینی ئەفغانی لەلایەنگرانی بیرۆکەی پان ئیسلامیزم بوو و وای باس کردبوو کەجیهانی ئەمڕۆ جیهانی ئیمپراتۆریەتە گەورەکانی وەك ئیمپراتۆریەتەکانی روسیاو بریتانیاو فەرەنساو ئەڵمانیایە... بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان ئیمپراتۆریەتێك دامەزرێنن لەسەی سەر زاریان تێیدا یەکگرتر بن و بتوانن بەربەرچی ئەو دەوڵەتانە بداتەوە، کەسەرخیان لێ خۆش کردوون. ناوبراو بانگەشەی بۆ یەکگرتنێکی تەواوی نەتەوەو دەوڵەتە ئیسلامییەکان نەکرد بەڵکو داوای کرد موسڵمانەکان یەك سەرکردەیان هەبێ کەسوڵتانی عوسمانییە. بڕوانە: جمال الدين الافغاني والشيخ محمد عبده، العروة الوثقى ط ٢، ١٩٨٠، ص١٠٧-١١٣.

[5] حسن، جاسم محمد، العراق في العهد الحميدي، ص٦٣-٧٥.

## سوارەی حەمیدییە

یەکێ لەدەرکەوتەکانی گۆڕانی سیاسەتی عوسمانی بەرامبەر بەکورد، وەك وتمان، ئەوە بوو کەبەرپرسەکان ویستیان لەعەشیرەتە کوردەکان هێزێك دروست بکەن کەراستەوخۆ سەر بەخۆیان بێت بۆ ئەوەی لەژێر فەرمانی سوڵتان دەرنەچن.

دوای ئەوەی سوڵتان عەبدولحەمید دەسەڵاتی عەرشی گرتە دەست، کاربەدەستان بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ دانراو دەستیان کرد بەپراکتیککردنی ئەو مەسەلەیەو سەمیح پاشای سەرکردەی سەربازیی ئەرزەرۆمیان بۆ ئەو کارە سەرپشك کرد. ئیدی سەمیح پاشا ویستی هێزێکی سوارە لەعەشیرەتە کوردەکان پێك بهێنێت کە سەر بەسوپا بێت، بەڵام لەسەرەتادا هەوڵەکانی سەمیح پاشا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا بەهۆی دوودڵیی عەشیرەتە کوردەکان لەوەی لاوەکانی خۆیان بۆ ئەو هێزە بنێرن. بەجۆرە بەرەنگاریی هەوڵەکانی سەمیح پاشا بوونەوە، بەڵام هەندێ لەعەشیرەتەکان بەڵێنیان دا پیاوەکانی خۆیان بۆ ئەو هێزە رەوانە بکەن، وەك خێڵی زیلانیو کاسکانایی[1].

لەمانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٨٧٧دا سەمیح پاشا یەکێ لەسەرخێڵە کوردەکانی(ئیبراهیم پاشا) نارد تا بەنێو عەشیرەتە کوردەکاندا بگەڕێتو جەنگاوەران کۆ بکاتەوە، بەڵام ئەویش لەم کارەدا سەرکەوتوو نەبوو[2]. ئیتر سەمیح پاشا نەیتوانی ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات، بەڵام لەسەروبەندی جەنگی ساڵانی ١٨٧٧-١٨٧٨دا و لەرێگەی سەپاندنی جیهاددا عوسمانییەکان توانییان چەکدارەکان کۆ بکەنەوە تا لەو جەنگەدا بەشداری بکەن. لەپاش شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا، ئەدهەم پاشای والیی هەکاری لەساڵی ١٨٨٤دا هەوڵێکی پتری دا تا لەسەرخێڵە کوردەکان نزیك ببێتەوە. ئەدهەم پاشا پێشنیاری ئەوەی کرد نووروڵڵا(کەیەکێ بوو لەخزمانی شێخ عوبەیدوڵڵا)بکرێت بەسەرۆکی کوردان لەناوچەی هەکاریو هەروەها بکرێت بە بەڕێوەبەری ئەو خوێندنگەیەی بڕیار بوو لەباشقەڵا بکرێتەوە. ئەم والییە چەندین کۆبوونەوەی لەگەڵ کەسایەتییە کوردەکاندا گرێدا بەڵام نەیتوانی بەلای خۆیاندا رایانبکێشێت[3]. بەڵام ئەو بیرۆکەیە هەر مایەوە کاتێك زەکی پاشا بوو بەفەرماندەی تیپی چوارەم لەئەرزەرۆم، سەرلەنوێ ئەو هەوڵەی دەستی پێکردەوە بۆ کۆکردنەوەی عەشیرەتەکانو پێکهێنانی هێزێك لێیان بەپاڵپشتیی شاکر پاشای فەرماندەی گشتیی

---

[1] جەلیلی، راپەڕین، ل ٤٤-٤٦.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٤٦.

[3] خالفین، الصراع، ص ١٤٧.

هێزەکانی عوسمانی بۆ ئەوەی لەویلایەتەکانی ئەناتۆلیا هەندێ چاکسازی ئەنجام بدات. عوسمانییەکان ئەم بیرۆکەیەیان لەروسەکان وەرگرتبوو کاتێك روسەکان لەساڵی ١٨٧٨ هێزێکی غەیرە نیزامییان دروست کرد بەناوی هێزی قوزاقی کە کوردەکانی دانیشتووی قەفقاس پەیوەندییان پێوە کرد[1].

لەپێناوی پێکهێنانی ئەم هێزەدا، لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٩٠دا فەرمانێکی رەسمی دەرچو[2]. لەم بوارەدا هەوڵدانی عوسمانییەکان بەردەوام بوو بۆ قایلکردنی هۆزو سەرخێڵەکان تا بچنە ناو ئەو هێزە نوێیەوە کەوەك رێزێك بۆ ناوی سوڵتان عەبدولحەمید ناونرا سوارەی حەمیدیە[3]. عوسمانییەکان بەناوی سوڵتانەوە بەڵێنی چەندین ئیمتیازیان بەکورد دا مەبەستی ئاشکرایان لەدامەزراندنی ئەم هێزەدا ئەوە بوو وا لەکوردەکان بکەن داکۆکی لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی بکەن، ئیدی چەندین دەعوەتنامەیان ئاراستەی زۆربەی سەرخێڵە کوردەکان کرد تا لەئیستانبوڵ سەردانی سوڵتان بکەن. ژمارەیەکی زۆری سەرۆك عەشیرەتەکان بەپیر بانگەوازەکەوە چوون، بەتایبەتی هەندێ لەعەشیرەتەکانی کوردستانی باکوور[4]. ئەوە بوو سەردانیی ئیستانبوڵیان کردو بەبۆنەی گەیشتنیانەوە ئاهەنگێکی گەورەیان بۆ ساز کراو خودی سوڵتان لەکۆشکەکەی خۆیدا پێشوازیی لێکردن لەکاتێکدا بەدەگمەن لەوێدا پێشوازی لەخەڵك دەکرد. ئەم چەشنە سەردانە یەکەمجار بوو و شتێکی تازە بوو. کاتێك سەرخێڵەکان روواڵەتەکانی پێشکەوتنی پایتەختیان بینی، دوچاری سەرسوڕمان بوون و نزیکەی یەك مانگ تیایدا مانەوە، سوڵتانیش دیاری و مەدالیاو نازناو و پلەی سەربازیی پێبەخشین، سەرباری مووچەیەکی مانگانە، ئەوەش دوای ئەوەی بەڵێنیان بەسوڵتان دا کە ژمارەیەکی گەورەی پیاوانی خۆیان بۆ هێزەکانی سوڵتان دەنێرن. سوڵتان ئیمتیازاتی دیکەی پێبەخشین و لەپێدانی باج و پیتاك لێیان خۆشبوو[5]. کاتێك سەرخێڵەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان، هەندێکیان لەبەڵێنەکانیان پاشگەز بوونەوە. بۆ نمونە خێڵی جەلالی لەناوچەی بایەزید ئەوەیان رەتکردەوە کەپەیوەندی بەسوارەی حەمیدییەوە بکەن و پیاوانی خێڵەکە لەسنور پەڕینەوەو بەرەو ئێران رۆیشتن،

---

[1] Edgar Qballance. O.P. Cit. P. ١٨.

[2] لازاریف، کێشە، ل٨٤.

[3] جليلي واخرون، الحركة الكردية، ص٤٣.

[4] ادم سمث، رحلة الى بلاد الشجعان، ص ٧٩.

[5] جليلي جليل، نهضة الاكراد، ص١٨.

هەروەها ئەمین ئاغای سەرخێڵی حەیدەرانلی کەمەدالیای مەجیدیی پلەی سێیەم و نازناوی پاشای پێدرابوو، نەیتوانی تەنانەت یەك فەوجیش دروست بکات لەکاتێکدا لەپایتەخت بەڵێنی بەسوڵتان دابوو دوو فەوج پێك بهێنێت(کەدەکاتە نزیکەی هەزار سوارە)، حەیدەرانلی بەگەورەترین خێڵی کوردەکانی کوردستانی باکوور دادەنرا کەژمارەی خێزانەکانی بە بیست هەزار خێزان مەزەندە دەکرا[1]. لەنێوان پەنجا سەرخێڵی کورددا کەسەردانی ئیستانبوڵیان کردبوو و بەڵێنیان دابوو بچنە ناو سوارەی حەمیدییەوە، تەنها(١٣)سەرخێڵ پەیوەندییان بەو هێزەوە کرد، ژمارەیەکی زۆری خێڵە کوردەکان ئامادە نەبوون بچنە ناو ئەو هێزە، لەوانە خێڵی جەربەزەی هەمەوەند، هەروەها خێڵەکانی دیاربەکرو دەرسیم و بەدرخانییەکان و شەمدینییەکان و هەروەها خێڵی پشدەرو خێڵی جاف لەکوردستانی باشور[2].

هۆی پەشیمانبونەوەی ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی بەڵێنیان بەسوڵتان دابوو، دەگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵبونی زۆربەی ئەو عەشیرەتانە بەکاری کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییەوە، جگە لەتێکچونی باروودۆخی دەوڵەتی عوسمانی و بڵاوبونەوەی ئاژاوە. بەڵام ئەم هۆکارانە بەس نین بۆ نەچونی کوردەکان بۆ ناو ریزی سوارەی حەمیدییە، بەڵکو لێرەدا چەند هۆکارێکی دیکە هەن، لەوانە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بەکورد کەبەدرێژایی مێژوو زوڵم و ستەمی بەرامبەر بەکار هێناوە و کوردەکان بەدەستی عوسمانییەکانەوە چەوسێنراونەتەوە. کوردەکان لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا پەندو وانەیان وەرگرت و متمانەیان بەدەوڵەتی عوسمانی و بەبەڵێنەکانی نەما، سەرباری پەرەسەندنی هۆشیاریی نەتەوەیی لەلای کورد بەهۆی بڵاوبونەوەی بیری ناسیۆنالیزم لەناو دەوڵەتی عوسمانیداو سەرهەڵدانی سەرکردایەتییەکی نوێ لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا کەهەردوو دەسەڵاتی دینی و دنیایی بەدەستەوە گرت و خۆی لەخێزانی نەهریدا بەرجەستە کرد. بنەماڵەی نەهری و بنەماڵەی بەدرخانییەکان نەچوونە ناو ریزی حەمیدییەوە لەم سەروبەندەشدا رۆژنامەی((کوردستان))کە لەنێوان ساڵانی ١٨٩٨-١٩٠٢ دەردەچوو، رەخنەی لەسوارەی حەمیدییە گرت و بەدامەزراوەیەکی خراپ ناوزەدی کرد[3].

گرنگترین ئەو هۆکارانەی بوونە مایەی پێکهێنانی سوارەی حەمیدییە بریتین لە:

---

[1] احمد، کمال مظهر، کردستان، ص٩٠-٩١.

[2] لازاریف، کێشە، ل٩٢/ جليلي واخرون، الحركة الكردية، ص٤٤.

[3] رۆژنامەی کوردستان، ژمارە٢٨، ١ی جەمادیی ئاخری ١٣١٩((١٩٠١))/جليلي، نهضة الاكراد، ص٥٤.

هەوڵی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سود وەرگرتن لەکورد بەرامبەر بەهێزەکانی روسیا لەناوچە سنوورییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا[1] و بەکارهێنانیان وەك هێزێك بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی کوردو بەشداریکردن لەلێدانی نەتەوەکانیتر کەداوای مافەکانی خۆیان دەکرد[2] هەروەها بۆ ملکەچ کردنی سەرۆك عەشیرەتە کوردەکان بۆ حکومەتی ناوەندیو بۆ ئەوەی رێگەی ئەوەیان لێبگرێت داوای مافە نەتەوەییو نیشتمانییەکانیان بکەن، دیسان بۆ ئەوەی پشتیوانی ئەوان بۆ سولتان دەستەبەر بکەن[3].

کۆنسولگە ئینگلیزییەکانی دەوڵەتی عوسمانی باوەڕیان وابوو کەهۆکاری دامەزراندنی سوارەی حەمیدییە بریتیە لەدروست کردنی تەفریقە لەنێوان کورداندا تا بەئاسانی کۆنترۆڵیان بکەن[4]. ئەمانە لەهۆکارە هەرە گرنگەکانی پێکهێنانی سوارەی حەمیدییەن، دەوڵەتی عوسمانیش ترسێکی گەورەی لەدووبارەبونەوەی هاوپەیمانێتی نێوان کوردەکان هەبوو، وەك هاوپەیمانێتییە پیرۆزەکەی بەدرخانی گەورە لەچلەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، هەروەها ((کۆمەڵەی کورد)) کەشێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لەهەشتاکانی هەمان سەدەدا دروستی کردو پتر لەدوو سەد سەرخێڵ بەشداریان تێدا کرد.

ئەم مەسەلەیە بۆ دەوڵەتی عوسمانی شتێکی سادەو ئاسان نەبوو چونکە ئەم دەوڵەتە بەردەوام لەیەکبوونی کوردان سڵی دەکردەوە، بۆیە دەسەڵاتداران بیریان لەداخستنی هەموو ئەو رێگەیانە دەکردەوە کەبەرەو یەکێتی کوردایەتی دەرزیشت، ویستیان بەدامەزراندنی سوارەی حەمیدییە کۆنترۆڵی کورد بکەنو بۆ جڵەوکردنی هەستی نەتەوەیی ئەرمەنەکانو نەتەوەکانی تریش بەکاریان بهێنن.

وەك ئاشکرایە سەرخێڵەکانی کورد لەبەرامبەر میرە کوردەکاندا دەسەڵاتیان لەدەست دا بوو و لەرۆژگاری سەرهەڵدانی سەرکردە ئایینییەکاندا هەر بێ دەسەڵات مانەوەو هیچ سەنگێکی سیاسیو سەربازییان نەبوو، ئیدی حکومەت دەیویست لەرێگەی هێنانیان بۆ ناو سوارەی حەمیدییە پلەو پایەیان بگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەم

---

[1] جليلي واخرون، الحركة الكردية، ص٤٤/علي، حامد محمود، المشكلة الكردية، ص٢٥.

[2] M.M.Van bruinessen. o.p.cit. p.٢٢٥.

بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: یحیى، عبدالفتاح علي، مجلة كاروان، العدد ٦٥، ١٩٨٨.

[3] زكي، خلاصة، ص٢٥٣/ لازاريف، كيشه، ص٨٧.

[4] M.M. V.an bruinessen. o.p.cit.p.٢٢٤.

هەنگاوەش سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا چونکە ئەو سەرخێلانە هەوڵیان دەدا باج نەدەن‌و دەستیان دەخستە نێو کاروباری فەرمانبەرە عوسمانییەکان لەناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا، ئەمەش جۆرێك نیگەرانی بۆ دەوڵەت دروست کرد[1].

ژمارەی کەتیبەکان ساڵی ١٨٩٢دا گەیشتە ٤٠ کەتیبە، لەساڵی ١٨٩٣دا ٥٦ کەتیبەو لەساڵی ١٨٩٩دا گەیشتە نزیکەی ٦٥ کەتیبە. ئەو چەکدارانە بەبێ هەستکردن بەکوردایەتی هەموو شتێکیان ئەنجام دەدا، جیاوازییان لەنێوان کوردو ئەرمەن‌و ئەوانیدیکەدا نەدەکرد، هەموو شتێکیان تالان دەکردو هەموو شتێکیان دەبردو بەشی شێریشیان دەدا بەزەکی پاشا، لەئاکامی ئەمەشدا هەر یەك لەزەکی پاشاو جەنراڵ ئەحمەد پاشا دەوڵەمەند بوون، ئەمە وای لەسەدری ئەعزەم کرد لەساڵی ١٨٩٩دا سوڵتان عەبدولحەمید ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە لەنێو ریزەکانی سوارەی حەمیدییەدا هیچ دیسپلینێك نەماوەو ئاژاوەو بەرەڵایی بڵاوبۆتەوە[2]. جێی داخە کاتێك ژمارەیەك لەتوێژەران باسی مەسەلەی پەیوەندیی ئەرمەنەکان بەدەوڵەتی عوسمانییەوە دەکەن‌و ئاماژە بەزوڵم‌و ستەمی عوسمانییەکان دەرهەق بەئەرمەنەکان دەکەن، تەرکیز دەکەنە سەر رۆڵی کورد لەکوشتنی ئەرمەنەکاندا[3]. من لەو باوەڕەدام کورد لەم مەسەلەیەدا بێتاوانن، ئەوانەی بەرا ئەرمەنەکانی خۆیان ئازار دا هەندێ لەسەرکردەکانی سوارەی حەمیدییە بوون، ئەوانەش کۆمەڵێ چەتەو رێگر بوون. ناتوانین کورد لەم مەسەلەیەدا تاوانبار بکەین، چونکە ئەوانەی فریو دران ژمارەیەکی زۆر کەم بوون‌و دەوڵەت ئەمری پێدەکردن نەك کورد. لەپاش کودەتای ساڵی ١٩٠٨ خەڵکی دیاربەکر بەپێداگرتنێکی زۆرەوە داوایان کرد سوارەی حەمیدییە هەڵبوەشێنرێتەوە، چونکە کاری سەرەکی ئەوان سەرقاڵبون بوو بەتاڵان‌و برۆ[4].

سوارەی حەمیدییە بەکرێگیراوی حکومەت بوون‌و ئەم دیاردەیەش تارادەیەك لەناو هەموو نەتەوەکاندا هەبوو بەڵام کەمینەیەکی کەم بوون، دەبوایە بەکرێگیراو فەرمانی گەورەکانی جێبەجێ بکردایە، بەڵام لێرەدا هەندێ سەرخێڵی کورد هەبوون کە لەلیوای سوارەی حەمیدییەدا بوون‌و ئازاردانی ئەرمەنەکانیان رەتدەکردەوە. بۆ نموونە، ئیبراهیم پاشای ملی کەکەسێکی نزیك بوو لەسوڵتان عەبدولحەمیدو نازناوی میری

---

[1] لازاریف، کێشە، ل٨٨.

[2] M.M. V.an bruinessen. o.p.cit.p.٢٢٤.

[3] ابوبکر. احمد عثمان، اکراد المللي، ص٢٨.

[4] لازاریف، کێشە، ل٢٣٣-٢٣٤.

میرانی لێ وەرگرتبوو و دوای ئەوەی سەردانی ئیستانبوڵی کرد نازناوی پاشایشی وەرگرت، رازی نەبوو لەئەرمەنەکان بدرێ بگرە توانی دە هەزار کەس لەئەرمەنەکان رزگار بکات. ناوبراو ئەوشی رەتکردەوە کەبچێت بۆ یەمەن لەدژی عەرەبەکان بجەنگێت[1].

روسەکان لەو باوەڕەدا بوون کەسوارەی حەمیدییە بەئامۆژگاریی ئینگلیزەکان پێك هێنراوەو هەرئەوانیش لەدژی روسەکان هانیان دەدەن، گوایە بەپێشنیاری ئینگلیزەکان تورکەکان زەکی پاشای سەرکردەی سوپای چوارەمیان هەڵبژارد تا بەرپرسیاریی رێکخستنی ئەو هێزە بگرێتە ئەستۆ[2]. لەبەر ئەوە روسەکان بەو هێزە خۆشحاڵ نەبوون بەتایبەتی کەیەکێ لەهۆیەکانی پێکهێنانی ئەو هێزە نانەوەی ئاژاوەو پشێوی بوو لەسەر سنوری روسیا- دەوڵەتی عوسمانی. روسیا پێی وابوو ئەم کارە لەسەر سنوری قەفقاس مایەی مەترسییە. لەساڵی ۱۸۹۹دا سوارەی حەمیدییە دوو ئەفسەری رووسییان کوشت، حکومەتی روسیاش داوای لەدەوڵەتی عوسمانی کرد سنورێك بۆ هەڵسوکەوتی سوارەی حەمیدییە دابنێت، سزای تاوانباران بدا، موتەسەریفی بایەزید لەسەرکار لاببا، پلەی سوپایی لەسوارەی حەمیدییە بسەنێتەوەو خێزانی هەردوو ئەفسەرە روسە کوژراوەکەش قەرەبوو بکاتەوە. لەم بوارەدا هەردوولا لەسەر ئەوە رێك کەوتن کەلیژنەیەك دابنێن تا سنورێك بۆ گیروگرفتەکان دابنێن و چارەسەریان بکەن[3].

حکومەتی روسیا توانی هەندێ لەو خێڵە کوردانە بەلای خۆیدا رابکێشێت کە لەسەر سنووری روسیا- دەوڵەتی عوسمانیدا نیشتەجێ ببوون و هانی دان نەچنە نێو ریزەکانی سوارەی حەمیدییەوە[4]. تەنانەت حەسەن ئاغا لەعەشیرەتی حەیدەرانلی نامەیەکی نارد بۆ عەبدولرەزاق بەدرخان(کەئەو کاتە لەروسەکانەوە نزیك بوو) و لەنامەکەدا دۆستایەتی خۆی بۆ روسەکان راگەیاند، دواتر عەبدولرەزاق بەدرخان لەگەڵ چیرکۆفی یاریدەدەری کۆنسوڵی روس لە(خۆی)قسەی کرد، بەڵام ئەو وەڵامی نامەکەی نەدایەوەو ئامادەیی روسیاشی بۆ یارمەتیدانی کورد پیشان نەدا[5].

لەپاش کودەتای ساڵی ۱۹۰۸، ئەو دەنگانە بەرز بوونەوە کەداوایان دەکرد سوارەی

---

[1] ابوبکر، احمد عثمان، اکراد الملي، ص۳۸/ لازاریف، کێشە، ل۱۸٦.
[2] لازاریف، کێشە، ل١٥٤.
[3] هەمان سەرچاوە، ل۱۳۷، ۱۳٦، ۱۲۷.
[4] احمد، کمال مظهر، کردستان، ص۹۲.
[5] لازاریف، کێشە ل۳٦۲.

حەمیدییە هەڵبوەشێنرێتەوە یان لانی کەم چەك بکرێن، دواتر نیتتیحادییەکان ویستیان ئەو هێزە هەڵبوەشێننەوە، بەڵام نەیانوێرا ئەم کارە ئەنجام بدەن ئەوەك رووبەرووی شەڕی چەکداری ببنەوە لەگەڵیاندا، چونکە ئەوانە سەر بەسوڵتان عەبدولحەمید بوون و بەدڵسۆزییەوە کاریان بۆ دەکرد. بەڵام توانییان ناوەکەی بگۆڕن، ناوەکەیان لەسوارەی حەمیدییەوە کردە لیوا سوکەکانی سوارە(خەفیف سواری تولایلری)[1]، هەروەها پایەی سەرکردەکانی حەمیدییەکانیان داگرت و وەك بەشێك لەسوپای دەوڵەت رێکیان خستن و ئەمانە لەجەنگی ١٩١٢-١٩١٩ بالکانەدا جەنگان[2] و دواتر عوسمانیەکان تۆپخانەیان بۆ زیاد کردن[3]، جگە لەوە لەجەنگی یەکەمی جیهانیشدا بەشدارییان کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی توانای جەنگییان کەم بوو نەیانتوانی رۆڵێکی گرنگ و کاریگەر لەو جەنگەدا ببینن.

### خوێندنگە خێڵەکییەکان( عەشیرەت مەکتەبلەری )

وەك وتمان دەوڵەتی عوسمانی بەئەنقەست سیاسەتێکی نەرمتری بەرامبەر بەکورد بەکار هێنا بۆ ئەوەی بەرەو لای خۆی رایانبکێشێ و فەرمانەکانی دەوڵەت جێبەجێ بکەن. کوردەکان هەستیان بەوە کرد کە لەرووی خوێندن و زانستەوە پاشکەوتوون، بەتایبەتی لەپاش بڵاوبوونەوەی بیری ناسیۆنالیزم لەئاکامی بڵاوبوونەوەی کتێب و تێکەڵبوونی کورد بەبێگانەو سەردانی بەردەوامی کونسوڵە ئەوروپییەکان بۆ کوردستان. حەقدە سەرخێڵی کورد لەناوچەی وان یاداشتێکیان پێشکەش بەنوێنەری سوڵتان کرد کەبەناوچەکەدا دەگەڕا بەمەبەستی ئەنجامدانی چاکسازیی ئیداری و بەناوی چل هەزار کوردەوە داوایان لەنوێنەری سوڵتان کرد رازی بێ چەند خوێندنگەیەك بەپارەی خۆیان بۆ منداڵەکانیان بکەنەوە[4]. لەسەرێکەوە حکومەتی عوسمانی هەستی بەداواکارییەکانی کورد کردو لەسەرێکی ترەوە هەر دەبوو گرنگی بەلایەنی خوێندن لەکوردستاندا بدات بەهۆی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی دەوڵەتی عوسمانییەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا حکومەت دەیویست دەسەڵاتی بەسەر خوێندندا هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت بەپێی سیاسەتی خۆی بەڕێوەی ببات. سوڵتان عەبدولحەمید لە١٨٩٠/٩/٢١ فەرمانی بۆ دروست کردنی ئەو

---

[1] زکي، خلاصة، ص٢٩/ جليلي واخرون، تاريخ الحركة الكردية، ص٧٠.

[2] M.M.Van bruinessen, p.٢٢٩.

[3] احمد، كمال مظهر، كردستان، ص١٩٤.

[4] خالفين، الصراع، ص٦.

خوێندنگایانە دەرکردو بەپێی ئەو فەرمانە داوای لەسەرخێڵە کوردو عەرەبەکان کرد منداڵەکانی‌خۆیان بۆ ئەو خوێندنگایانە هەڵبژێرن[1]. بەڵام خوێندن لەو خوێندنگانە تەنها لەساڵی ١٨٩٢دا دەستی پێ کرد. لەسەرەتادا خوێندنگەکان لەئیستانبول‌و بەغدا کرانەوەو بە((عەشیرەت مەکتەبلەری))ناسران، واتە خوێندنگەی عەشیرەتەکان[2]. کردنەوەی قوتابخانەکان رێکەوتی ئاهەنگی جەژنی لەدایکبونی پێغەمبەر بوو لە١٢ی رەبیع الاول ١٣١٠-١٨٩٢ز[3].

دەشێت هەڵبژاردنی ئەو رۆژە پیرۆزە بۆ کردنەوەی خوێندنگەکان بەمەبەست بوبێت تا ئەو رۆژە موبارەك بکەن. دەوڵەتی عوسمانی لەکردنەوەی خوێندنگەکاندا چەند ئامانجێکی هەبوو، لەوانە: زیندوکردنەوەی گیانی نەتەوەیی عوسمانی لەدەرونی رۆڵەکانی عەشیرەتە کوردو عەرەبەکاندا تا لەخزمەتی سوڵتاندا بن و ئەو قوتابیانەش لەدوای تەواوکردنی خوێندنگا پەیوەندی بەکەتیبەکانی سوارەی حەمیدییەوە بکەن‌و ئامادەییەکی زیاتریان هەبێت بۆ قبولکردنی پرەنسیپە سەرەتاییەکانی مەشقی نوێی سەربازی[4]. هەروەها بۆ ئەوەی لایەنگری سەرۆك عەشیرەتەکان بۆ سوڵتان مسۆگەر بکەن تا ئامادە بن فەرمانەکانی دەوڵەت جێبەجێ بکەن‌و گوێڕایەڵی بن، دیسان بۆ ئەوەی دۆستایەتیی هۆزەکان بەهێز بکەن[5]. یەکێکی تر لەئامانجەکانی دەوڵەتی عوسمانی تەتریککردنی خوێندکارەکان بوو لەرێگەی فێربوونی زمان‌و ئەدەبی تورکی[6]، هەروەها بۆ ئەوەی خوێندکاران شێوازەکانی مەدەنیەتی نوێ وەربگرن‌و خۆشەویستییان بۆ سوڵتان پتەوتر بێت، هەروەها بۆ زامنکردنی دڵسۆزیی خێڵەکان بۆ دەوڵەت‌و وەستان بەرووی هەر بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی سەرخێڵە کوردەکان، دیسان بۆ ئەوەی ئەو خوێندکارانە ئامادەیی ئەوەیان تیادا هەبێت لەکاتی پێویستدا لەدژی نەتەوەکەی خۆیان بوەستن[7].

بەڵام بەشی زۆری ئەو ئامانجانە نەهاتنە دی، ژمارەیەکی زۆری دەرچووی خوێندنگاکان بەگیانێکی نەتەوەیی کوردانە گۆش بون‌و باوەڕیان بەخەباتی نەتەوەیی

---

[1] Osman Ergin, Turkiye muarif. tarihi-٣ cit, istanbul, ١٩٤٤, p.١١٨٤.

[2] نیکیتین، الاکراد، ص١٧٣/مینورسکي، الاکراد، ص٢٩.

[3] سالنامە دولت علیە عثمانیة ١٣٢٦ھ، آلتمش دورد انجی سنە در سعادت، مطبعة احمد احسان، ١٣٢٦ھ- ١٩٠٨م، ص١٠.

[4] احمد، کمال مظهر، کوردستان، ص٨٦/قاسملو، الاکراد، ص١١.

[5] جریدة الزوراء، العدد١٥٣٣، جمادي الاولی ١٣١٠ھ.

[6] جلیلي، نهضة الاکراد، ص٢١.

[7] علي، حامد محمود، المشکلة الکردیة، ص٢٧.

هەبور[١].

دەوڵەت بۆ بنیاتنانی ئەو خوێندنگایانە پارەیەکی زۆری سەرف کرد کەگەیشتە هەشت ملیۆن لیرەی تورکی[٢]. خوێندنگاکەی بەغدا سەرکەوتوو نەبوو چونکە والیی بەغدا کێشەی لەنێوان خوێندکارانی کوردو عەرەبدا دروست کرد، دواتر داوای لەئیستانبول کرد خوێندنگاکە داخرێت‌و ئیدی داخرا[٣].

لەسەرەتای ساڵی ١٨٩٥ دا چەند خوێندنگەیەکی عەشایەریی دیکە لەشارەکانی وان‌و بانتۆس‌و توپرخکال‌و مۆرداك کرانەوەو ماوەی خوێندن لەو قوتابخانانەدا پێنج ساڵ بوو. لەوەجبەی یەکەمدا پەنجا خوێندکار وەرگیران[٤]. بەشی عیراق تەنها ١٢ کورسی بوو، واتە بەرێژەی چوار کورسی بۆ هەر ویلایەتێك(بەغداو موسڵ‌و بەسرە). مەرجی دەوڵەت بۆ وەرگرتنی خوێندکاران ئەوە بوو کەدەبێ تواناو ئامادەیی زەینی‌و جەستەییان تیادا بێت‌و کوڕی سەرخێڵە دیارەکان بن کەنفوزو دەسەڵاتیان هەیە. بۆ نموونە لەو قوتابخانەیەدا حەمیدی کوڕی فەرحان پاشای شەممەر وەرگیرا[٥] کەباوکی بەڵێنی بەشێخ عوبەیدوڵلا دابوو لەکاتی پەلاماردانی موسڵ هاوکاریی بکات‌و یارمەتیی بدات. دیارترین خوێندکاری ئەو خوێندنگایە عەبدولموحسین سەعدون‌و عەبدولکەریم سەعدون بوون، ئەوەی یەکەمیان لەنێوان ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٩ بوو بەناودارترین سەرەك وەزیرانی عیراق[٦].

یەکێ لەمەرجەکانی وەرگرتنی خوێندکار ئەوە بوو کەدەبێ تەمەنی لەنێوان ١٢-١٦ساڵاندا بێت، حکومەتیش مانگانە ٣٠ قورشی پێدەدا. ئەم پارەیە لەگەڵ تەواوکردنی هەر قۆناغێك‌و چوونە ناو قۆناغێکی تر زیادی دەکرد. حکومەت پارەی گوزەران‌و پۆشاکی بۆ خوێندکاران دابین دەکرد[٧]. لەکاتی پشووی ساڵانەشدا مۆڵەتی پێدەبەخشین بۆ سەردانیکردنی کەسوکاریان[٨]. یەکەم وەجبە لەساڵی ١٨٩٦ دەرچوو. لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٩٠٧دا تەنها دوو خوێندکار مانەوە کەئەوانیش لەساڵی

---

[١] جليلي، نهضة الاكراد، ص٢٢.

[٢] لازاريف، كێشە، ل٨٧/ جليلي، نهضة الاكراد، ص٢٣.

[٣] جليلي، نهضة الاكراد، ص٢٣.

[٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

[٥] جريدة الزوراء، العدد ١٥١٨، ١٣١٠هـ.

[٦] الحسني، عبدالرزاق، تاريخ الوزارات العراقية، ج١، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، ص١٥٢.

[٧] جريدة الزوراء، العدد ١٥١٦، ١٣١٠هـ.

[٨] حسن، جاسم محمد، العراق في العهد الحميدي، ص١٦٠.

۱۹۰۸دا گواسترانەوە بۆ یەکێ لەو خوێندنگایانەی سەر بەوەزارەتی مەعاریف بوون[1].

لەبەرەوتی گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا دەردەکەوێت کەدەوڵەت بایەخی بەخوێندنگە خێڵەکییەکان نەداوە مەگەر لەساڵانی یەکەمی کردنەوەیان نەبێت. یەکێ لەرۆژنامەکانی ئەوکاتە بڵاوی کردۆتەوە کەخوێندنگایەکی شەوان دامەزراوەو بەمەکتەبی تایبەتی خێڵ ناو براوە[2]، بەڵام ئێمە هیچ زانیارییەکمان دەست نەکەوت دەربارەی ئەم خوێندنگایەو چۆنێتی وەرگرتن‌و ژمارەی خوێندکارانی.

ڕۆژنامەی کوردستان(۱۸۹۸-۱۹۰۲) سەرخێڵە کوردەکانی هان دەدا منداڵەکانی خۆیان بۆ ئەو قوتابخانانە بنێرن تا لەدواییدا پاش گەڕانەوەیان بۆ ناوچەکانی خۆیان پۆستی بەرز لەدەوڵەتدا وەربگرن‌و خزمەتی نەتەوەکەی خۆیان بکەن[3].

سەبارەت بەپرۆگرامی خوێندن لەو خوێندنگەیانەدا، لەساڵی یەکەمدا ئەم بابەتانەی لەخۆ گرتبوو[4]:

۱-خوێندکاران فێری پیتی ئەبجەدی دەکران(واتە ئەلف‌و بێی تورکی)و لەسەر ئەوە ڕادەهێنران. ئیدی لەدوای فێربوونی ئەو پیتانە، ئینجا وانەی دیکەیان فێر دەکردن.

۲-خوێندکاران فێری چەند بەشێك لەقورئانی پیرۆز دەکران‌و سەرەتا، جزو عەمەیان پێدەوتنەوە.

۳-فێرکردنی خوێندنەوەی تورکی‌و ڕاهێنان لەسەر نووسینی ڕستەی کورت‌و پوخت.

٤-فێرکردنی ماتماتیك.

٥-فێرکردنی خۆشنووسی.

## بەشداریی کورد لەدامەزراندنی کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقیدا

بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی هەر لەپەنجاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە بەتایبەتی پاش جەنگی ۱۸۵۳-۱۸۵٦ی کریما بەرەو پشێوی‌و ئاژاوەی ناوخۆیی دەڕۆیشت ئەویش لەبەر چەندین هۆ، لەوانە: هۆی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی، چونکە هەڵگیرسانی دوو جەنگ لەماوەی چارەکە سەدەیەکدا بووە مایەی زیانی ئابووری‌و مرۆیی، خەزێنەی دەوڵەت بەتەواوی خاڵی بوو و ئەمەش وای کرد دەوڵەت بەزۆر باج

---

[1] Tark, Tarih Dergisi, cilt ۱۱, Sayi ٩٢, ۱۹۷۷, Asiret Mekebi, p. ۷۸.

[2] جریدة الزوراء، العدد ۱٥۲۳، جمادي الاولى ۱۳۱۰هـ

[3] ڕۆژنامەی((کوردستان))ژمارە ۱، ۱۸۹۸.

[4] سالنامە، نظارت معارف، استانبول، ۱۳۱٦هـ، ص۲۲۰.

بسەپێنێت. ئەم حاڵەتە گەیشتە ئاستێك کە بۆ ساڵی داهاتووش باج وەردەگیرا، جگە لەوەی کەدەوڵەت لەدەزگا جیهانییە دەرەکییەکان قەرزی وەردەگرت، ئەمەش بەهۆی رابواردنی بێئەندازەی سوڵتانەکان، بەتایبەتی سوڵتان عەبدولعەزیزو دەرکەوتنی بیرۆکەی ناسیۆنالیزم لەناو نەتەوە غەیرە تورکەکانو هەستی کۆمەڵێك لەتورکەکان بەدواکەوتویی وڵاتەکەیان، بەتایبەتی بەهۆی تێکەڵ بونیان لەگەڵ بیانییەکاندا، بەتایبەتی لەگەڵ ئەڵمانەکاندا لەرێگەی رارێژکارە بیانییەکانەوە. خوێندنی هێندێ لەئەفسەرە تورکەکان لەئەڵمانیاو رۆیشتنی هەندێ لەلاوەکان بۆ خوێندنگاکانی خۆرئاواو ناسینی دامەزراوە نەتەوەییو دیموکراتیەکانیان، مایەی جوڵانو بزوتن بوو. ئەم بارودۆخە نائارامو ناسەقامگیرە وای لەگەلانی عوسمانی کرد هەست بەپێویستبوونی گۆڕانکاری بکەن. ئیدی لاوەکان دەستیان بەجموجۆڵ کرد، بەتایبەتی ئەو خوێندکارانەی لەخوێندنگەی پزیشکیی سەربازی بوون، سەرباری رۆشنگەرە مەدەنییەکان کە لەرێگەی پەیوەندیی راستەوخۆوە یان لەرێگەی ئەو رۆژنامانەی بەنهێنی دەهێنرانە ناو دەوڵەتی عوسمانییەوە، هەستیان بەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان پێشکەوتنی خورئاواو دواکەوتنی ژیانی عوسمانی دەکرد. ئەمەش بووە مایەی سەرهەڵدانی کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقی کە لەسەرەتادا کۆمەڵەیەکی نهێنی بوو و ئەندامەکانی باوەڕیان وابوو کەریفۆرم بەپلەی یەکەم بە لەناوبردنی حوکمی ستەمکاری سوڵتان عەبدولحەمید دێتە دی کەدەبێ سیستەمێك شوێنی ئەو حوکمە ستەمکارییە بگرێتەوە لەسەر یەکپارچەیی سەرجەم رەگەزەکانی عوسمانی بەچاوپۆشین لەجیاوازیی نەتەوەکانو کارکردن بۆ سەرخستنی کۆمەڵ بۆ گەیشتن بەو پێشکەوتنەی کە لە خۆرئاوادا هەیە.

کورد لەدامەزراندنی ئەو رێکخراوە نهێنییەدا رۆڵێکی گرنگی بینی[1] کەخوێندکارێکی ئەلبانی لەساڵی ١٨٨٩دا دایمەزراند. ئەو خوێندکارە ئەلبانییە کەناوی ئیبراهیم تیمۆیە بیرۆکەی دامەزراندنی رێکخراوەکەی لەلای سێ هاوڕێی دڵسۆزی خۆی لەکۆلیجی پزیشکی سەربازی باسکرد. تیمۆ لەساڵی ١٨٨٨و لەکاتی سەردانیکردنی کەسوکاری لەئەلبانیا، ئەو بیرۆکەیەی بۆ هات. لەرێگەی گەڕانەوەیداو لەگەڵ دوو هاوڕێیدا سەردانیی دوو مەحفەلی ماسۆنییان کرد لەهەردوو شاری برندیزیو ناپۆلی. لەوێدا شارەزاییەکی لەبارەی رۆڵی کاربۆناری لەمێژووی ئیتالیا

[1] الموصلي، عرب واكراد، ص١٩٥.

پەیدا کرد، دواتر ئەو بیرۆکەیە لەلایەن هەر سێ هاوڕێکەیەوە قبوڵ کرا، دوو کەس لەهاوڕێکانی کورد بون، ئەوانیش: ئیسحاق سکۆتی لەدیار بەکرو عەبدوڵڵا جەودەت لەعەرەبکیر. سەرەتا ڕێکخراوەکەیان ناونا((تەرەقیو ئیتتیحاد))[1]. ئیبراهیم تیمۆ خوێندکارەکانی لەدژی ئیدارەی خوێندنگاکە هاندەدا[2]، ئەو چوار خوێندکارە ناوکی کۆمەڵەکەیان پێکهێناو هیچ یەکێك لەو چوار کەسە تورك نەبوون[3]. ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە گۆڕینی ئیدارەی عوسمانیو دوورخستنەوەی سوڵتان عەبدولحەمید بوو ئەوان کەدەیانویست ئیدارەیەکی نوێو سوڵتانێکی نوێو دادپەروەر دابنێن کەبەیەکسانی سەیری میللەتانی عوسمانی بکات[4].

بەشداریکردنی دوو کورد لەڕێکخراوێکدا کە لەچوار کەس پێکهاتبو، نیشانەی ئەوەیە کە گەنجانی کورد گەیشتبوونە ئاستێکی باشی هۆشیاری، ئەمەش رادەی هەوڵدانیان بۆ گۆڕینی بارودۆخی خراپی دەوڵەت دەردەخا.

لەساڵی ١٨٩٦دا شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری چووە ریزی کۆمەڵەکەوە[5]. ئەم کۆمەڵەیە لەسەرەتادا جگە لە لەناوبردنی حوکمی ستەمکاری سوڵتان بەرنامەیەکی کۆمەلایەتیو سیاسیی دیاریکراوی نەبوو[6]. چوار کەسەکە لەگەڵ چەند کەسێکی تر کەتازە پەیوەندییان بەڕێکخراوەکە کردبوو، بەنهێنی کۆ دەبونەوە بۆ ئەوەی کارەکەیان ئاشکرا نەبێو رووبەڕوی زیندانو نەفیکردن نەبنەوە. یەکەمین کۆبوونەوەیان لەڕێکەوتی ١٨٨٩/٥/٢١ بەست، ئەویش بەئامادەبوونی ئیبراهیم تیمۆ، عەبدوڵڵا جەودەت، ئیسحاق سکۆتیو محەمەد چەرکەسی. ئەم کۆبونەوەیە بەکۆبونەوەی چوار کەسەکە ناسراو دواتر چەندین کۆبوونەوەی تر لەچەند شوێنێکی جیاجیا گرێ درا کەگرنگترینیان ئەو کۆبونەوەیە بوو کە لەژێر دارتووەکەدا ئەنجام دراو ١٢ کەس ئامادەی ببون و تێیدا عەلی رەشید پاشایان بۆ سەرۆکی کۆمەڵەکە هەڵبژاردو عەبدوڵڵا جەودەتی کوردیش وەك سکرتێری سەرۆك. دەڵێن هەڵبژاردنی عەلی رەشید پاشا لەبەر ئەوە بووە کەپیاوێکی بەتەمەن بووەو پۆستێکی باشیشی

---

[1] رامزور، ارنست، تركيا الفتاة وثورة ١٩٠٨، ترجمة الدكتور صالح احمد العلي، بيروت، ١٩٦٠، ص٤٠.

[2] Fisher W.B. change and development in the middle east, New Work, ١٩٨١, p. ٣٢٨.

[3] Encyclopediedel Islame, Nouvelle edition t.g. liur- ٦١- ٦٢, paris, ١٩٧٣.

[4] يكن، ولي الدين، المعلوم والمجهول، ج١، القاهرة، ١٩٠٩، ص٤٧.

[5] شريف، عبدالستار، الجمعيات والمنظمات، ص١٤.

[6] سلوبي، في سبيل كردستان، ص٢٣.

هەبوە، بەڵام ئیبراهیم تیمۆ خۆی بەبەرپرسی یەکەمی کۆمەڵەکە دانا[1]. لەساڵی ١٨٩٢و لەڕێگەی سیخورەکانی سوڵتانەوە ڕێکخراوەکە ئاشکرا بوو، ئیدی هەندێ لەئەندامەکان گیران و خرانە زیندانەوەو ئەوانیدیکە هەڵهاتن. لەدواییدا سوڵتان عەبدولحەمید عەلی سائیب پاشای بەڕێوەبەری خوێندنگەکەی لەسەر کار لابردو لەشوێنی ئەودا زەکی پاشای دانا[2]. لەساڵی ١٨٩٥دا جارێکی تر هەندێ ئەندامی دیکەیان گیران لەوانە هەردوو ئەندامە کوردەکە ئیسحاق سکوتی و عەبدوڵلا جەودەت[3].

ئەم دوو ئەندامە کوردە رۆڵێکی گرنگیان لەمێژوی کۆمەڵەکەو لەبەرپەرچدانەوەی زوڵم و زۆرداریی ئیدارەی عوسمانی دابینی. پاش ئەوەی هەردوکیان ئاشکرا بوون، حکومەت ئیسحاق سکوتی نەفی کرد بۆ دوورگەی رۆدس، عەبدوڵلا جەودەتیشی بۆ تەرابلوس لەلیبیا دوور خستەوە. بەڵام لەساڵی ١٨٩٧دا هەردوکیان توانییان هەڵبێن و بگەنە پاریس. عەبدوڵلا جەودەت لەوێ دەستی بەوتارنوسین کرد لەرۆژنامەی((مەشورەت))کەئەحمەد پاشا لەساڵی ١٨٩٥ـەوە لەپاریس دەری دەکرد، بەڵام دواتر ناکۆکییەکی فیکری کەوتە نێوانیانەوەو بووە مایەی وازهێنانی جەودەت لەنوسین بۆ ئەو رۆژنامەیەو لەساڵی ١٨٩٧دا ناوبراو چووە جنێڤ[4]. لەمانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٨٩٧دا عەبدوڵلا جەودەت لەگەڵ ئیسحاق سکوتی هاوڕێیدا رۆژنامەی((عوسمانلی))ی دەرکرد کەدوو هەفتە جارێك بەزمانی تورکی و ئینگلیزی دەردەچوو[5].

ئەگەرچی چەندین رۆژنامەو گۆڤاری دیکە هەبوون دژی حکومەتی عوسمانی بوون، بەڵام دەسەڵاتدارانی عوسمانی بێزاریی خۆیان بەرامبەر رۆژنامەی((عوسمانلی))دەربڕی چونکە وتاری لەدژی سوڵتان عەبدولحەمیدو بانگەشەی بۆ گۆڕینی بڵاو دەکردەوە. سوڵتان باڵیۆزی خۆی لەپاریس مونیر بەگ ناردە بۆ لای هەردوو کوردەکە بۆ ئەوەی قەناعەتیان پێ بکات کەواز لەدەرکردنی رۆژنامەکە

---

[1] یکن، ولي الدین، المعلوم والمجهول، ص٦٩/ رامزور، ترکیا الفتاة، ص٥١.

[2] رامزور، ترکیا الفتاة، ص٥٦/ ندیم، احوال العراق، ص٤١.

[3] علي، اورخان، السلطان عبدالحمید، ص٢٧٥.

[4] Mehmed uzun , Dr. Ebdulla, Cevdet, Heri, Hej ٧, paris, ١٩٩٠, p.٣٥.

[5] G. Gvoc, Qaglar; IA francaise on turgnie, ed, isis, Istanbul, ١٩٨٥, p. ١٩٦.

جلیلي، جلیلي وآخرون، الحرکة الکردیة، ص١١٦/ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پەڕیاڵ، فەرهاد، ئیسحاق سکوتی، رۆژنامەی رێگای کوردستان، ژمارە ٢٩٧، ٢٢/٤/١٩٩٨.

بهێنن، ئەوانیش چەند مەرجێکیان بۆ دانا، لەوانە: دەرکردنی لێبوردن بۆ ئەو زیندانییە سیاسییانەی لەتەرابلوس لەژێر ئەشکەنجەو ئازاردانن، ئیدی سوڵتان مەرجەکەی قبوڵ کردو لەناکامی ئەمەشدا رۆژنامەکە لەساڵی ۱۸۹۹وەستا. دواتر سوڵتان هەردووکیانی وەك پزیشك لەباڵیۆزخانەی عوسمانی لەنەمسا و ئیتالیا دامەزراند. بەڵام رۆژنامەکە بەهەمان ناو ولەلایەن میر سەباحەدینەوە بەپاڵپشتی نهێنیی ئیسحاق سکۆتی لەشاری فۆلکستۆن لەباشووری لەندەن، جارێکیتر دەرچوویەوە، ئیسحاق سکۆتیش بەردەوام یارمەتیی رۆژنامەکەی دەداو پشتگیری دەکرد تا ئەو کاتەی لەساڵی ۱۹۰۲ لەسان ریمۆ کوچی دوایی کرد[1]. رۆژنامەی کوردستانی ئەوسا ماتەمینی بۆ گێڕا[2].

عەبدوڵلا جەودەت بەیەکێ لەگەورە رووناکبیرانی کورد دەژمێردرێ کە لەساڵی ۱۸۹۵دا کۆلیجی پزیشکی سەربازیی تەواو کردو پسپۆڕ بوو لەنۆژداریی چاو[3]. هەروەها ناوبانگی بەوە دەرکردبوو کەژمارەیەك کتێبی وەرگێڕاوە بەتایبەتی کتێبەکانی شکسپیر لەتەك ئەمانەدا نووسەرێکی سیاسی بوو و داوای لەخوێنەوارانی کورد دەکرد رابردووی خۆیان بخوێننەوەو بەهەندی وەربگرنو پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ لادێ پتەو بکەن تا پەی بەوە بەرن کەگەلی کورد دوچاری چ ستەمو زۆرداریو پاشکەوتوییەك بووەو هەوڵ بدەن منداڵەکانیان فێری خوێندەواریو هۆشیاری بکەن[4]. عەبدوڵلا جەودەت لەساڵی ۱۹۰٤دا چوو بۆ میسر و لەوێدا لەچاپخانەیەكو دەزگایەکی بڵاوکراوەی بەناوی((ئیجتیهاد))دامەزراندو گۆڤارێکیشی بەهەمان ناو دەرکرد[5]، لەپاش کودەتای عوسمانی ساڵی ۱۹۰۸ گەڕایەوە بۆ ئیستانبول لەوێ بەردەوام بوو لەسەر داواکردنی مافەکانی گەلی کورد، ئیتر حکومەت لەم سۆنگەیەوە جەودەتی لەسەر کار لابردو لەساڵی ۱۹۲۲ گرتی. پاشان لەساڵی ۱۹۲۵ حکومەتی تورك عەبدوڵلا جەودەتی بەوە تاوانبار کرد کەداوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دەکات. ناوبراو لەساڵی ۱۹۳۲دا کۆچی دوایی کرد[6].

---

[1] یکن، للعلوم و المجهول، ص٦٩/ رامزور، ارنست، ترکیا الفتاة، ص ۸۲-۸۳. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: احمد. کمال. کردستان، ص١١٦-۱۱۷.

[2] رۆژنامەی((کوردستان))ژمارە۳۰، ۱۹۰۲.

[3] زکي، مشاهیر، ج۲، هامش ص٤٦.

[4] جلیلي، نهضة الاکراد، ص۱۱۲-۱۱۳.

[5] قادر، جبار، للفکر الکردي عبدالله جودت، ترجمة عبدالفتاح علي یحیی، مجلة کاروان، العدد ٤٦، ۱۹۸٦، ص۱۵۰.

[6] هەمان سەرچاوە، ل۱۵۱-۱۵۲.

ساڵی ۱۹۰۲ یەکەمین کۆنگرەی کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقی لەپاریس گرێ درا ئەویش لەپاش گەشتێك کەمیر سەباحەددین و لوتفوڵلا ئەنجامیان دا و تێیدا داوایان لەبەرهەڵستکارەکان کردبوو کۆنگرەیەك ببەستن. ئیتر لەپاریس ٤٧ نوێنەر کۆبوونەوە کەنوێنەرایەتیی نەتەوە جیاجیاکانی عوسمانییان دەکرد[1]. نوێنەرانی کورد لەو کۆنگرەیەدا عەبدولرەحمان بەدرخان و حیکمەت بابان بون[2]. ئەندامانی کۆنگرە بەکۆی دەنگ میر سەباحەددینیان بە سەرۆکی کۆمەڵەکە هەڵبژارد، میر سەباحەددین جەختی لەسەر ئەوە کرد کەئامانجی ئۆپۆزیسیۆن بریتییە لەدامەزراندنی حکومەتێکی دادپەروەر کەتێیدا سەرجەمی بەرزکرایەوە[3]. دیارە لەمەدا کاریگەریی گیانی شۆڕشی ساڵی ۱۷۸۹ی فەرەنسایان لەسەر بوو.

کۆنگرەی دووەمیش لەساڵی ۱۹۰۷ لەپاریس بەسترا و لەوێدا عەبدولرەحمان بەدرخان نوێنەری کورد بوو[4] و تێیدا بڕیاریاندا کار بۆ ڕوخاندنی حکومەتی ناوەندی بکەن[5] بەڵام لەناوخۆدا، کۆمەڵەکە شاری سالۆنیکی وەك سەنتەری چالاکییەکانی خۆی هەڵبژارد چونکە ئەم شارە ژمارەیەکی زۆر ئۆپۆزیسیۆنی لەخۆ گرتبوو و لەلایەن دەوڵەتە گەورەکانیشەوە پارێزگاری دەکرا، جگە لەوەی کەئەم شارە پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ خۆرئاوادا هەبوو[6].

### سەرەتای سەرهەڵدانی بزوتنەوەی نوێی ڕۆشنبیریی کوردی

بزوتنەوەی ڕۆشنبیری لەکوردستاندا پەیوەست بوو بەمزگەوتەکانەوە، لەوێ چەندین خوێندنگەی ئایینی لەشارو گوندەکانی کوردستاندا بڵاو بونەوە کەخوێندکارانی کورد تیایدا دەیانخوێند، زمانی فێربونیش عەرەبی بوو، لەتەك عەرەبیشدا زمانی فارسی دەخوێنرا. بابەتەکانی ئەو خوێندنگە ئایینییانە جیاواز بوون لەزانستە نوێیەکان،

---

[1] د. وليد حمدي، الكرد في الوثائق البريطانية، لندن، ۱۹۹۱، ص۲۰-۲۱.

[2] شريف، عبدالستار طاهر، الجمعيات، ص۱۲.

[3] الجبوري، انور، دور المثقفين في ثورة العشرين، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب بجامعة بغداد، ۱۹۸۹، ص١٤.

[4] جليلي، نهضة الاكراد، ص٥٨-٦٠.

[5] محمد قاسم وحسين حسين، تاريخ القرن التاسع عشر، ص۱۹۲.

[6] ستيورت، دزموند، تاريخ الشرق الاوسط، ص۱۸۳-١٨٤/ بۆ شارەزابونی پتر، بڕوانە: الربيعي، صادق علي، الاستيطان الصهيوني في فلسطين ابان حكم الدولة العثمانية ۱۸۲۲-۱۹۱۷، معهد البحوث والدراسات، رسالة ماجستير غير منشورة، ۱۹۷۸، ص ۱٥۹/ هـ. س. ارمسترونج، مصطفى كمال الذئب الاغبر، دار الهلال، القاهرة، ۱۹٥۲، ص۲۹.

ئامانجی خوێندکارەکان دەرچواندنی زانای ئایینی‌و ئیمامی مزگەوتەکان بوو.

ساڵی ۱۸۹۲ بۆ کورد ساڵێکی گرنگە، چونکە لەو ساڵەدا یەکەمین کتێب لەبارەی زمانی کوردی‌یەوە لەلایەن یوسف زیائوددین پاشاوە چاپ کرا. یوسف پاشا بەرەچەڵەك فەلەستینییەو لەنێوان کورداندا ژیابوو بەتایبەتی کاتێك لەشاری موتکی ناوچەی بدلیس بەرپرسی ئیداری بوو. لەوێ فێری زمانی کوردی بوو و شارەزاییەکی باشیشی لەهەردوو زمانی فارسی‌و تورکی هەبوو[1]. یوسف زیائوددین پاشا کتێبەکەی بەناوی((الهدية الحميدية في اللغة الكردية)) چاپ کرد کە ۲۵۰ لاپەڕە زیاتر بوو. ئەمە یەکەمین کتێبە کە لەبارەی زمانی کوردی‌یەوە چاپ‌و بڵاوکرابێتەوە. لەوێدا نموونەی چەندین شیعری کوردیی هێناوەتەوە، کتێبەکەیشی ناوناوە((الهدية الحميدية))بۆ ئەوەی قەدەغە نەکرێ‌و رێگەی چاپکردنی لێ نەگیرێ. پێشەکیی کتێبەکەیشی تەرخان کردبوو بۆ ستایشکردنی سوڵتان عەبدولحەمید. دانەر لەکتێبەکەیدا جەخت لەسەر بایەخ‌و گرنگیی لێکۆڵینەوە لەزمانی کوردی دەکات چونکە ئەمە دەبێتە مایەی ناسینی گەلی کورد[2].

بەر لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم رۆشنبیریی کوردی هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە ناو وەك پێشتر وتمان هەردوو رۆشنبیری کورد ئیسحاق سکوتی‌و عەبدوللا جەودەت رۆژنامەی((عوسمانلی))یان لەجنێڤ دەرکرد. ئەگەرچی ئەو رۆژنامەیە بەزمانی کوردی دەرنەچوو بەڵام دەرکردنی ئەم رۆژنامەیە لەمەنفاوە لەلایەن دوو کوردەوە نیشانەی ئەوە بوو کەلاوانی کورد سوورن لەسەر گۆڕینی بارودۆخی گشتیی دەوڵەتی عوسمانی‌و کوردیش بەشێکە لەم بارودۆخە. دواتر ئەم بزوتنەوە رۆشنبیرییە گەشەی کردو گەیشتەوە ئەوەی لەساڵانی ۱۸۹۸-۱۹۰۲ رۆژنامەی((کوردستان))بەزمانی کوردی دەرچێ.

### رۆژنامەی کوردستان ۱۸۹۸-۱۹۰۲

رۆژنامەگەری لەدەوڵەتی عوسمانیدا موڵکی تاکەکەس نەبوو بەڵکو موڵکی دەوڵەت بوو، وەك رۆژنامەی((الزوراء)) کەمەدحەت پاشا لەبەغدا بەهەردوو زمانی عەرەبی‌و تورکی دەریدەکرد، رۆژنامەکانی تریش بەزمانی تورکی دەردەچوون، هەروەها هەندێ لە((ساڵنامە عوسمانییەکان) کەتایبەت بوون بەهەر ویلایەتێك.

دوای روخاندنی میرنشینە کوردییەکان‌و خامۆشکردنی شۆڕشەکان چەند

[1] الخالدي، ضياء الدين باشا، الهدية الحميدية في اللغة الكردية، تحقيق وتقديم محمد شكري، بيروت، ۱۹۷٤، ص۲۸.

[2] جليلي، نهضة الاكراد، ص۲٥.

دەستپێشخەرییەك لەلایەن گەنجە عوسمانییەكانەوە سەریان هەڵداو چەند هەوڵێكیش لەلایەن رۆشنبیرە كوردەكانەوە دەركەوتن، چ ئەوانەی لەتاراوگە بوون و چ ئەوانەی لەدەستی زۆرداریی سوڵتان و داروودەستەكەی هەڵاتبوون، ئەمانە بەشدارییان لەدەركردنی رۆژنامە لەدەرەوەی وڵاتدا كرد، بەتایبەتی لەسویسرەو میسرو ئینگلتەرەو فەرەنسا. كوردەكان تەنها لەرۆژنامەكانی خۆیاندا چالاك نەبوون بەڵكو لەو رۆژنامە توركییانەشدا بەشدارو چالاك بوون كەدژی دەوڵەتی عوسمانی و سوڵتان بوون. ئەو رۆژنامانە بەزۆری دەگەیشتنە دەستی رۆشنبیران بەڵام بەدەگمەن دەگەیشتنە دەستی جەماوەر بەهۆی ئەو سانسۆرە توندەی لەسەر رۆژنامەكان دانرا بوو. بێگومان لەنێو ئەو رۆژنامە قەدەغەكراوانەدا رۆژنامەی((كوردستان))یش قەدەغە بوو كەیەكەمین رۆژنامەی كوردی بوو بنەماڵەی بەدرخان لەمیسر لەساڵی ١٨٩٨دا دەریان دەكرد. دەركردنی رۆژنامەی كوردستان لە ١٨٩٨/٤/٢٢ لەلایەن یەكێ لەكوڕەكانی بەدرخان لەمیسر بەزمانی كوردی، دەسپێشخەرییەكی گرنگ بوو. ئەو رۆژنامەیە پشتی بەیارمەتیی لاوانی خوێندەواری كورد بەستبوو.

لەو كاتەدا میسر پەناگەی هەموو ئەو ئازادیخوازانە بوو كە لەسوڵتانی عوسمانی بێزار ببوون و دەیانویست حوكمێك دابمەزرێنن كەمیللەت لایەنگیری بكات. وەكو زانراویشە بزوتنەوەی ریفۆرمی ئیسلامی كەجەمالوددین ئەفغانی و محمد عەبدە رابەرایەتییان دەكرد، كاریگەریی خۆی هەبوو[1].

سەبارەت بەرۆژنامەی كوردستان، پێنج ژمارەی لەمیسر دەرچووە[2]. لەژمارە شەشەوە تا ژمارە نۆزدە لەجنێڤ دەرچووەو ئەم ژمارانە عەبدولرەحمان بەدرخان دەریكردن لەبەر ئەوەی میقدادی برای نەخۆش بوو[3]. رۆژنامەكە جارێكی تر لەژمارە بیستەوە تا ژمارە بیست و سێ لەمیسر چاپ كرا، پاشان گواسترایەوە بۆ لەندەن بۆ چاپكردنی ژمارە بیست و چوار، لەژمارە بیست و پێنجەوە تا ژمارە بیست و نۆ لەشاری فۆلكستنی خوارووی لەندەن دەرچووە، دوو ژمارەی كۆتاییش(واتە ژمارە ٣٠و ٣١) لەجنێڤ دەرچوون.

پێنج ژمارەی یەكەمی رۆژنامەكە هانی خوێنەرانی كورد دەدات مناڵەكانیان

---

[1] لازي، الاكراد في تركيا، ص ٦٩/ الطالباني، كردستان، ص٩٠.

[2] جليلي، نهضة الاكراد، ص٣٢.

[3] بلەج، القضية، ص ٦٣/ احمد، احمد عبدالباقي، الدور السياسي للقوميات في تركيا- الاكراد، رسالة ماجستير غير منشورة، معهد الدراسات القومية، الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٩، ص٩٠.

فێری خوێندەواری بکەن و چەندین ئایەتی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەری هێناوەتەوە کەهانی فێربوون و خوێندەواری دەدەن، جگە لەوەی تێیدا داوا لەسوڵتان عەبدولحەمید کراوە زوڵم لەهاوولاتییان نەکات و بایەخ بەکورد بدات و دژایەتیی رۆژنامەی ((کوردستان)) نەکات. هەروەها رۆژنامەکە لەو پێنج ژمارەیەدا باسی خوێندنگە خێڵەکییەکانی کردووەو داوای لەسەرخێڵە کوردەکان کردووە منداڵەکانی خۆیان بۆ ئەو خوێندنگایانە بنێرن چونکە لەوێ دەرفەتێك دەدۆزنەوە تا زانیارییان زیاد ببێت و هوشیاریی نەتەوەییان پەرە پێبدرێت و دەشێت ئەمانە لەئایندەدا ببن بەپێشڕەوی گەلەکەی خۆیان. هەروەها رۆژنامەکە هەڵوێستێکی دژ بەسوارەی حەمیدییە هەبوو چونکە دەیزانی ئەم هێزە بۆ چەند ئامانجێك بەکار دەهێنرێ کەخزمەتی کێشەی کورد ناکات. هەروەها رۆژنامەکە بەکورتی دەربارەی مێژووی جیهان بابەتی بڵاو دەکردەوە.

پاشان عەبدولرەحمان بەدرخان لەجیاتی میقدادی برای دەرکردنی رۆژنامەکەی گرتە ئەستۆ چونکە میقداد بەدرخان لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە حوکمی زیندانیی هەتا هەتایی بەسەردا سەپێنراو دەست بەسەر موڵك و سامانەکەیدا گیرا. بێگومان خۆیشی لەدەرەوە بوو، واتە حوکمی غیابیی بەسەردا درا. ئەو رۆژنامە تورکیانەی سەر بەدەسەڵات بوون، پشتگیریی بڕیاری حوکمەکەیان کرد[1]. عەبدولرەحمان بەدرخان لەرۆژنامەی کوردستاندا داوای یەکگرتنی ئۆپۆزیسیۆنی کرد بۆ دامەزراندنی حکومەتێك لەتاراوگەدا باوەڕی بەفیدرالیزم هەبێت[2] و کار بۆ روخاندنی سوڵتان بکات، هەروەها رۆژنامەکە لەساڵی ١٩٠٢دا ماتەمینی لەسەر ئیسحاق سکۆتی بڵاوکردەوەو بانگەشەی بۆ برایەتیی نێوان نەتەوە جیاجیاکان کرد، بەتایبەتی برایەتیی نێوان کورد و ئەرمەن. عەبدولرەحمان بەدرخانیش دژی ئەو تراژیدیاو مەرگساتە بوو کەبەسەر ئەرمەنەکاندا هات[3]. هەروەها رۆژنامەکە ستایشی هەڵوێستی جوانی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی کرد کەبەتوندی شەڕی لەدژی ئەرمەن رەت کردبۆوە.

رۆژنامەی ((کوردستان)) بەرێگەی شێوازی جیا جیا دەگەیشتە کوردستان، بۆ نمونە بەنهێنی، یان لەرێگەی هەندێ رێکخراوی نهێنی وەکو کۆمەڵەی ئیتتیحادو

---

[1] جلیلی، نهضة الاکراد، ص٣٨.

[2] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

[3] ئەحمەد، کمال مەزهەر، تێگەیشتنی راستی و شوێنی لەرۆژنامەنوسیی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨، ل٦٥.

ئەرەقییەوە،یان لەرێگەی ڕێکخراوە نهێنییە ئەرمەنەکانەوە، یان بەهۆی بازرگانیی کەشتییەوە، بەتایبەتی کەشتییە ڕووسییەکان، یان لەرێگەی وڵاتی شامەوە هەندێ جاریش لەرێگەی پەیوەندیی شەخسییەوە. بەگشتی، سانسۆر لەپایتەختدا توند بوو، بۆیە زەحمەت بوو ڕۆژنامەکە لە لەئیستانبول دابەش بکرێت.

دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەدەرەوەش بەدوای ئۆپۆزیسیۆنەوە بوون. بۆ نمونە لەتاراوگەدا هەر بەدوای کەسانی وەکو میقداد بەدرخان‌و عەبدولرەحمان بەدرخانی برایەوە بوون‌و داوایان دەکرد لەئیستانبول وەکو دوو تاوانبار دادگایی بکرێن، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ڕۆژنامەکە لەناوچەی جیاجیاو بەپچڕ پچڕی دەربچێ[1]، سەرباری گرفتی دارایی کەبووە هۆی ئەوەی ڕۆژنامەکە لەساڵی ١٩٠٢دا رابگیرێ.

**کوردستانی عوسمانی لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا**

لەگەڵ پتربوونی کێبەرکێی کۆلۆنیالیستی‌و ململانێی نێودەوڵەتیدا، گرنگیی کوردستانیش زیادی کرد و کوردستان بوو بەشوێنی چاوتێبڕینی دەوڵەتە گەورەکان، بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەو دەوڵەتانە درکیان بەوە کرد کەخەریکە جەنگێکی جیهانی ڕوو دەداو ئەڵمانیاش بەهێزێکەوە کێبەرکێی دەوڵەتە گەورەکان دەکاو هەوڵی دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی دەدا لەدەوڵەتی عوسمانیدا. لێرەدا ڕووسیا بایەخی بەکورد دا بۆ پاراستنی سنورەکانی خۆی. ئەمەش لەو کاتەدا ڕونتر دەرکەوت کەشێخ حامیدی کوڕەزای شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری سەردانی یاریدەدەری کونسوڵی ڕوسیای کرد لەشاری وان‌و ئەمەش بووە مایەی بێزاربوونی دەوڵەتی عوسمانی. دوای ئەوە یاریدەدەری کونسوڵی ئەڵمان لەموسڵ پەیوەندیی بەشێخ حامیدەوە کردو ئامۆژگاریی کرد کە لەڕووسەکان نزیک نەبێتەوە[2]. حکومەتی بریتانیاش هەوڵی دا لەرێگەی نوێنەرانی بەرژەوەندییەکانییەوە(بۆ نموونە کەسانی وەکو مارك سایکس) لەسەران‌و سەرخێڵەکانی کورد نزیك بێتەوە بەمەبەستی دۆستایەتی کردنیان‌و پوچەڵ کردنەوەی نفوزی ڕوس‌و ئەڵمان لەئاسیا، فەرەنساش بەرژەوەندییەکی زۆری لەدەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو، بەتایبەتی لەشامدا. ئەڵمانیاش دوای بڕیاری دروستکردنی هێڵی ئاسنینی بەرلین- بەغدا زیاتر بایەخی بەکورد دا. لەڕاستیدا بوونی سێ ملیۆن کورد لەو ناوچە هەستیارەدا پاڵی بەدەوڵەتە گەورەکانەوە نا بایەخێکی زیاتر بەبارودۆخی ئەو ناوچە گرنگە بدەن.

---

[1] ادموندز، کردو ترك وعرب، ص١٥.

[2] لازاریف، کێشە، ل١٦٤.

دەوڵەتی عوسمانی بەر لەکودەتای ساڵی ١٩٠٨ دوچاری دۆخێکی سیاسیی خراپ ببو. سەرەڕای ئەمە پشێوی ناوچەی دەرسیمی گرتەوە بەتایبەتی پاش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی باجی لەسەر کوردەکان زیاد کردو ویستی بەزۆر باجیان لێ بسەنێ، لەئاکامدا دەوڵەت رووبەرووی بەرگریی کوردو ئەرمەن بۆوەو ئەرمەنەکانیش یارمەتیی کوردەکانیان دا بۆ داکۆکیکردن لەناوچەکەیان[1]. لەمانگی نیسانی ساڵی ١٩٠٦دا خێڵەکانی بنجار بەسەرکردایەتیی بەشاری چەتۆ لەسنجەقی سیرت راپەڕینیان بەرپا کرد، حکومەتیش هێزێکی بەسەرکردایەتیی عیززەت پاشا ناردە سەریان بەڵام ئەم هێزە لەبەرامبەر کورد و ئەرمەنە راپەڕیوەکاندا شکستی هێنا، دواتر یارمەتییەکی زۆری سەربازیی عوسمانی بۆ ئەو هێزە شکست خواردووە نێردراو بەشاری چەتۆ ناچار بوو بەرەو چیاکان پاشەکشە بکاتو لەوێ خۆی رێک بخاتەوە. کوردەکان توانییان رووبەرووی ئەو سوپایە بووەستنەوەو عیززەت پاشا بریندار بکەن. لەمانگی ئایاری ساڵی ١٩٠٨یش راپەڕینەکە تاوی سەندو ناوچەی دیاربەکریشی گرتەوە، عەرەبەکانیش شانبەشانی کورد بەشدارییان لەراپەڕینەکەدا کرد. بەڵام دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی نەیتوانی شکست بەشۆڕشگێڕەکان بهێنێت، سیاسەتی سوتماکی لەگەڵیاندا بەکار هێناو لەئاکامدا سوپای عوسمانی دەستی کرد بەوێرانکردنو سوتاندنی گوندەکان. لەم سەروبەندەدا بەشاری چەتۆ هەوڵی دا یارمەتیی رووسو ئینگلیز دەستبەر بکات بەڵام کۆششەکانی لەو بوارەدا هیچ ئەنجامێکیان نەبوو، لەبەر ئەوە ناچار بوو خۆی بشارێتەوە[2].

ساڵی ١٩٠٦ بەڕێوەبەری پۆلیسی ئیستانبول کەناوی رەزوان پاشا بوو کوژرا. ئەم پیاوە دژایەتیی کوردەکانی پایتەختی دەکردو دەیچەوساندنەوە. بنەماڵەی بەدرخانییەکان بەکوشتنی بەڕێوەبەری پۆلیسی ئیستانبول تاوانبار کراو پەنجەی تاوان ئاراستەی عەبدولرەزاق بەدرخانو عەلی شامل کرا، هەردووکیان گیران، عەبدولرەزاق بەدرخان لەبەندیخانەوە نامەیەکی بۆ سوڵتان عەبدولحەمید ناردو ئەوەی رەت کردەوە کەئەو بەڕێوەبەری پۆلیسی کوشتوە بەڵام هیوای ئەوەی خواست کەخۆزگە بکوژی بەڕێوەبەرەکە بوایە. لەئەنجامی ئەم رووداوەدا دەوڵەتی عوسمانی ژمارەیەکی زۆری لەئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانییەکان بۆ دەرەوەی وڵات دوور خستەوە وەك ئەمین عالی بەدرخان کەحکومەت لەگەڵ چەند کەسێك لەکەسوکارەکەی بۆ ئیسپارتە دووری

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٨٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٨٠-١٨١.

خستنەوە.

گرتن و نەفیکردن ئەو بەدرخانییانەشی گرتەوە کە لەناو کۆشکی سوڵتاندا کاریان دەکرد. پاشان عەبدولڕەزاق و عەلی شامل گواسترانەوە بۆ بەندیخانەی تەرابلوس لەلیبیا[1]. ئەم ڕووداوە وای لەئۆکۆنۆری باڵیۆزی ئینگلیز لەئیستانبول کرد لە۱۹۰٦/۳/۳۱دا نامەیەك بۆ ئیدوارد گرای وەزیری دەرەوەی بریتانیا بنێرێت و ئەم نامەیە بە دۆکیۆمێنتێکی گرنگ دادەنرێت. لەنامەکەدا هاتووە[2]: ((دەمەوێ ئاگادارتان بکەمەوە کەبەڕێوەبەری پۆلیسی ئیستانبول ڕەزوان پاشا تیرۆر کرا. دەنگۆی ئەوە هەیە کەدوو کەس لەسەرکردەکانی بنەماڵەی بەدرخانییەکان: عەبدولڕەزاق بەگ و عەلی شامل پاشا هانی کوشتنی بەڕێوەبەرەکەیان دابێت. هەواڵی کوشتنەکە لەکۆشکی یلدزی سوڵتان هەراو زەنایەکی زۆری نایەوە و کۆشکی تووڕە کرد. ئیدی لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی تایبەتییان لەکۆشك پێکهێنا. ڕۆژی ۲۸ ئەم مانگە ئەو دوو کەسە لەتەك سیانزە سەرکودەی کوردی دیکەدا گیران و هەموویان خرانە کەشتییەکەوەو ڕەوانەی تاراوگە کران.. عەبدولڕەزاق بۆ مەککەو عەلی شاملیش بۆ بەنغازی، ئەوانیدیکەش بۆ جەزائیر و ئەرخەبیل. عەبدولڕەزاق و عەلی شامل ئەوەی خواڵێخۆشبوو بەدرخان بەگن کە کاتی خۆی لەساڵی ۱۸۵۰دا بۆ کاندیا(دورگەی کریت)دور خرایەوە. دوای ئەوە بەدرخان و ۹۱کەسی بنەماڵەکەی هێنرانەوە بۆ ئیستانبول. ئەم بنەماڵەیە توانی دەسەڵاتێکی زۆری بەسەر دەسەڵاتدارانەوە هەبێت، ئامانجی سوڵتانیش ئەوە بوو کەبەو ڕێگەیە دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو خێڵە کوردانەدا زاڵ بکات کە لەئاسیای بچووکدا نیشتەجێن.

بەتێپەڕبوونی کاتیش جارێکیتر سەرکردە کوردەکان بۆ پایتەخت دوور خرانەوە. بەجۆرە حزبێکی کوردیی بەهێز لەپایتەخت بەسەرکردایەتیی بەدرخانییەکان پێك هات. ژمارەیەك لەو بەدرخانییانە گەیشتنە پلەوپایەی بڵند، بۆ نموونە عەبدولڕەزاق بەگ جێگری سەرۆکی تەشریفات بوو بۆ کاروباری باڵیۆزەکان، عەلی شامل سەرکردەی ناوچەی سکوتاری بوو، بەدری ئەندامی ئەنجومەنی دەوڵەت بوو، چوار

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل۱۸۸-۱۸۹.

[2](۳۷۱) (٦١١٤) (۹۹۲۸) (۱۲۱٤۳) SOUTH Eastern Europe (confidntil) Sir N.O. Oconor to sir Edward Gray (No. ۲۱۲) ( Con st) March ۳۱, ۱۹۰٦.

وەرگیراوە لە:

ابوبکر، احمد عثمان، کردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، العدد ۲۵، السنة ۱۳، مایس ۱۹۸۳.

کەسی تریشیان لەپۆلیسی پایتەختدا بوون، هەندێکی دیکەشیان پایەی باشیان لەویلایەتەکاندا هەبوو. دەسەلاتی ئەمانە گەیشتبووە کۆشکی یلدزو پاسەوانی سولتانی..)). ئۆکۆنۆر لەگەڵ نامەکەدا برگەیەکی رۆژنامەی(ئیقدام))ی هاوپێچ کردبوو کە هەواڵی کوشتنی رەزوان پاشای تێدا بلاو کرابۆوە.

سالی ١٩٠٦ خۆپیشاندانێکی گەورە لەپایتەختو لەبەردەم فەرمانگە حکومییەکاندا ئەنجام درا کەکوردەکانی دانیشتووی پایتەختیش بەشدارییان تێدا کرد بوو و دەشێت ئەمە بەهۆی گرتنو دوورخستنەوەی بەدرخانییەکانەوە بووبێت. هەروەها لەمانگی حوزەیرانی سالی ١٩٠٧دا کوردەکانی شاری جزیرە خۆپیشاندانێکی گەورەیان رێکخستو نزیکەی پێنج هەزار کورد تێیدا بەشدارییان کرد، فەرمانگەی پۆستو تلگرافیان داگیر کردو داوایان کرد فەرمانبەرە خراپەکان دەر بکرێنو والیش لەسەر کار لابرێ[1]. لەو کاتەدا لەئیستانبولی پایتەخت ژمارەیەکی زۆری کورد هەبو، ئەویش لەبنەماڵەی بەدرخانییەکانو بنەماڵەی نەهرییەکانو دوورخراوە بابانییەکانو ئەو خوێندکارە کوردانەی لەپایتەخت دەیانخوێند، سەرباری ژمارەیەکی زۆری کوردی کۆچبەر کە لەوێ نیشتەجێ ببون.

## کۆمەڵەو رێکخراوە کوردییەکان

وەك پێشتر وتمان کورد بەر لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم دەستی بەچالاکیی سیاسیو رۆشنبیری کرد. حکومەتی عوسمانی لەو کوردانە نزیك بۆوە کەفەرمانەکانی دەولەتیان جێبەجێ دەکردو سوارەی حەمدییەی لێ پێك هێنانو دواتر خوێندنگە خێڵەکییەکانی دامەزراند، پاشان لەپایتەختدا پایەی بلندی بەهەندێ لەئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانیەکانو بنەماڵە کوردییەکانی دیکە بەخشی بۆ ئەوەی لایەنگریی کورد بۆ دەولەت مسۆگەر بکات. سەرباری هەموو ئەمانە، ئەم سیاسەتە، نیشتمانپەروەرە کوردەکانی قایل نەکرد چونکە ئەوانە بانگەشەی پەرەسەندنی سیاسیو رۆشنبیرییان دەکردو هۆشیاری نەتەوەییان پەرەپێدەدا، واتە ئەو نیشتمانپەروەرە کوردانە بەئاراستەی کاری سیاسی هەنگاویان نابوو بۆ هێنانە ئارای ئەو دەستکەوتانەی کەسانی پێش خۆیان بەدەستیان نەهێنا بوو. لەم سۆنگەیەوە ژمارەیەك کۆمەڵەو رێکخراوی سیاسیو کۆمەلایەتیو رۆشنبیریی سەریان هەلدا[2]، لەوانە:

---

[1] جليلي، نهضة الاكراد، ص٥٨.

[2] شريف، عبدالستار، الجمعيات والمنظمات، ص١١.

### ١-كۆمەڵەی عەزم قەوی لەساڵی ١٩٠٠دا:

ئەمە بەیەکەمین کۆمەڵەی کوردی دادەنرێت کە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا سەریهەڵداوە، بەڵام زانیارییەکی کەم- ئەگەر نەڵێین دەگمەن- لەبارەی ئەم کۆمەڵەیە لەبەر دەستدایە. نازانین جۆری چالاکیو کارو بەرنامەکەی چۆن بووە، بەڵام ئەوە دەزانرێت کەبەدەستپێشخەریی فیکری ئەفەندی دیاربەکری دامەزراوە[1].

لەئەندامە چالاکەکانی ئەو کۆمەڵەیە: ئەحمەد رامز کوردی زادەو ئەحمەد خاسی زادە، ئەمەی دوایی لەساڵی ١٨٩٩دا مەولودنامەیەکی بەزمانی کوردیو بەدیالێکتی زازایی نوسیوە. ئەحمەد رامز کوردی زادە لەساڵی ١٩٠٤دا لەمیسر بووە بەڵام نازانرێ بۆ لەو کاتەدا لەوێ بووە، ئاخۆ لەبەر ئەوە بووە کەدەسەڵاتدارانی عوسمانی راوەدوویان ناوە یاخود بۆ ئەوەی لقێکی کۆمەڵەکە لەمیسر بکاتەوە. بەڵام زنار سلۆپی دەڵێ ئەحمەد رامز کوردی زادە وەکو نوێنەری کۆمەڵەکە لەمیسر بووە[2]. محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلانیش دەڵێ کۆمەڵەکە لەساڵی ١٩٠٤ لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە داخرا[3]. لەمیسر نامیلکەیەك بەناونیشانی((میر بەدرخان))لەچاپخانەی ئیجتیهاد چاپ کراوە. ئەو چاپخانەیەش روناکبیری کورد عەبدوڵلا جەودەت بەرێوەی دەبرد. لەسەر بەرگی نامیلکەکەدا نووسیویەتی: داهاتی کتێبەکە دەگەرێتەوە بۆ کۆمەڵەی عەزم قەوی کوردستان[4]. لەم سەروبەندەدا ئەحمەد رامز لەمیسر کۆمەڵێ پەیوەندیی باشی لەگەڵ کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقیدا دامەزراند. ئەوەی شوێنی سەرنجدانە ئەوەیە کەرۆژنامەی کوردستان(١٨٩٨-١٩٠٢) هیچ شتێکی لەبارەی ئەم کۆمەڵەیەو چالاکیو ئامانجەکانیەوە نەنووسیوە.

### ٢-کۆمەڵەی تەعاونو تەرەقی ١٩٠٨:

لەپاش کودەتای عوسمانی ساڵی ١٩٠٨، دەسەڵاتی نوێ مۆڵەتی بەدامەزراندنی کۆمەڵەی تەعاونو تەرقی بەخشیو ئەمە یەکەمین کۆمەڵەی سیاسیی کوردە کە بەئاشکرا ئیش بکات. دیارترین دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە بریتین لەم کەسانەی خوارەوە:

ئەمین عالی بەدرخان، شێخ عەبدولقادری نەهری، ئەحمەد زو لکەفل، جەنرال

---

[1] سلوپي. في سبيل كردستان، ص٦٢.

[2] همان سەرچاوە، ل٢٢.

[3] زنكنة، جمال، اول جمعية ثقافية كردية جمعية عزم قوي كردستان، جريدة خبات، العدد ٦٨٢/١٩٩٢.

[4] زكي، خلاصة، هامش ص٢٢١/ احمد، كمال مظهر، ميژوو، بغداد، ١٩٨٣، ل٢٥٣.

شەریف پاشاو کەسانی دی[1]. ئەم کۆمەڵەیە پەیڕەوی ناوخۆی تایبەت بەخۆی هەبوو و خۆی بەنوێنەری شەرعیی گەلی کورد دەزانی. لەپاش کودەتای ساڵی ۱۹۰۸ ژمارەیەکی زۆری لاوانی کورد گەڕانەوە بۆ ئیستانبول و پەیوەندییان بەم کۆمەڵەیەوە کرد، لەوانە: جەنەراڵ فوئاد پاشا، محەمەد شوکری، فوئاد بابان زانا، شەفیق ئوراسلی، فەتحوڵڵا ئاغا فەندی و محەمەد ئەمین بەگ سلێمان. بۆ سەرۆکایەتی کۆمەڵە شێخ عەبدولقادر هەڵبژێردراو بۆ جێگری سەرۆکیش ئەمین عالی بەدرخان[2].

هەوڵەکانی شێخ عەبدولقادر لەگەڵ نەوەی بەدرخان لەو دەمەدا هێزو قورساییەکی زۆریان بەبزوتنەوەی نەتەوایەتی و سیاسیی کورد بەخشی چونکە هەردولا ئەو ناکۆکییەیان وەلاخست کە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لەنێوان هەردوو بنەماڵەکەدا هەبوو(واتە هەردوو بنەماڵەی بەدرخان و نەهری). لەم ڕووەوە خەلیل خەیالی ڕۆڵێکی گەورەی لەو مەسەلەیەدا هەبوو[3]، ئەم کۆمەڵەیە توانی سۆزو لایەنگریی کۆمەڵەو ڕێکخراوە عەرەبی و تورکی و ئەرمەنییەکان بەدەست بهێنێت و لەزۆر بۆنەی جیاجیادا ئاهەنگ و فێستیڤاڵی گوتار ئامێزی لەپایتەختدا ساز کردو سەرنجی زۆر کەسی ڕاکێشا. ڕۆژنامەی((گوتش))ی ئەرمەنی لەژمارە(۵۳)ی مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۰۸دا نووسیویەتی:((پەیوەندیی ئێمە هەنگاو بەهەنگاو بوو بەپەیوەندییەکی باش و دڵخۆشکەر))[4].

ئەم کۆمەڵەیە چەندین لقی لەشارەکانی بتلیس و موسڵ و دیاربەکرو ئەرزەڕۆم و بەغدا کردەوە[5]. بەبۆنەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی مەبعوسانەوە، شادییەك کەوتە نێوان خەڵکییەوەو لقی موسڵی کۆمەڵە بەم بۆنەیەوە بروسکەیەکی نارد. کۆمەڵە لەو دەمەدا ڕۆژنامەیەکی بەناونیشانی((کورد تەعاون و تەرقی جەمعیەت غەزەتەسی)) دەرکرد کەهەفتانە بوو و سەرنووسەرەکەیشی شاعیری ناسراوی کوردی تۆفیق پیرەمێرد بوو لەشاری سلێمانی[6]. هەر یەك لەمەلا سەعیدی نوورسی و ئیسماعیل حەقی بابان

---

[1] بلەج، القضیة الکردیة، ص٦٣.

[2] Christian More. O.P. Cit. Pp. ٧٣. ٧٤.

[3] خەلیل خەیالی لەعەشیرەتی مودان بوو لەناحیەی موتکی. لەسەر دەستی مەلا سەعید نوورسی خوێندبوی. ساڵی ۱۹۰۰ چوە ئیستانبول بوە ژمێریاری ئامۆژگەی کشتوکاڵی پایتەخت. زمانی عەرەبی و فەرەنسی، سەرباری زمانی کوردی، دەزانی. بڕوانە: سلوبی، فی سبیل کردستان، ص٢١.

[4] جلیلي، نهضة الاکراد، ص٦٣-٦٤.

[5] هەمان سەرچاوە، ل٧٣.

[6] جلیلي، نهضة الاکراد، ص٦٦.

هاوكاریـــان دەكــرد، رۆژنامەكــە زۆر بابــەتی ئــەدەبیو زمانــەوانیو شارســتانیو پــەروەردەیی لــەخۆ گرتبــوو و بانگەشــەی بــۆ دانــانی فەرهــەنگێكی كــوردی بــۆ خوێندنگــەكانی دەكــرد. مــەلا ســەعید لەیــەكێ لەژمارەكانیــدا وتــارێكی نووســی بەناونیشانی ((كورد چیی پێویستە؟)) هەر خۆیشی وەلامی پرسیارەكەی دایەوەو گوتی كەپانزە ساڵە بیر لەم مەسەلەیە دەكاتەوەو لەدواییدا گەیشتۆتە سەرەنجامێك كەدەڵێ ئەوەی كورد پێویستیەتی بریتییە لەیەكێتیو زانست[1]، هەروەها رۆژنامەكە لەلاپەڕەكانیدا جەختی لەسەر گیانی برایەتیی نێوان گەلانی عوسمانی دەكرد. بۆ ماوەیەكی درێژ هیچ ژمارەیەكی ئەو رۆژنامەیە نەدۆزرایەوە، بەڵكو هەندێ شتی كەمی لەبارەوە زانراوە كەسەرچاوەی ئەو زانیارییەش گۆڤارێكی فەرەنسی بوو، هەروەها كتێبێكیش كەشاهبازیان لەساڵی ١٩١١دا لەئیستانبول چاپی كردووە، بەڵام لەم دواییەدا یەكەمین ژمارەی رۆژنامەكە دۆزرایەوەو رۆژنامەی كوردستانی نوێش وێنەیەكی زەنگۆگرافیی ژمارەیەكی رۆژنامەكەی لەگەڵ هەندێ زانیاریی زیاتر بڵاو كردەوە[2].

كۆمەڵەی تەعاونو تەرەقی كورد چەندین یانەی هەبوو كە لەلایەن رۆشنبیرانی كوردی پایتەختەوە دامەزرابوون، هەروەها لەشارەكانی دیكەی وەكو بتلیسو ئەرزەرۆمو موشو دیاربەكرو بەغدا. یەكەمین یانە لەپایتەختدا لەرێكەوتی ١٩٠٨/٩/٢٥كرایەوەو بەو بۆنەیەشەوە ئاهەنگێكی گەورە ساز كرا كە پێنج سەد كەس لەئەندامانو میوانان ئامادەی بوون. ئامادەبووان دڵسۆزیی خۆیان بۆ كۆمەڵەكە دەربڕیو ستایشی دەستووریان كردو دڵسۆزیی خۆیان بۆ پرنسیپەكانی كۆمەڵە راگەیاند، هەروەها بۆ پرنسیپەكانی دادپەروەریو ئازادیو یەكسانی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی. وتاربێژەكان لەئاهەنگەكەدا باسی پەیوەندیی برایانەی كوردو نەتەوەكانی دیكەیان كرد، بەتایبەتی لەگەڵ ئەرمەنەكاندا، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە كەنوێنەری نەتەوە جیاجیاكان لەئاهەنگەكەدا ئامادە بوون. یانەی پایتەخت بەردەوام سیمیناری سەبارەت بەبرایەتیی نێوان كوردو ئەرمەن ساز دەكرد بەتایبەتی لەپایتەختداو هەروەها لەو ناوچانەی كەكوردو ئەرمەنی تێدا دەژیا، رۆژنامە ئەرمەنییەكانیش ستایشی ئەو كۆڕانەی دەكرد چونكە دەبوونە هۆی لێك نزیكبوونەوەی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٦٨/ كرنس كوچیا، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤.
[2] محمد، كمال رەئوف، پەرەسێرە بیری رۆژنامەنووسان، كوردستانی نوێ، ژمارە ١٢٨٢ی رۆژی ١٩٩٦/٥/١٢.

هەردوو گەلو گرفتەکانی نێوانیانی چارەسەر دەکرد[1].

یانەی بتلیس گەورەترین یانەی کوردی بوو. ژمارەی ئەندامانی لەکاتی کردنەوەیدا گەیشتە(٦٥٠)ئەندامو ژمارەکە لەپاش ماوەیەکی کورت گەیشتە زیاتر لە٥٠ هەزار ئەندام. ئیدی ئەندامەکانی شانەی چەکداریان دروست کردو هەر شانەیەك دە کەسی لەخۆ گرتبوو کە پارێزگارییان لەشاری بتلیس دەکردو رێگەی دزیو تالانو راورووتیان نەدەدا، کەچی ژمارەی ئەندامانی یانەی ئیتتیحادو تەرەقی لەهەمان شار تەنها ٩٠ کەس بوو. بەپێی راپۆرتی جێگری کۆنسوڵی رووس ئاکیمۆفیچ کە لە٢٢/١١/١٩٠٨دا بۆ وەزارەتی دەرەوەی روسیای ناردووە، ژمارەی ئەندامانی یانە کوردییەکە گەیشتۆتە ٧٠ هەزار کەس. ئیتتیحادییەکان لەبەرامبەر زیادبوونی ژمارەی ئەندامانی یانە کوردییەکەدا هەستیان بەمەترسی کرد، بۆیە لەمانگی ئاياری ساڵی ١٩٠٩دا یانە کوردییەکەیان داخست[2]. یانە کوردییەکانی دیکە چالاکییەکی ئەوتۆیان نەبوو، یانەی موش نەبێ کەپەیوەندیی لەگەڵ سەرخێڵەکاندا دامەزراند[3]. پەیوەندیکردن بەسەرخێڵەکان لەپێناوی یەکخستنی هێزەکاندا بوو بۆ ئەوەی ئامادە بن بۆ سازدانی راپەڕین، بەڵام بەداخەوە لەنێو ئەندامانی یانەکەدا ناکۆکییەك لەسەر دەسەڵاتو بەڕێوەبردنی یانەکەدا سەری هەڵدا[4]. بەگشتی ئیتتیحادییەکان بەهۆی چالاکیی یانە کوردییەکانەوە مەترسییەکی زیاتریان لێ نیشت، بۆیە بڕیاریان دا یانەکان یەك لەدوای یەك داخەن. ئەندامانی کۆمەڵەی تەعاونو تەرەقی کورد باوەڕیان وابوو کەبریتانیا پشتگیرییان دەکا، بۆیە لەرێگەی باڵیۆزی بریتانیاوە لەئیستانبوڵ بروسکەیەکیان نارد، حکومەتی بریتانیاش وەڵامی بروسکەکەی دانەوەو دەستخۆشیی کارەکانی لێکردن[5]. هەروەها لقی موسڵی کۆمەڵەی تەعاونو تەرەقی بەبۆنەی کردنەوەی ئەنجومەنی مەبعوسانەوە بروسکەیەکی بۆ حکومەتی عوسمانی نارد[6]. بەڵام ئەم کۆمەڵەیە لەسەر کاری سیاسیو رۆشنبیری بەردەوام نەبوو و ئیتتیحادییەکان

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: جلیلي، نهضة الاكراد، ص٧١-٧٢.

[2] لازاریف، کێشە، ل٢٢٧/ پێ ڕەش، بارزان، ص٨٧.

[3] پێ رەش، بارزان، ص٨٧.

David Medowall. O.P.Cit. P. ٣٠.

[4] Shaw. O.P.Cit. p. ١٦.

[5] عبدالعزیز یاملکي، کرد اختلاللری، وەرگێڕانی شیرزاد زەنگنە، رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ١٤٠٥ی رۆژی ٢٢/٤/١٩٩٧.

[6] عبدالقادر، عصمت، دور التراب، ص١١١.

یانەکەیان پێداخستن، بەڵام لەدوای داخستن کۆمەڵەکە بەنهێنی پرۆسەی چالاکیەکانی خۆی ئەنجامدا[1].

۳-کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کوردی(کورد نشر معریفی)۱۹۰۸:

کۆمەڵەیەکی ئەدەبی و پەروەردەییەو لەدوای کودەتای عوسمانیی ساڵی ۱۹۰۸ دامەزرا[2] و سەر بەکۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد بوو[3]. خەلیل خەیالی لەدیارترین دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکەیە[4]. ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریی کوردی دەکردو توانییان خوێندنگەیەکی کوردی بۆ فێرکردنی منداڵانی کورد لەپایتەخت بکەنەوەو ناویان نا((خوێندنگەی دەستوری)). پرۆگرامی خوێندنگەکە وەکو پرۆگرامی خوێندنگە تورکییەکانی تر بوو کەسەر بەوەزارەتی مەعاریف بوون لەسەردەمی ئیسماعیل حەقی بابانی وەزیردا، ئیدارەی خوێندنگەکەش بەعەبدولرەحمان بەدرخان سپێردرا. لەو خوێندنگەیە ۳۰ خوێندکار دەیانخوێندو پاش ماوەیەك ژمارەکە زیادی کرد. لەراستیدا ئەم خوێندنگەیە بەیارمەتیی کوردە دەوڵەمەندەکانی ئیستانبول دامەزرا[5]. ئەمە بەیەکەمین خوێندنگە دادەنرێ کەبەتەواوی کوردی بوو. هەر یەك لەئەحمەد کوردی زادەو سەعید نورسی وانەیان تێدا دەوتەوەو لەو ماوەیەدا کتێبی رێزمانی زمانی کوردییان چاپ کرد[6]. وانەی نیشتمانی و نەتەوەیی و پەروەردەییان تێدا وتەوە. کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کوردی پێڕەوێکی ناوخۆی هەبوو کە چەندین بەندی لەخۆ گرتبوو. هەروەها دەستەیەکی ئیداری و سەرۆکێکی فەخری هەبوو. هەموو نامەکانیشیان مۆرێکی رەسمیی لێدەدراو سەرۆکی دەستەی ئیداری ئیمزای دەکرد. داهاتی کۆمەڵە لەیارمەتی و ئابوونەی ئەندامان پێکهاتبوو، هەر کەسێکیش بۆ ماوەی سێ مانگ ئابوونەی نەدایە، دەردەکرا دوای ئەوەی ئیتتیحادییەکان درکیان بەکاریگەریی ئەم خوێندنگەیە لەسەر منداڵانی کوردو بڵاوکردنەوەی گیانی نەتەوەیی کرد، گرفتیان بۆ دروست کردو مامۆستاکانیان بێزار کردو دواجاریش فەرمانی داخستنیان دەرکرد.

---

[1] بلەج، القضیة الکردیة، ص٦٣.

[2] عصمان سەرچاوە، ل٦٣.

[3] جلیلي، نهضة الاکراد، ص٧٨/ شریف، عبدالستار، الجمعیات والمنظمات، ص٣٥/ قادر، جەبار، رۆژنامەی کورد، گۆڤاری کاروان، ژمارە٣٢، ١٩٨٥، ل١١.

[4] سلوپي، في سبیل کردستان، ص٢٠.

[5] جلیلي، نهضة الاکراد، ص٧٩-٨٠.

[6] Farhad pirbal Qmer: O.P. Cit. P.٢١.

### ٤-کۆمەڵەی هیڤی(١٩١٢)

کۆمەڵەیەکی سیاسیو رۆشنبیری بوو کە کۆمەڵێ خوێندکاری کورد لەپەیمانگەی((خەلق نالی))ی کشتوکاڵی لەساڵی ١٩١٢دا لە ئیستانبول دایانمەزراند. دامەزرێنەرەکان بریتی بوون لە: قەدری جەمیل، عومەر جەمیل، فوئاد تەمۆ، جەراح زادە زەکی[1]. خەلیل خەیالی. ژمێریاری پەیمانگەکە، رۆڵێکی گەورەی لەپەرەپێدانی گیانی نەتەوەیی لەلای خوێندکارە کوردەکانی ئەو خوێندنگەیەدا هەبوو. ئەو چوار کەسەی ناومان بردن پەیڕەوو پرۆگرامی کۆمەڵەکەیان نووسیو رەزامەندی رەسمیشیان لەسەر دامەزراندنی بەدەست هێناو لەساڵی ١٩١٢دا کۆمەڵەکەیان راگەیاند. دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە بووە مایەی رەزامەندیی خوێندکارانو رۆشنبیرانی کورد لەئیستانبول. عومەر جەمیل بەشێوەیەکی کاتی بوو بەسکرتێر تا کاتی گرێدانی کۆنگرە[2]. دکتۆر شوکری محەمەد بەگ لەمەعەدەن یارمەتییەکی دارایی گرنگی پێشکەش بەکۆمەڵەی هیڤی کرد[3]، هەروەها حاجی موسای سەرخێلی مودکانیش یارمەتیی دارایی پێشکەش کرد[4]. خوێندکارانی کورد لەپایتەخت بەپەرۆشێکی زۆرەوە پەیوەندییان بەو کۆمەڵەیەوە دەکرد، لەوانە: کەمال فەوزيورپیراکەی، زیا وەهبیو نەجمەددین حسێن لەکەرکوك، بابان زادە عەزیز، شەفیق لەئەرفاس، حەمزە لەمیکیس، تاهیر عەلی لەخارپیتو عەبدولکەریم لەسلێمانی، سالحو عەبدولقازی لەدیار بەکر، ئاسف بەدرخانو مستەفا بەدرخان لەدیاربەکر، دکتۆر شەوقی لەمەهاباد، محەمەد مەهدی لەسنە، فوئاد کەدواتر دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەسێدارەیان دا، هەروەها شاعیر عەبدولرەحمان رەحیم لەهەکاری[5]. کۆمەڵەی هیڤی رۆڵێکی گەورەی لەبوژاندنەوەی هەستی نەتەوەیی لەلای لاوانی کورد نواند. تاهیر عەلی هەوڵی دا لقێکی کۆمەڵە لەئەرزەرۆم بکاتەوە. لەساڵیادی دامەزراندنیشیدا کۆمەڵە شوێنێکی فراوانی بەکرێ گرت بۆ سازدانی ئاهەنگێکی جەماوەری. لەساڵی ١٩١٣دا کۆمەڵەی هیڤی کۆنگرەی یەکەمی گرێ داو لەشاری لۆزانی سویسرا

---

[1] سلوبي، في سبيل كردستان، ص٢٦.

[2] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

[3] دراتر ئیتتیحادییەکان بۆ بەغدایان دوور خستەوە. ئەویش لەوێ کەوتە نوسین لەدژی کۆمەڵەی هیڤی گوایە ئەم کۆمەڵەیە گوزارشت لەهیواو ئامانجی نەتەوەیی کورد ناکات دەیویست بەم نوسینانە ئیتتیحادییەکان لێی خۆش بنو بهێڵن بگەڕێتەوە بۆ پایتەخت. سلوبی، في سبيل كردستان، ص٢٦و ٢٧.

[4] Christian More. O.P.Cit. p.٧٨.

[5] سلوبي، في سبيل كردستان، ص٢٧.

لقێکی کردەوە[1]. لەدوای سەفەری قەدری جەمیل پاشا بۆ ئەورووپا بەمەبەستی خوێندن، لەوێ ژمارەیەك خوێندکاری کوردی بینی، لەوانە: هەردوو برا ئەکرەم جەمیل پاشاو شەمسەددین جەمیل پاشا، هەروەها بابان زادەو رەجان نەزهەتو سەلیم سابت لەدەرسیم، ئەمانە رەزامەندیی سەنتەری سەرەکیی کۆمەڵەیان لەئەستانبول وەرگرت بۆ کردنەوەی لقی لۆزانو لەوێدا کێشەی کوردیان بۆ ئەورووپا روون کردەوە. ئەم لقە رۆڵێکی زۆر گرنگی هەبوو چونکە ئەوروپییەکان بەهۆیەوە زانیارییان لەبارەی گەلی کوردو مێژووی کوردو مافە زەوتکراوەکەیەوە پەیدا کرد، هەروەها کۆمەڵەی هێڤی پەیوەندیی لەگەڵ ئەو کۆمەڵە عەرەبییانەدا بەست کەدژی حوکمی عوسمانی بوون.

کۆمەڵەی هێڤی لەساڵی ١٩١٣دا گۆڤارێکی مانگانەی بەناوی((رۆژی کورد))دەرکرد کەسێ ژمارەی لێدەرچوو، ژمارەی یەکەم لە١٩١٣/٦/٦و ژمارەی دووەم لە١٩١٣/٧/٦و ژمارەی سێیەمیش لە١٩١٣/٨/١. سەرنووسەری گۆڤارەکە عەبدولکەریم ئەفەندی بوو کەخەڵکی سلێمانییە، بەهەردوو زمانی کوردیو تورکی دەردەچوو، لەسەر بەرگی ژمارەی یەکەمدا وێنەی سەلاحەددینی ئەیوبی کراوەو لەبەرگی ژمارە دووشدا وێنەی کەریم خانی زەندو لەبەرگی ژمارەی سێهەمیشدا وێنەی حوسێن کەنعان پاشا کە لەخێزانی بەدرخانی گەورەیە. دیارترین نووسەرانی بەشی کوردی ئەو گۆڤارە بریتی بوون لەعەبدولکەریم ئەفەندیو ئەحمەددین حسێن لەکەرکوكو حەمزە بەگ لەمیکیس. دیارترین نووسەرانی بەشی تورکیش عەبدوڵلا جەودەتو ئیسماعیل حەقی بابانو مەمدوح سالم بەگ بوون[2]. گۆڤارەکە نامانجێکی روونی هەبوو و بانگەشەی بۆ دانانی ئەلفبای کوردی دەکرد[3]. لەژمارەی یەکەمدا بابەتێك لەلایەن عەبدولکەریم ئەفەندییەوە نووسراوە کەهانی منداڵانی کورد دەدا بەرێکوپێکی دەوامی خوێندنگە بکەنو فێری زانیاری بن. پاشان ناوی گۆڤارەکە گۆڕا بۆ((هەتاوی کورد)).

کۆمەڵەی هێڤی تا سەرەتای دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهان بەردەوام بوو، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕدا چالاکییەکانی وەستان چونکە زۆربەی ئەندامانی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٨/ احمد، کمال، کردستان. ص١٠٠/ الغمراوي، قصة الاکراد، ص١٥٢.

[2] سلوبي، ڤي سبيل کردستان. ص٢٧.

Chistion More.O.P.Cit.P.٧٧

[3] لازاریف، کێشە، ل٢٢٥.

پەیوەندییان بەبەرەکانی جەنگەوە کرد. کۆمەڵەکە ئەرشیفی گۆڤارەکەی بەکەسێك سپارد ناوی عەبدولعەزیز بوو تا بیپارێزێت. پاش تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهان جارێکیتر کۆمەڵەی هیڤی دەستی بەچالاکییەکانی کردەوە، بەڵام کەمالیستە تورکەکان چالاکییەکانی کۆمەڵەکەیان راگرت[1].

٥-رێکخراوی رێنمایی نهێنی(١٩١٣):

تا ئێستا تەنها جەلیلی جەلیل[2] ناوی ئەم رێکخراوەی هێناوەو وتویەتی کەئەم رێکخراوە بەپێی راپۆرتەکانی باڵیۆزی روسیا لەئیستانبول بۆ وەزارەتی دەرەوەی روسیا رێکخراوێکی نهێنی بوەو لیژنەیەکی تێدا هەبوە کەئامادەکاریی بۆ هەڵایسانی راپەڕین دەکرد کەپێکهاتبو لەسیبکی عەزیز بەگ، زیرکی عەقید ئەفەندی، ئالاشکیر نەکی شێخ عوسمان، سەلیم ئەفەندیو بەکر ئەفەندی، گوایە ئەم رێکخراوە تایپو پارەی هەبوەو ئەندامەکانی ئابونەی مانگانەیان داوە.

بەکر ئەفەندی ژمێریاری رێکخراوەکە بوەو تایپەکەش لای ئەو بوەو لەشارۆچکەی خنس نیشتەجێ بووە. رێکخراوەکە لەشارەکانی وانو دیاربەکرو ئورفە لقی هەبوو و خەیرەددین بەرازی پێی سپێردرابوو پەیوەندی بەکوردەکانی بایەزید، ئەرزەرۆم، بتلیسو موش بکا بۆ ئەنجامدانی راپەڕین لەدژی ئیتتیحادییەکان.

بەهۆی ئەوەشەوە کەئابونەی مانگانەی ئەندامانی رێکخراوەکە لەو ئاستەدا نەبوە کەپێداویستییەکانی رێکخراوەکەی پێ دابین بکرێ، سەرکردایەتیی رێکخراوەکە بڕیاری دا بکەوێتە باج کۆکردنەوەی لەکورد بۆ کڕینی چەك. ساڵی ١٩١٣ لیژنەکە سێرت کۆبۆوەو گفتوگۆ لەسەر دامەزراندنی میرنشینێك کراو هەروەها گفتوگۆ سەبارەت بەهەڵوێست بەرامبەر بەروسیا کراو لەم روەوە لەسەر ئەوە رێککەوتن کە کەمال بەگ، یەکێ لەئەندامە چالاکەکانی رێکخراوەکە، بنێرن بۆ بتلیس بۆ زانینی هەڵوێستی روسیا لەکوردو ئایا روسەکان بەوە رازی دەبن چەك بەنێو خاکیاندا بۆ ناو کوردستان بگوازرێتەوە یان نا. پێدەچێ روسەکان بەپیر داواکەی کوردەوە نەچووبن.

ئەم رێکخراوە دروشمی دامەزراندنی میرنشینێکی کوردیی پەسند کردو ئەم دروشمە مایەی رەزامەندیی توێژە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی کوردستان بوو. بەپێی انیارییەکانی کۆنسۆلی روس لەبتلیس، ئەم رێکخراوە لەویلایەتی موسڵو دیاربەکر بالاکیی هەبوو و سیاسەتی رێکخراوەکەش بریتی بوو لەهاریکاریی نێوان کوردو

---

[1] جليلي، نهضة الاكراد، ص١٠٠/ شريف، عبدالستار طاهر، الجمعيات والمنظمات، ص٣٨.

[2] جليلي، نهضة الاكراد، ص٩٤-٩٧.

ئەرمەن بۆ یەکخستنی هەوڵو کۆششیان بۆ ئەنجامدانی راپەڕین. ساڵی ١٩١٣، بەپێی رێنمایییەکانی رێکخراوەکە، راپەڕینێك لەبتلیس بەسەرکردایەتیی هەر یەك لەمەلا سەلیمو شێخ شەهاب هەڵایسا.

بەر لەوەی سولتان عەبدولحەمید دەسەڵات لەدەوڵەتی عوسمانیدا بگرێتە دەست، ریفۆرمخوازەکان لەوانە مەدحەت پاشا داوایان لێ کرد ریفۆرم ئەنجام بداو دەستور رابگەیەنێ، ئەویش بەڵێنی دانێ کەئەو کارانە ئەنجام دەداو پاش ئەوەی گەیشت بەدەسەڵات، لیژنەیەکی لە ٢٨ ئەندام، لەمەلاو مەدەنیو عەسکەرییەکان، بەسەرۆکایەتیی مەدحەت پاشا بۆ دانانی دەستور بۆ وڵات پێك هێنا[1]. لیژنەکە لەو پرۆژانەی پێشکەش کرابوو، پرۆژەکەی مەدحەت پاشای پەسند کرد کە لەهەندێ لەبڕگەکانی باسی کردبوو کەسنور بۆ دەسەڵاتی رەهای سوڵتان دابندرێو یەکسانی لەنێوان هەمو رۆڵەکانی گەلانی عوسمانی دەستەبەر بکرێ[2]. دەستورەکە هیچ زندەمافێکی بۆ دانیشتوانی پایتەخت نەسەلماندو[3] بڕیاری دا کەهەر پەرلەمانتارێك نوێنەرایەتیی ٥٠ هەزار کەس بکا، جگە لەوەی کەئەوەی بەمەرج دانا کەنابێ پەرلەمانتار، پۆستی وەزارەتی لێ دەوچێ، هیچ پۆستی تری هەبێو یەکێ لەخاڵەکان باسی ئەوەیان کرد کەپێویستە کۆبونەوەی پەرلەمان بەئاشکرا بێو خەلکیش بۆیان هەبێ ئامادەی کۆبونەوەکان بن[4].

لەم سەروبەندەدا سولتان یەکێ لەکەسانی نزیك خۆی کەناوی ئەحمەد جەلالەددین بوو، راسپارد قسە لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی دەرەوەی وڵات بکاتو هەوڵ بدات قەناعەت بەئەندامانی ئەو ئۆپۆزیسیۆنە بکا بگەڕێنەوە بۆ وڵات. ناوبراویش لەم کارەیدا سەرکەوتوو بو و بەم بۆنەیەوە زۆر لەبەرهەڵستکارەکان گەڕانەوە[5]. ئنجا پاشان سولتان لە٢٣ی تشرینی دوەمی ١٨٧٦دا، پاش رەزامەندیی ئەنجومەنی وەزیران، دەستوری

---

[1] علي، اورخان، السلطان عبدالحميد، ص٩٥.

[2] Shaw.O.P.Cit.P.١٧٧.

[3] الدسوقي، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، ص٢٤٢-٢٤٣.

[4] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٣.

[5] يكن، المعلوم والمجهول، ج١، ص١٦٦-١٦٧.

بەناوی یاسای بنچینەیی‌یەوە ڕاگەیاند[1]. ئەمەش بەمەشروتەی یەکەم بەسەرزکایەتیی مەدحەت پاشا ناسرا[2]. دەستورەکە تێیدا هاتبوو کەئەنجومەنێکی گشتی لەدوو دەستە پێك بێ کەئەمانە بون[3]:

١-ئەنجومەنی پیران:

دەستور مافی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنەی بەسوڵتان سپارد بەمەرجێك ژمارەی ئەندامەکانی لەسێیەکی ئەندامانی ئەنجومەنی مەبعوسان زیاتر نەبێ. سوڵتان ئەندامانی ئەو ئەنجومەنەی لەوانە هەڵدەبژارد کەتەمەنیان ٤٠ساڵ سەر بەرەو ژور بوو و لەوانەی کە ناوبانگێکی باشیان هەبوو و خزمەتی دەوڵەتیان کردبو. ئەندامەتی لەو ئەنجومەنە بەدرێژایی تەمەنی ئەندامەکە بوو و پتر وا باو بوو کەئەوەی بۆ ئەم ئەنجومەنە هەڵدەبژێردرا وەزیرە کۆنەکان‌و والییەکان‌و گەورە ئەفسەرانی سوپاو قازییەکان بون، سەرباری باڵیۆزو مەلاکان لەهەموو تایفە ئاینی‌یەکان. موچەکەشیان دە هەزار قروش بوو[4]. ئەرکی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە، چاودێری کردنی چارتەری یاساکان‌و بودجە بوو، ئەو دەسەڵاتەشیان هەبوو کەچارتەرەکان ڕەت بکەنەوە ئەگەر کەموکوڕی‌یەکیان تێدا ببینن بەرامبەر بەسوڵتان یاخود بەرامبەر بەشەریعەت[5].

٢-ئەنجومەنی مەبعوسان:

ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە لەلایەن ناوچەکانی هەڵبژاردنی ویلایەتەکانەوە هەڵدەبژێردران‌و وا دانرابو کەهەر ئەندامێك نوێنەرایەتیی ٥٠ هەزار کەس بکات بەڵام ئافرەتان بۆیان نەبو دەنگ بدەن. بەپێی خاڵی ٦٥ی دەستور هەڵبژاردن بەشێوەیەکی نهێنی بەڕێوە دەچوو و نەدەبو تەمەنی هەڵبژێر لە٢٥ ساڵ کەمتر بێ[6]. هەروەها نەدەبوو ئەندامەکە هەم ئەندامی ئەنجومەنی مەبعوسان بێ‌و هەم ئەرکێکی حکومی هەبێ وەزارەتی لێ دەرچێ‌و لێرەدا بۆی هەبو ئەرکە حکومییەکە یان ئەندامەیتی ئەنجومەن بۆ خۆی هەڵبژێرێ. هەروەها دەبوایە ئەندامە هەڵبژێردراوەکە زمانی تورکی

---

[1] منسي، محمود، حركة اليقظة العربية، ص٧٢/الدسوقي، المصدر السابق، ص٢٤٢.

[2] نديم، احوال العراق، ص٣٣.

[3] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

[4] قروش دراوێکی عوسمانیی زیوینە، سەد دانەی بەرامبەر بەیەك لیرەی زێڕ بوو. بڕوانە: سلمان، محمد، التطور الاقتصادي في العراق، ج١، بغداد، ١٩٦٥، ص٤٠٨.

[5] عبدالقادر، عصمت، دور النواب العرب، ص٢٨/عبدالقادر، عصمت، العرب والمسألة الدستورية في الدولة العثمانية ١٨٧٦-١٩١٤، رسالة دكتوراه غير منشورة، جامعة الموصل، ص٣٥.

[6] لبيب، حسين، تاريخ الاكراك العثمانيين، ص٣٧.

بزانیبایە. ماوەی ئەندامێتیش لەئەنجومەن ٤ ساڵ بوو، مووچەی مانگانەش ٢٠هەزار قروش بوو، سەرباری خەرجیی سەفەر لەشارەکەیەوە بۆ پایتەخت[1].

لە١٩/٣/١٨٧٧ئەنجومەن خولی یەکەمی لەسەرای دۆڵمە باخچە دەست پێ کردو ٨٤ ئەندامی مەبعوسان و ٣٢ ئەندامی ئەنجومەنی پیران ئامادە بون تێیدا، هەندێ لەنوێنەرەکانیش لەبەر سەختی ڕێوبان درەنگ گەیشتن. خودی سوڵتانیش ئامادەی دانیشتنی کردنەوەکە بوو. لەئەنجومەنەکەدا زمانی ڕەسمی زمانی تورکی بوو[2].

پەرلەمانی عوسمانی زۆری پێ نەچو چونکە سوڵتان هەلی جەنگی ساڵانی ١٨٧٧-١٨٧٨ی روسیاو دەوڵەتی عوسمانی قۆستەوەو لە١٣ی شوباتی ١٨٧٨ بەفەرمانێك تا کاتێکی نادیار پەرلەمانەکەی پەك خست[3]. سەدری ئەعزەم ئەحمەد ڕەفیق پاشا خۆی فەرمانەکەی خوێندەوە[4]و فەرمانی دا پەرلەمانتارەکان بۆ شوێنەکانی خۆیان بگێڕدرێنەوە[5].

لەو سەرچاوانەی لەبەر دەستدان ناوی ئەو پەرلەمانتارە کوردانەمان چنگ نەکەوت کە لەو ماوەیەدا پەرلەمانتار بون ئەوە نەبێ کەیەك جار ناوی پەرلەمانتارێك هات کاتێك باس لەمەسەلەی مۆنتینیگرۆ کرا کەدەوڵەتە ئەوروپاییەکان لەیاداشتی رۆژی ٣١ی ئازاری ١٨٧٧دا داوایان کردبو مەسەلەکە بەشێوەیەکی ئاشتییانە چارەسەر بکرێ و روسیاش هەڕەشەی کردبوو ئەگەر یاداشتەکە جێبەجێ نەکرێت جەنگ لەدژی دەوڵەتی عوسمانی ڕادەگەیەنێ. کاتێك پەرلەمان بۆ تاوتوێ کردنی مەسەلەکە کۆبۆوە، هەندێ لەکارمەندەکان ئەوەیان دەرخست کەخەزێنەی دەوڵەت بەتاڵەو پێداویستییەکانی هەڵسوڕانی جەنگی پێ دەستبەر ناکرێ، بۆیە پێیان باش بوو یاداشتە ئەوروپاییەکە قبوڵ بکرێ، ئیتر لێرەدا پەرلەمانتارێکی کورد (کەناوی نەهاتوە) هەستاو گوتی: چۆن دەتوانین باوەڕ بەقسەی کارمەندەکان بکەین، لەکاتێکدا کارمەندەکان گرانترین جلوبەرگیان لەبەر دایەو خەڵکی لەکوردستاندا جلی شڕو

---

[1] Shaw.O.P.Cit. P.١٧

عبدالقادر، عصمت، العرب والمسألة الدستورية، ص٣٦.

[2] الخالدي، روحي بك، الانقلاب العثماني وتركيا الفتاة، مجلة الهلال المصرية، عدد كانون الاول ١٩٠٨، ص١٢٩/ نديم، احوال العراق، ص٣٣/عبدالقادر، عصمت، دور النواب العرب، ص٤٠-٤١.

[3] نديم، احوال العراق، ص٣٤.

[4] علي، اورخان، السلطان عبدالحميد، ص١٣٧.

[5] باتريك، ماري ملز، سلاطين بني عثمان، ص٩٠.

دڕاویان کردۆتە بەر. پەرلەمانتارە کوردەکە ئەوەشی گوت کەئەو ناچار بوە جلی کۆن لەبازاڕ بکڕیو ئامادەشە بیفرۆشێتەوەو نرخەکەی پێشکەش بەدەوڵەت بکات[1].

هەروەها لەدانیشتنی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٨٧٨دا پەرلەمانتارە ناتورکەکان داوایان کرد زمانەکانیان ببن بەزمانی ڕەسمیو لێرە بەدواوە بانگەوازە نەتەوەییەکان بەرە بەرە دەرکەوتن[2]. هەڵبژاردنی ئەو ئەنجومەنە بەشێوەیەکی ئازاد ئەنجام نەدرابوو بەڵکو حکومەت دەستی تێ وەردا بوو. تەنها لەساڵی ١٩٠٨دا پەرلەمان دامەزرایەوەو لەو قۆناغەدا دەبینین ناوی هەندێ لەپەرلەمانتارە کوردەکان بەرچاو دەکەون کە لەنێو پەرلەمانی عوسمانیدا چوستو چالاکو بەجموجۆڵ بون. ئەو پەرلەمانتارانەش ئەمانە بون:

١-ئیسماعیل حەقی بابان کوڕی مستەفا زهنی پاشا، ساڵی ١٨٧٦ لەبەغدا لەدایك بوو و لەسەر لیستی ئتتیحادو تەرەقی خۆی پاڵاوتو وەك نوێنەری بەغدا هەڵبژێردرا[3]. پاش کودەتاکەی ساڵی ١٩٠٨ پۆستی وەزارەتی مەعاریفی پێ سپێردراو لەسەر ئاستی کەلتور چەندین کتێبی بەزمانی تورکی هەبو[4]، جگە لەوە یەکێ لەدیارترین ئەو کەسانە بوو کەدەستیان لەدەرکردنی گۆڤاری((ڕۆژی کورد))هەبو کەساڵی ١٩١٣ کۆمەڵەی هێڤی دەری کرد[5].

لەساڵی ١٩١٣دا لەئیستانبول لەتەمەنی ٣٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. جەمیل سدقی زەهاوی کەئاشناو خزمی بوو، بەزمانی عەرەبی بەبۆنەی کۆچی دواییەوە، لەهۆنراوەیەکدا زۆری پێ هەڵگوت[6].

٢-سەعید پاشای کوڕی حسێن بەگ پاشا خەندان، خەڵکی شاری سلێمانی بوو، ڕۆڵێکی گەورەی لەکردنەوەی خوێندنگەی ڕەشیدیە لەسلێمانی هەبو، ساڵی ١٨٨٦ وەزارەتی دەرەوەی پێ سپێردراو پاشان بوو بەباڵیۆزی ئاسایی لەبەرلین. پاش کودەتاکە بۆ پۆستی سەرۆکی ئەنجومەنی پیران بەوەکالەت هەڵبژێردرا بەڵام لەهەمان ساڵدا، واتە لەساڵی ١٩٠٨دا، کۆچی دوایی کرد[7].

---

[1] الخالدي، روحي بك، الانقلاب العثماني وتركيا الفتاة، ص٨١.

[2] علي، اورخان، السلطان عبدالحميد، ص١٢٥-١٢٦.

[3] العزاوي، عباس، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، ص١٦٥.

[4] زكي، مشاهير، ج١، ١١١.

[5] گۆڤاری((ڕۆژی کورد))، ژمارە ٢، ١٩١٣. هەروەها بڕوانە ژمارە ٣ی هەمان گۆڤار.

[6] صفوت، نهدا لتحي، وفاة اسماعيل حقي بابان، جريدة الاتحاد، العدد١٥٣، ١٩٩٨/١/٢٤.

[7] زكي، تاريخ السليمانية، ص٢٥٧.

٣-مەلا سەعید ئەفەندی کەرکوکلی کەوەك نوێنەری سلێمانی هەڵبژێردرا[1].

٤-حکمەت بابان نوێنەری سلێمانی[2].

٥-محەمەد عەلی حاجی قیردار نوێنەری کەرکوك[3].

٦-جەلیل سدقی زەهاوی، نوێنەری بەغدا[4]. ڕیشەی دەچێتەوە سەر سلێمانی و بنەماڵەی بابان بەڵام باپیرەی، حەسەن بەگ، بەهۆی دوژمنایەتییەکەوە کە لەسلێمانی تێوەگلا، چوو بۆ ناوچەی زەهاو لەڕۆژئاوای ئێران، بۆیە ئەمیش بەزەهاوی ناوی دەرکرد و خۆیشی کوڕی محەمەد فەیزی زانا بەناوبانگەکەیە. زەهاوی ساڵی ١٨٦٣ لەبەغدا لەدایك بوو و ساڵی ١٩٠٨بوو بەئەندامی پەرلەمانی عوسمانی[5].

٧-تۆفیق بەگ نوێنەری کوردەکانی وان لەباکوری کوردستان. کوڕەکەی، فوئاد تەمۆ، ڕۆڵێکی گەورەی لەدامەزراندنی کۆمەڵەی هێڤی نواند[6].

٨-پەرلەمانتارێکی کوردی دەرسیم کەناوی نەزانراوە، زۆر دژی سیاسەتی ئیتتیحادییەکان بوو لەپەرلەماندا[7].

٩-لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩١٠دا دو کوڕەکەی بەدرخان، حسێن و حەسەن، وەك نوێنەری کوردستان بونە پەرلەمانتار لەئەنجومەنی مەبعوسان بەڵام ئیتتیحادییەکان دانیان بەسەرکەوتنیاندا نەنا و هەردوکیان راونا، ئەوانیش بۆ شاخ رایانکرد. پاشان حسێن کەئەندامی ئەنجومەنی شارەوانیی پایتەخت بوو، گیراو لەزینداندا زۆر ئەشکەنجە دراو لەئاکامدا کەڕ بوو و توشی نەخۆشیی لەبیرچونەوە بوو[8]. لەئەنجامی ئەم سیاسەتە رەگەزپەرستەدا زۆر کورد لەناوچەی بتلیس چونە ریزی پارتی ئازادییەوە[9].

١٠-لوتفی فکری کەدژی ئیتتیحادییەکان بوو و توانی بەیارمەتیی هەندێ کەس پارتی تازەکەرەوە لەئیستانبول پێك بێنێ. ناوبراو دژی سیاسەتی تێکەڵ کردنی ئاین و دەوڵەت بوو[10].

---

[1] العزاوي، تاريخ العراق، ج٨، ص١٦٦.

[2] عبدالقادر، عصمت، دور النواب العرب، ص١٢١.

[3] هەمان سەرچاوە، ل١٥٠.

[4] Abid A.AL-Marayati, Adiplomatic History of mordren Iraq, first edition, New York, ١٩٦١. P. ٣٢.

[5] زكي، تاريخ السليمانية، ص٢٥٤.

[6] سلوپي، في سبيل كردستان، ص٢٦.

[7] ف. م. كرديفسكي، مؤلفات مختارة، ج٢(تاريخ وثقافة)، موسكو(باللغة الروسية)، ١٩٦٢، ص٨٣.

[8] کرتیس، کۆچچا، مێژوی کورد، ل٥٥. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: گۆڤاری کاروان، ژمارە ٣، ١٩٨٢، ل١١٠.

[9] جليلي، نهضة الاكراد، ص١٩٣.

[10] لازاریف، کێشە، ل٢٢٥.

نیازیش وابو یەحیا خدر ئاغاش ببێ بەپەرلەمانتار بەڵام ڕۆژگار ڕێی نەدا[1].

سەبارەت بەکارو چالاکییەکانی پەرلەمانتارە کوردەکانیش ئەوە بەمجۆرە بوو:

لەیەکێ لەدانیشتنەکانی پەرلەمان لە١٧ی شوباتی ١٩٠٩ نوێنەرە کوردەکەی بەغدا ئیسماعیل حەقی بابان داوای کرد وەزارەتەکەی کامل پاشا بخرێتە بەر دەنگدان و لەم ڕووەوە ئەنجومەن بەسەر دو گروپدا دابەش بوو. گروپێکیان پشتیوانی لەداواکە کردو گروپێکیش ڕەتی کردەوە. ئیتر وەزارەتەکە کەوت و وەزارەتێکی تر بەسەرۆکایەتی حلمی پاشای سەر بەئیتتیحادییەکان جێی گرتەوە[2]. ڕەنگە ئیسماعیل حەقی بابانیش یەکێ لەلایەنگرانی ئیتتیحادییەکان بووبێ کەرایانسپارد بێ داوا لەپەرلەمان بکا دەنگدان لەسەر کێشانەوەی متمانە بەوەزارەتەکەی کامل پاشا ساز بکا. جگە لەمە، ئیسماعیل حەقی بابان دژی پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین- بەغدا بوو چونکە ئەم پرۆژەیە یەکێ لەپاشماوەکانی سەردەمی حەمیدییەو پێشنیاریشی کرد مافی ئەنجامدانی پرۆژەکە لەبانکی ئەلمانیایی دزیچە بانگ بسەنرێتەوە[3].

سەرەتای مانگی تەموزی ساڵی ١٩٠٩ کاتێك یاسای تەنسیقات دەرچو، مەبەست لەو یاسایە ئەنجامدانی شاڵاوێکی پاکسازی و مۆدێرنەکردنی دەزگای بەڕێوەبردن بوو. ئیتر دەست بەکارکردن بۆ بەدی هێنانی ئەو ئامانجە کراو ژمارەیەکی زۆر فەرمانبەری گەندەڵ لابران بەڵام زۆریشیان بەهۆی ئەو بەرتیلە زۆرەوە کەدایان لەپۆستەکانی خۆیان مانەوە. ئەم یاسایە بێزارییەکی زۆری نایەوەو ئیسماعیل حەقی بابان ڕەخنەی لێ گرت چونکە بەزەحمەت جێبەجێ دەکرێ و وتی((ئەم یاسایە دادپەروەری و یەکسانیی تێدایە بەڵام ئەو فەرمانبەرانەی خۆیان بەباڵاتر لەگەڵ دادەنێن، خراپ جێبەجێی دەکەن))[4].

لەدانیشتنی ٢٢ی کانونی دوەمدا، بابان پشتیوانیی لەوە کرد کە ڕۆژنامەنوس بۆی هەیە هەواڵ بدات پێش ڕۆژنامەکانی تر هەواڵ بڵاو بکاتەوە داوای چەند ڕێنماییەکی کرد بۆ دەستەبەرکردنی مافی بڵاوکردنەوە[5]، لە٢٦ی کانونی دوەمیش

---

[1] مەولود بێخاڵی وتویەتی یەحیا خدر ئاغای هەولێر هەڵبژێردرا بوو تا نوێنەرایەتیی کورد بکا لەپەرلەمانی عوسمانی لەساڵی ١٩٠٨دا بەڵام لەکاتی چوون بۆ ئیستانبوڵ، لەئەسکی کەلەك کەوتە ناو زێی گەورەو خنکا. بڕوانە: هەولێرم وا دیوە وا بیستوە، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ١٩٩٧، ل١٢٩.

[2] عبدالقادر، عصمت، دور النواب العرب، ص١١٨.

[3] تقويم وقائع، ژمارە ١٣٨، ٢٥/٢/١٩٠٩.

[4] عبدالقادر، عصمت، دور النواب العرب، ص١٤١.

[5] هەمان سەرچاوە، ل١٥٧.

لەپێشنیارێکدا بۆ ئەنجومەنی مەبعوسان داوای کرد لەهەردو ویلایەتی بەغداو بەسرە چاو بەسیستمی باجدا بخشێنرێتەوە[1].

هەروەها هەر یەك لەدو نوێنەرەکەی کەرکوك، محەمەد عەلی قیرداروو سالح پاشا، لە۱۲ی ئابی۱۹۰۹دا یاداشتێکیان دایە سەرۆکی پەرلەمان تێیدا داوای کردنەوەو زیادکردنی خوێندنگەو ئەنجامدانی چەند ریفۆرمێکیان لەناوچە کوردنشینە پشت گوێ خراوەکان کرد[2]. رەنگە ئەم یاداشتەو تەواوی چالاکیی پەرلەمانتارانی کورد بەڵگە بن لەسەر گەشەکردنی هۆشیاریی کوردایەتیو زیادبوونی پەی بردنی سەرانی کورد بەکاروباری کۆمەڵەکەی خۆیان. هەر لەم بوارەشدا پەرلەمانتار محەمەد عەلی قیرداروو چەند پەرلەمانتارێکی تر لەساڵی ۱۹۱۰دا راپۆرتێکیان بۆ پەرلەمان بەرز کردەوە تێیدا ئەوەیان خستە پاڵ نازم پاشای والیی بەغدا کەدەسەڵاتی خۆی خراپ بەکار دێنێو کشتوکاڵی فەرامۆش کردوەو پەیوەندیی بەتینی لەگەڵ سەرخێڵەکاندا دروست کردوە[3]. پاشان نازم پاشا لەسەر کار لابراو لەوانەیە هۆی لابردنەکەشی بگەرێتەوە بۆ ئەم یاداشتە.

کاتێك مەسەلەی نیشتەجێ کردنی خێڵەکان لەپەرلەمان هاتە پێش، هەندێ لەپەرلەمانتارەکان پێشنیاریان کرد خێڵە عەرەبەکان لەدیاربەکر نیشتەجێ بکرێن، لەم بارەیشەوە پەرلەمانتارە کوردەکان هیچ قسەیەکیان نەکرد، کەچی هەندێ لەپەرلەمانتارە عەرەبەکان دژی نیشتەجێ کردنەکە وەستان وەك نوێنەری دێرئەلزور خدر لوتفی کەگوتی نیشتەجێ کردنی خێڵە عەرەبەکان لەدیاربەکر هیچ قازانجی بۆ ناوچەکە نیەو جیاوازییەکی زۆریش لەرووی دابو نەریتەوە لەنێوان خێڵە کوردەکانو خێڵە عەرەبەکاندا هەیە[4]. هەروەها نوێنەری موسڵ محەمەد عەلی رایگەیاند کەبەزۆر نیشتەجێ کردنی ئەو خێڵانە گرفتی زۆر دەنێتەوە. هەروەها نوێنەری حەما، عەبدولحەمید زەهراوی، خودی پرۆژەکەی دایە بەر تانەو تەشەر[5].

---

[1] تقويم وقائع، ژمارە ۱۲٤، ۱۹۰۹.

[2] تقويم وقائع، ژمارە ۱٤۸، ۱۹۰۹

[3] عبدالقادر، عصمت، درر التراب العرب، ص۱٤٥.

[4] مجلس مبعوثان، ضبط جريدة سى، ساڵی ۲، حوزەیرانی ۱۹۰۹، ل۲٥٤. وەرگیراوە لە: عبدالقادر عصمت، درر التراب العرب، ص۱۸۹.

[5] بۆ زانیاریی پتر سەبارەت بەم بابەتە، بڕوانە: عبدالقادر، عصمت، درر التراب العرب، ص۱۸۹-۱۹۰.

بەپێی گۆڤاری((الهلال))ی میسری، ژمارەی پەرلەمانتارانی کورد لەپەرلەمانی عوسمانیدا هەشت پەرلەمانتار بوو[1].

کودەتای عوسمانیو سیاسەتی ئیتتیحادییەکان بەرامبەر بەکورد

کودەتای ساڵی ١٩٠٨ کتوپڕ ڕوی نەدا بەڵکو زادەی هەوڵو تەقەللایەك بوو کەدەیان ساڵ بەشێوەی خەباتی ئاشکراو نهێنیی درێژەی کێشا[2] و لەو ماوەیەدا ئەندامەکانی کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقی ڕاو دەنرانو دەخرانە زیندانەوە یاخود بۆ هەندەران دور دەخرانەوەو دەست بەسەر سەروەتو سامانیاندا دەگیرا. پێش کودەتاکەی ١٩٠٨، کودەتایەکی تر لەساڵی ١٨٩٦ ساز کراو ئەوەی دەستی تێدا بوو ئەحمەد ئەفەندی لێپرسراوی کۆمیتەی پایتەختی کۆمەڵەکە بوو[3] کە توانیبوی کازم پاشای فەرماندەی تیپی یەکی پایتەخت بەلای خۆیدا رابکێشێ. ئامانجی هەوڵەکە لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدو هێنانەوەی موورادی پێنجەم بوو کەپێشتر بەبیانوی شێت بونەوە لەسەر کار لابرا بوو. بەڵام هەوڵەکە سەری نەگرتو لەم سۆنگەیەوە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەکە لەپایتەخت جەزرەبەی دژواریان پێ کەوت. بۆیە لەساڵی ١٩٠٦دا بارەگای کۆمەڵەکە برایە سالۆنیكو لەوێ ئیتتیحادییەکان پێیان لەسەر گۆڕین داگرتو سور بون لەسەر هێنانەوەی دەستوری ساڵی ١٨٧٦[4]. بڕیاریشیان دا لەرۆژی ٣١ی ئابی ١٩٠٨دەست بەکار بن، ئەو رۆژەش ڕۆژی دانیشتنی سوڵتان عەبدولحەمید بوو لەسەر عەرش، بۆیە خۆیان ئامادە کرد بەڵام ڕەوتی خێرای ڕوداوەکان بوە هۆی پێشخستنی ڕۆژی کارەکە چونکە لەرۆژانی ٩و ١٠ی حوزەیران کۆبونەوەیەك گرێ درا لەنێوان تزاری روسیا نیکۆلای یەکەمو پاشای ئنگەلتەرە ئیدواردی حەوتەمو ئیتتیحادییەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشت ئنگەلتەرە واز لەبەرهەڵستی کردنی کلاسیکیانەی چاوچنۆکییەکانی روس لەدەوڵەتی عوسمانی بێنێ[5]. لەو کاتەدا ناوچەی سالۆنیك لەژێر دەستی نێودەوڵەتاندا بوو. لەوێ ئیتتیحادییەکان کەوتنە کار بۆ لەکارخستنی سوڵتان. وەنەبێ سوڵتانیش ئاگای لەو کەینو بەینە نەبوبێ بەڵام هیچی پێ نەدەکرا. لەو کاتەدا نیازیو ئەنوەر لەدیارترین سەرانی جوڵانەوەکە بونو سەربازیان لەبەر

---

[1] گۆڤاری((الهلال))، ج٦، ساڵی ١٧، ئازاری ١٩٠٩، ل٣٧٤-٣٧٦.

[2] عبدالقادر، عصمت، دور النواب العرب، ص٦٠.

[3] انیس، محمد، الدولة العثمانية والمشرق العربي، ص٢٤٥.

[4] العمري، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، ص٣١٥.

[5] لبيب، حسين، تاريخ المسألة الشرقية، ص٩٥/صنعي، محمود صالح، حركة اليقظة العربية، ص١١٨.

دەستدا بوو و داوایان لەسوڵتان کرد سەعید پاشا کوچوك بکاتە سەدری ئەعزەم[1].
بەڵام سوڵتان داواکەیانی ڕەت کردەوە، ئیتر هێزەکانی نیازی لەکاتی نوێژی هەینیدا هێرشیان کردە سەر سەربازگەیەكو چەند ئەفسەرێکیان لەکاتی نوێژ کردندا کوشت لەوانە شەمسی پاشا کەسوڵتان لەناوبردنی یاخیبونەکەی پێ سپاردبو. ئیتر بڕێکی زۆر چەكو تفاقو ئازوقەیان برد. پاشان سوڵتان عوسمان پاشای لەجێی شەمسی پاشا دانا بەڵام سەربازەکان بەقسەیان نەکردو عوسمان پاشا بەدیلی کەوتە دەست هێزەکانی نیازییەوە[2].

بەمجۆرە، کودەتاکە لە٢٣ی تەمموزی ١٩٠٨ڕویداو بەرهەڵستکارەکان پایتەختیان گرتو سوڵتانیان ناچار کرد کار بەدەستورە هەڵپەسێردراوەکە بکاتەوە[3]. جیهان بەوە سەرسام بوو کە لەشکری سێی مەکەدۆنیا سوڵتانی ناچار کردوە مل بۆ داوای بەرهەڵستکارەکان کەچ بکات[4].

کوردێك لەیاداشتەکانیدا نوسیویەتی[5] کەکاتێك سوڵتان ملی بۆ داوای ئیتتیحادییەکان کەچ کرد، لەهەمو شوێنێکدا دەست بەهوتاف کێشان کرا: بژی ئازادیو دادو یەکسانیو برایەتی. ئنجا شێواویو ئاشوب پایتەختی گرتەوە. ئەمەش شتێکە لەهەمو شۆڕشێکدا ڕویداوە. کودەتاکە لەلای گەلانی عوسمانی دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبور و بەم بۆنەیەوە ئاهەنگ گێردراو بەزمو شایی ساز کراو تەواوی وڵاتانو گەلانی سەر بە دەوڵەتانی عوسمانی شادمانو کەیف خۆش بونو هەر هەموشیان پشتگیرییان لەرژێمە نوێکە کرد[6]. پاشان هەندێ لەسەرکردەکانی رژێمە نوێکە وەك ئەنوەر پاشا ڕایانگەیاند کە: ((حکومەتی زۆردار نەما، ئیدی ئێمە هەمومان براین، تیامان نیە بولگارو یۆنانو ڕۆمانو جولەکەو موسڵمان بێ، هەمومان لەژێر ئەم ئاسمانە شینەدا یەکسانینو هەمومان شانازی بەوەوە دەکەین کەعوسمانین))[7].

---

[1] الجبوري، دور المثقفين، ص١٦.
[2] حسن، جاسم محمد، العراق في العهد الحميدي، ص٨٦-٨٩.
[3] برو، توفيق علي، العرب والاتراك في الدستور العثماني ١٩٠٨-١٩١٤، ١٩٦٠، ص٧٥/الخطيب، عبدالحميد، تركيا الحديثة مثل اعلى، بغداد، ص٧٧.
[4] رامزور، تركيا الفتاة، ص١١٩/ منسي، محمود، حركة اليقظة العربية، ص١١٨.
[5] سلوبي، في سبيل كردستان، ص١٦-١٧.
[6] السويدي، توفيق، مذكراتي نصف قرن من تاريخ العراق والقضية العربية، بيروت، ١٩٦٩، ص١٩.
[7] رامزور، تركيا الفتاة، ص١٤٩/ منسي، محمود، حركة اليقظة العربية، ص١٢٠.

ئنجا دواتر جەلالەددین عارف وتی((ئەمڕۆ ئێمە وازمان لەوشەی تورك هێناوە ئەگەرچی وشەیەكی خۆشەویستە لامان. هەمومان عوسمانین‌و هیچ جیاوازییەك لەنێوان تورك‌و عەرەب‌و رۆم ئەوانی تر نیە))[1].

كورد وەك باقی گەلانی عوسمانی بەم گۆڕانە شادمان بوو. زنار سلۆپی [2] وتویەتی كەكوردەكانی پایتەخت جلوبەرگی رەنگاو رەنگیان پۆشی‌و كەوتنە گەڕان بەشەقامەكانداو كۆبونەوە لەچایخانەكەی عەبدوللا چاویشی‌و كەیف‌و خۆشی بەدەموچاویانەوە دیار بوو. لەم سەروبەندەشدا مەلا سەعید نورەسی جلی وای لەبەر كردبوو كەئەوەندە سەیرو سەمەر بوو سەرنجی هەموانی بەلای خۆیدا راكێشا بوو. ئیتتیحادییەكان زیندانییە كوردەكانیان ئازاد كردو ئاوارەو دورخراوەكانیش گەڕانەوە وهەلومەرجێكی وا هاتە ئاراوە وەك ئەوە وابوو كەلاپەڕەیەكی نوێ لەپەیوەندیی نێوان نەتەوەكان هاتۆتە ئاراوە بەڵام هەندێ كەس بەهەڵە لەدروشمەكانی ئازادی گەیشتن‌و وا تێگەیشتن كەدەتوانن هەر لێپرسراوێك كەكەیفیان پێ نایە، لابەرن یان دەركەن[3]. گروپەكەی ئیتتیحادو تەرەقی رۆژێكیان بەناوی شوكربێرییەوە داهێناو كوردەكان وا تێگەیشتبون ئەو ئاهەنگە ئەوانیش دەگرێتەوە، بۆیە جلی رەنگاورەنگی خۆیان لەبەر كردو كەوتنە گەڕان بەشەقامەكانی پایتەختدا، دواتر لەنزیك ماڵی عەبدولقادر نەهری كۆ بونەوە ولەوێ ئاهەنگێكی وتار خوێندنەوەیان دامەزراند[4].

سەركردە ئیتتیحادییەكان پاش كودەتاكە بەردەوام لەوتارەكانیاندا باسی یەكسانی‌و دادو برایەتییان دەكردو پاشان دەستیان كرد بە بەڵێندان گوایە رێژەی كۆمەڵایەتی‌و ئابوری جێبەجێ دەكەن، تەنانەت ئەوروپاش باوەڕی پێ كردن‌و چاوەڕوان بوو دەوڵەتێكی شارستانی دیموكرات‌و ئازادیخواز سەر هەڵبدات[5]. لەگەرمەی ئەم بارودۆخە جەنجاڵەدا سوڵتان عەبدولحەمید خۆی مات كردبوو و بەتەما بوو بزوتنەوەیەكی چەواشە بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵاتە لێسەنراوەكەی بەرپا بكات بەڵام هەوڵەكانی هیچیان لێ سەوز نەبو[6]. پاشان ئیتتیحادییەكان لەرێی ئەنجومەنی مەبعوسان‌و پیرانەوە بڕیارێكیان سەبارەت بەلابردنی سوڵتان لەرۆژی ٢٧/٤/١٩٠٩

---

[1] منسي، محمود، حركة اليقظة العربية، ص١٢٠.
[2] سلوبي، في سبيل كردستان، ص١٧.
[3] الارحيم، تطور العراق تحت حكم الاتحاديين، ص٩٠.
[4] جليلي، نهضة الاكراد، ص٦١.
[5] بلەج، القضية الكردية، ص٦٦.
[6] انيس، محمد، الدولة العثمانية، ص٢٥٦/ لبيب، حسين، تاريخ المسألة الشرقية، ص١٠١.

دەرکـردو بڕیـاری لابردنیـشیان پـێ ڕاگەیانـد[1]. پاشـان بـۆ ناوچـەی سـالۆنیك دووریانخستەوە[2].

لەسـەرەتادا ئیتتیحادییـەکان سیاسـەتێکی هاوسـەنگیان بەرامبـەر بەگـەلان‌و ئاینەکان پیادە کرد بەڵام پاش ئەوەی خۆیان قایم کرد، سیاسـەتەکەی خۆیـان گـۆڕی‌و کەوتنە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی تۆرانیی‌یانە[3]، بەمەش نیازو مـەرامیان کەوتـە ڕوو و خۆیشیان سیاسەتی تورکاندنیان بەرامبـەر بەهـەمو نەتـەوەکان بـەبێ جیـاوازی پیـادە کرد[4]. دروشمی لاوانی تورك بریتی بوو لـە((ئێمـە تـورکین، کەعبەکـەمان تۆرانـە))[5]. تەلعەت پاشاو جاوید پاشـا لەوتارەکانیانـدا دەیـانگوت((ئەگـەر یەکـەم جـار دەوڵـەت نەتورکێنین، هیچ یەکسانییەك لەنێوان هاوولاتییاندا نایەتە دی))[6].

پێدەچێ لەسەرەتادا سیاسەتی ئیتتیحادییەکان بەرامبەر بەکورد سیاسەتێکی باش بووبێ بەڵام دواتر ئەم سیاسەتەیان گۆڕی‌و لەساڵی ١٩٠٩دا کەوتنە ناردنی سیخوڕ بۆ کوردستان بۆ ئاژاوەنانەوە لەنێوان کوردو ئەرمەندا[7] چونکە لەپایتەخت نەیانتوانی بوو کورد لەدژی ئەرمەن هـان بـدەن ئـەویش بـەهۆی ئـەو هاوکـاری‌و تەبایی‌یـەی لـەنێوان کوردو ئەرمەندا هەبو، لەبـەر ئـەوە ئیتتیحادییـەکان ناوبـەناو گەشتیان بەرۆژهـەڵاتی ئەناتۆلیادا کردو چاویان بەسەرانی خێڵەکان کەوت‌و لێدوانیان لەدژی ئەرمەنەکان داو چەند مەدالیایەکیان بەسەر دەرەبەگە کوردەکاندا دابەش کرد[8].

ساڵی ١٩١٠ وەزیری ئابوری سەردانی هەرێمی کوردستانی کردو لەوێ داوای لـەو سەرانەی کورد کرد کەرایانکردبوو بۆ ئێران، بگەڕێنەوە بۆ کوردستان‌و لەوانەیە ئەمـە بۆ ئەوە بووبێ کەپەیوەندی لەنێوان سەرانی روناکبیرو ڕۆشنگەرانی کوردی پایتـەخت‌و سەرخێڵەکانی کورد نەمێنێ بۆ ئەوەی خێڵەکان پشتگیری لـەو بانگەوازانـە نەکـەن کـە ڕۆشنگەرە کوردەکان لەدژی ئیتتیحادییەکان دەریاندەکرد. لـەو هەلومەرجـەدا هەنـدێ

---

[1] الواعظ، مصطفى نورالدين، الروض الزاهر في تراجم آل سيد جعفر، الموصل، ص٢٤٥-٢٤٦.

Robinson, Richard, the first Turckish Repubic, Study notion development,(U.S.A)١٩٦٣,P.٣٨.

[2] لبيب، حسين، تاريخ المسألة الشرقية، ص١٠١.

[3] تۆران نیشتمانی هەوڵ جاری خێڵە تورکەکانەو تورکستان‌و تەتەرستانی ناوەڕاستی ئاسیا دەگرێتەوە. بڕوانە: ندیم، احوال العراق، ص٦٢.

[4] خصباك، الكرد والمسألة الكردية، ص٢٠/ العراق في الوثائق البريطانية ١٩٠٥-١٩٣٠، ترجمة فؤاد قزانجي، بغداد، ١٩٨٩، ص٥٩.

[5] نديم، احوال العراق، ص٦٤.

[6] زين، نور الدين زين، نشوء القومية العربية مع دراسة تاريخية في العلاقات العربية- التركية، بيروت، ١٩٧٢، ص٨٤.

[7] لازاريف، کێشە، ل٢٢٦.

[8] جليلى، جليل وآخرون، الحركة الكردية، ص٧٢.

لەسەرانی خێڵە کوردەکان کەوتنە پەیوەندی کردن بەشێخ عەبدولقادر نەهریییەوەو هەر لەهەمان کاتیشدا پەیوەندی لەنێوان هەندێ لەسەرانی کوردو روسەکان دامەزراو تیایدا سەرانی کورد داوای پشتگیریان لەروسەکان کرد بۆ بەدی هێنانی ئاواتەکانیان‌و بەڵێنیان دا کەئەگەر روسەکان یارمەتییان بدەن بۆ رزگاربون لەستەم‌و جەوری عوسمانییەکان، ئەوانیش خزمەتی روسیا دەکەن. بەڵام کاتێك روسەکان داواکەیان رەت کردەوە، کوردەکان داوایان لەروس کرد رێیان پێ بدەن سنور ببەزێنن‌و بچنە ناو خاکی روسیا چونکە لەزوڵم‌و زۆری ئیتتیحادییەکان دەترسن[1]. سالّی ۱۹۱۱ کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقی بەئاشکرا بڕیاریدا زوو تا درەنگ هەمو گروپە ناتورکەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەزۆرو لەرێی بەکارهێنانی زەبروزەنگەوە بکەن بەتورك‌و ئەم بڕیارەش هەموانی گرتەوە[2].

ئیتتیحادییەکان دەستیان بەراوەدونانی لاوانی کوردی پایتەخت کردو کەوتنە داخستنی کۆمەڵەو یانەکانیان. دواتر ئەم راوەدونانە هەمو بەرهەڵستکارە کوردەکانی تەواوی شارەکانی گرتەوە[3].

پاش زیادبونی گوشاری ئیتتیحادییەکان لەسەر کوردو پیادەکردنی سیاسەتی بەتورك کردن[4]، کوردەکان دەستەوەستان نەوەستان بەڵکو هەوڵی زیادکردنی چالاکییەکانی خۆیان داو ئەو بڵاوکراوانەیان بڵاو کردەوە کەگوزارشتیان لەڕاو بۆچونیان دەکرد. لەوانە لەشاری دیاربەکر بڵاوکراوەیەك بەناونیشانی((ئەم خاکە خاکی خۆمانە))بڵاو کرایەوە[5]، ئەمەش بەو مانایە دێ کەکورد دژی سیاسەتی بەتورك کردنەو داوا لەداگیرکەران دەکا خاکەکەی بەجێ بێڵن چونکە ئەم خاکە خاکی کوردانەو جێی داگیرکەری تێدا نابێتەوە. هەروەها شێخ مەحمود لەساڵی ۱۹۱۷دا بۆ وەڵامدانەوەی سیاسەتی ئیتتیحادییەکان پەیوەندیی لەگەڵ کوڕانی بەدرخاندا دامەزراندو لەگەڵ هەر یەك لەکەمال‌و حسێنی کوڕانی بەدرخاندا رێککەوت کەکار بکەن بۆ رزگارکردنی کوردستان لەدەسەڵاتی تورك‌و دامەزراندنی فیدراسیۆنێکی کوردی. لەهەمان کاتدا شێخ مەحمود دەستی بەنامە ناردن کرد بۆ کاربەدەستانی

---

[2] لازاریف، کێشە، ل۲٤٢-٢٤٥.

[3] شریف، عبدالستار، الجمعیات والمنظمات، ص٤٦/ احمد، کمال مظهر، کردستان، ص٩٦.

[4] پێ رەش، بارزان، ص٨٦.

[1] B.A. Yassin.O.P.Cit. p. ٤٠.

[5] احمد، کمال مظهر، کردستان، ص٩٩.

روس سەبارەت بەنایندەی سیاسیی کورد[1] بەڵام روسەکان بەپیر داواکانی شێخەوە نەچون و تەنها لەو چوارچێوەیەدا ئامادە بون کەخزمەت بە بەرژەوەندییەکانیان بکات. هەروەها پەیوەندی لەنێوان کوردو عەرەب دا هاتە دی و کوردەکان هاوسۆزی عەرەبەکانی شام و عیراق[2] و یەمەن بون و لەم بارەیەوە یارمەتیی عەرەبەکانی یەمەنیان داو لەم سەروبەندەدا لەساڵی ۱۹۱۱دا شێخ سەعید، نوێنەری ئیمام یەحیا، هاتە کوردستان و لەگەڵ هێندێ لەسەرخێڵە کوردەکان کۆ بۆوەو لەم روەوە دەست بە کۆکردنەوەی پارە بۆ شۆڕشگێڕانی یەمەن کراو ئەمەش ئیتتیحادییەکانی نیگەران کردو وای کرد پشکنینێکی فراوان بکەن بۆ دۆزینەوەی نوێنەرەکەی ئیمام یەحیاو ئەو سەرانەی کورد کەلەگەڵیدا کۆ بوربونەوە[3].

بەڵام لەماوەی نێوان ۸-۱۹۱۳/۷/۲۳ عەرەبەکان لەپاریس بەسەرۆکایەتی عەبدولحەمید زەهراوی کۆنفرەنسێکیان بەست و چەند بڕیارێکیان دەرکرد لەوانە جەخت کردن لەسەر بەدی هێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ عەرەب و پشتیوانی کردن لەمافەکانی ئەرمەن[4]. بڕیارەکانی کۆنفرەنسەکە ناوی کوردیان تێدا نەهات ئەگەرچی کورد هەمیشە بایەخێکی شایستەی بەمەسەلەی عەرەب داوە.

چالاکیی کورد تەنها لەدژی ئیتتیحادییەکان نەبو بەڵکو جگە لەوە لەحزبەکانی ئۆپۆزیسۆنیش بەشدارییان کرد وەك پارتی ئازادی و ئیئتیلاف کە لەمانگی تشرینی دوەمی ساڵی ۱۹۱۱ دامەزراو دامەزرانەکەی ئەنجامی یەکگرتنەوەی چەند حزبێکی بچوك بو[5]. ئەم حزبە داوای لامەرکەزیەتی دەکردو دەیەویست ویلایەتە عوسمانییەکان لەهەمو بوارەکاندا جگە لەبواری جەنگ دەسەڵاتی تەواویان هەبێ و پەیوەندیی عوسمانچێتی بپارێزرێ و واز لەهەمو سیاسەتە نەتەوەیی و ئاینییەکان بهێنرێ[6]. یەکێ لەسکرتێرە گشتییەکانی ئەم حزبە کورد بو و بەخانی زادە رەواندوزلی ناسرا بو[7]. لەم روەوە زۆر کورد ئەندامی ئەو حزبە بون[8].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ۱۰۷.

[2] جلیلي، جلیل وآخرون، الحركة الكردية، ص۷۲.

[3] لازاریف، کێشە، ل۲٤۰.

[4] عبدالقادر، عصمت، دور النواب، ص۲۲۰-۲۲۱.

[5] سليمان، فيضي، في غمرة النضال، الطبعة الثانية، دار العلم للملايين، بيروت، ۱۹۷٤، ص۸۹.
Chassn. R. Atiyyh, ۱۹۰۸-۱۹۲۱-socio Apolitcal study, Beirut, ۱۹٤۲, PP. ٥۷-٥۸.

[6] عبدالقادر، عصمت، دور النواب العرب، ص۱۷٤.

[7] گفتوگۆ/ چاوپێکەوتن: هاوڕێیانی دکتۆر عوسمان ئەبوبەکر بۆ خوێندکارانی لێکۆڵینەوەی باڵا، ۱۹۹۷.

[8] جلیلي، نهضة الاكراد، ص۷۷/ جلیلي واخرون، الحركة الكردية، ۷۷.

پاش شکستی دەوڵەتی عوسمانی لەساڵی ١٩١١ دا لەلیبیا لەبەردەم ئیتالیاو پاش شکستی لەجەنگدا لەگەڵ بولگارياو يۆنانو سربياو مۆنتينيگرۆ[1] و پاش هاتنە سەرکاری پارتی ئازادیو ئینتیلافو لەساڵی ١٩١٢دا، ئەم حزبە بەڕێزەوە روانییە هەڵوێستی مایەی شانازیی کوردو بەڵێنی بەکورد دا کەهەندێ لەئاواتەکانیان دێنێتە دیو لەم سەروبەندەدا کۆمەڵەیەکی کوردیی دامەزراند کەیەکسەر ١٧٠٠ کەس پەیوەندییان پێوە کردو بونە ئەندام تێیدا، لێبوردنیشی بۆ عەبدولرەزاق بەدرخان دەرکرد چونکە ئەم کابرایە بەکوشتنی بەڕێوەبەری پۆلیسی ئیستانبول لەساڵی ١٩٠٦ تۆمەتبار کرا بوو، هەروەها لێبوردنی بۆ شێخ تەها شەمزینیش دەرکرد. بەڵام ئەم حزبە زۆر لەحوکم نەمایەوە چونکە ئیتتیحادییەکان لەمانگی کانونی دوەمی ساڵی ١٩١٣دا لێی هەڵگەڕانەوەو ئەندامەکانیان لەسەر حوکم لابرد[2].

لەنێوان ساڵانی ١٩١١-١٩١٣دا کورد چەند جوڵانەوەیەکی بەرپا کردو لەم رووەوە دانیشتوانی شاری سێرت نوێنەری ئیتتیحادییەکانیان هەڵنەبژارد بەڵکو حسێن بەدرخانیان هەڵبژارد، هەروەها لەشاری وانیش پشێوی رویدا[3]. لەو هەلومەرجەدا هەندێ لەکوردەکانی کوردستانی باشور ویستیان خۆیان لەروسەکان نزیک بکەنەوەو لەناوەڕاستی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١١دا شێخ محەمەد عەلی سەرۆکی عەشیرەتی تاڵەبانیان بۆ لای یاریدەدەری کۆنسۆلی روس لەبەغدا نارد ئەویش بەنوێنەرایەتی خێڵەکانی داوودەو زەنگنەو هەمەوەند پێشنیاری کرد روسەکان یارمەتیی کوردی باشور بدەن بەرامبەر بەوەی کەببن بەرەعیەتی تزاری روس بەڵام روسەکان بەپیریەوە نەچون[4]. کوردی کوردستانی باکوریش پەیوەندییان بەروسەکانەوە کرد بەڵام هیچ وەڵامێکیان چنگ نەکەوت. لەساڵی ١٩١٢دا هەندێ لەسەرخێڵەکانی ئەرزەڕۆم کۆ بونەوە و لەپرۆژەی سازدانی راپەڕینێکیان کۆڵییەوە بەڵام بەهیچ ئاکامێك نەگەیشتن.

پاش بەزینی ئیتتیحادییەکان لەجەنگی بالکان، بارودۆخی کوردستان شێواو حکومەتی ئیتتیحادییەکان ویستی خۆی لەکورد نزیك بکاتەوە. بەڵام کوردەکان هەوڵی هەڵگیرساندنی راپەڕینێکیان داو پارەو پیتاکیان بۆ کۆ کردەوەو بەو

---

[1] جليلي، جليل وآخرون، الحركة الكردية، ص٧٨/ لازاریف، کێشە، ل٢١٥.

[2] جليلي، جليل وآخرون، المصدر السابق، ص٧٨.

[3] لازاریف، کێشە، ل٢٢٣.

[4] هەمان سەرچاوە، ل٢١٩-٢٢٠.

هیوایشەوە بوون کەروسەکان یارمەتییان بدەن بەلام کۆششەکانیان بەشکست گەیشتن[1].

کوردەکان هەلی شکستی ئیتتیحادییەکانیان لەلیبیاو بالکان نەقۆستەوە، لەکاتێکدا دەبوایە هەلەکە بقۆزنەوەو لەپێناوی ئازادیو یەکگرتن‌دا کار بکەنو رەنگە هۆی نەقۆستنەوەی هەلەکە بگەرێتەوە بۆ پشت بەستنیان بەناکۆکی نێوان بەرژەوەندیو سیاسەتەکانی روسو ئینگلیز[2].

کوژرانی شێخ سەعیدو رووداوەکانی پاشتر

شێخ سەعید لەبنەمالەیەکی ئاینی بەناوبانگ بوو کەدامەزرێنەرەکەی کاکە ئەحمەدی شێخی کوری مەعروف نۆدێیە[3]. شارباژێر ناوچەی نیشتەجێ بونی هەوەل جاری بنەمالەکەیە. پاش کۆتایی هاتنی حوکمرانی بنەمالەی بابان لەسالی ١٨٥١دا، رۆلی ئەم بنەمالەیە دەستی پێ کردو بوو بەیەکێ لەبەهێزترین بنەمالە دەسرۆکانی سلێمانی[4]. شێخ سەعید، بەتایبەتی لەحەفتاکانی سەدەی نوزدەهەمدا، توانی زەوییەکی زۆر لەدەوروبەری سلێمانیدا بکرێو[5] پاش پەرەسەندنی ناوبانگی شێخ لەسلێمانیدا، بەکەیفی خۆی دەستی بەجوجۆل کردو کەوتە دانانی باج لەسەر بازرگانەکانو لەم روەوە لەسالانی هەشتای سەدەی نۆزدەهەمدا باجەکانی زیاد کرد. دەلێن شێخ سەعید لەگەل عیززەت پاشادا لەسەر زیادکردنی باجدا رێککەوتبون تا لەسالی ١٨٨٠دا ئەو باج دانانە گەیشتە ئەوەگ[6].

ئەمەش بوە مایەی بێزاریی بازرگانەکانی سلێمانی، بۆیە خێلی هەمەوەندیان بانگ کردو وایان لێ کرد دەست بەسەر سلێمانیدا بگرێ. ئیدی ئەوسا شێخ درکی بەمەترسی ئەم خێلە لەسەر دەسەلاتو دەسرۆیی، بۆیە بریاری دا خوازێنی کچێکی ئەم خێلە بکاو بەمەش توانی خێلەکە بەلای خۆیدا رابکێشێ[7]. پاش بلاوبونەوەی ناوبانگی شێخ سەعیدو پەرەسەندنی دەسەلاتی، سولتان عەبدولحەمید داوای لێ کرد سەردانێکی بکا لەئیستانبول، ئەویش بەپیر داواکەوە چوو و لەسالی ١٩٠٤دا

[1] بۆ زانیاریی پتر، بروانە: لازاریف، کێشە، ل٢١٩-٢٢٧.

[2] حەسان سەرچلو، ل٢٨٩.

[3] العمري، محمد طاهر، تاريخ مقدرات العراق السياسية، ج٣، بغداد، ١٩٢٥، ص٨.

[4] المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، ترجمة جعفر الخياط، دار الكشاف للنشر والطباعة، ١٩٤٩، ص١٥٠.

[5] الكوراني، رحلة، ص٩٧-٩٨.

[6] الكوراني، نفس المصدر، ص٩٨/ قەزاز، رەمزی، بزوتنەوەی کورد، ل٩٧.

[7] ميجر سون، رحلة متنكر، ج٢، ص٢٤٣.

سەردانی کردو لەئاکامی ئەمەدا پلەو پایەی بنەماڵەکە بەتایبەتی لەلای عوسمانییەکان زیدەتر بوو[1]. لەو سەردانەدا کوڕی خۆی مەحمودو هۆزانقان پیرەمێرد، یاوەری بون[2]. لەوێ سولتان ئەو جەرەیەی پێ دا کەبتوانێ بەهۆیەوە لەکاتی پێویستیدا پەیوەندیی پێوە بکات[3]، ئەمەش وای لێ کرد وەك راوێژکارێکی ئایینی تایبەت بەسولتان بێ[4].

لەوانەیە ئەم بایەخە زۆرە بەو مەبەستە بووبێ کەشێخ بەسولتانەوە ببەسترێتەوە بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتی عوسمانییەکان. پاش گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی، دەسەڵاتی لەجاران زیاتر بوو چونکە سەردانەکە سەنگی قورستر کرد لەبەردەم کارمەندە عوسمانییەکاندا بەرادەیەك کەئەوانیش بونە گوێڕایەڵی‌و کەوتنە رازی کردنی بەڵام ئەمە بوە مایەی بێزاربونی بازرگانان‌و دەرەبەگەکان. پاش رودانی کودەتای ساڵی ١٩٠٨ شێخ زۆر بەمە پەست بوو چونکە دەیزانی نەمانی سولتان عەبدولحەمید گێچەڵی بۆ دەنێتەوە، بۆیە کەوتە هاندانی هەمەوەندەکان نەدژی حکومەتە تازەکەو هەمەوەندەکانیش بەپێی داواکەی شێخەوە چون‌و لەناو شاری سلێمانیدا ئاژاوەو گێرەشێوێنیان نایەوەو کارمەندە عوسمانییەکانیش نەیانتوانی سنورێك بۆ ئەم دیاردە رۆژانەیە دابنێن‌و لەم سۆنگەیەوە کەوتنە نوسینی راپۆرتی نهێنی بۆ موسڵ‌و ئیستانبول بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ ئەم گیروگرفتە[5].

کودەتاکە بۆ نەیارانی شێخ هەلێك بوو دەبوایە بقۆزرێتەوە. بازرگانەکان یاداشتێکیان بۆ ئیستانبول بەرز کردەوەو دانەیەکیش بۆ ناوەندی ویلایەتی موسڵ لەدژی شێخ. ئیدی شێخ بەبیانوی ناردنی بۆ ئیستانبول، بانگ کرا بۆ موسڵ‌و لەژێر سانسۆرێکی توندا لەسلێمانییەوە رەوانەی موسڵ کرا[6]. شێخ لەگەڵ خۆیدا هەردو کوڕەکەی خۆی ئەحمەدو مەحمودو هەندێ لەکەسوکارو پیاوەکانی خۆی بردو هەموویان

---

[1] لبیب، حسین، ولایة للوصل دراسة في تطورها السياسي ١٩٠٨-١٩٢٢، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، ١٩٧٥. ص٨٧.

[2] سەجادی، مێژوی ئەدەبی کوردی، ل٤١٩.

[3] حەفید، شێخ لەتیف، یاداشتەکانی شێخ لەتیف حەفید، ١٩٩٥، ل١٨/ حیلمی، رەفیق، یاداشت، ب١، ل٣٤.

[4] الكوراني، رحلة من عمان، ص٢٤٠.

[5] میجر سون، رحلة، ج١، ص٢٤٤/ حسن، باسم محمد، العراق في العهد الحميدي، ص١٤٢/ احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص٨٧.

[6] بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە، میجر سون، رحلة، ج١، ص٢٤٤/ الارحيم، تطور العراق، ص٩٢-٩٤/ احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص٨٨.

لەماڵی محەمەد پاشا سابونچی لەگەڕەکی سەرای لەتەنیشت ماڵی خدر هەمەوەند دابەزین[1].

ئیتر لەپیلانێکدا شێخ سەعیدو ئەحمەدی کوڕیو چەند پیاوێکی کوژران[2]. بەڵام شێخ مەحمود خۆی لەماڵی خدر هەمەوەند شاردەوەو پاشان چووە ماڵی حاجی محەمەد چەلەبی جادرو لەوێ برایە شوێنێك لەژێر چاودێریی حکومەتدا.

کوژرانی شێخ سەعید لەکوردستاندا بەتایبەتی لەهەردو شاری کەرکوك و سلێمانیدا زۆر دەنگی دایەوەو لەم سەروبەندەدا خێڵی هەمەوەند ئۆقرەی لێ هەڵگیراو پیاوماقوڵانی کەرکوکیش داوایان کرد شێخ مەحمود دەستبەجێ ئازاد بکرێ. ئیتر حکومەتیش لەڕێی هەولێرەوە شێخ مەحمودی بەیاوەریی ئەفسەرێك بەناوی نوری سەعیدەوە[3]نارد بۆ کەرکوك و لەوێدا خەڵکی کەرکوك بەفرمێسکەوە پێشوازییەکی گەرم و گوڕیان لێ کردو ئەویش لەدیوەخانی سەید ئەحمەدی خانەقا دابەزی[4].

لەگەڵ گەیشتنی بۆ کەرکوك خێڵی هەمەوەند ئاژاوەیەکی زۆری لەناو شاری سلێمانیدا نایەوەو والیی موسل داوای لەتۆفیق پاشای موتەسەریفی سلێمانی کرد شارەکە بەجێ بێڵێ و بچێ بۆ بەغدا بەڵام تۆفیق پاشا نەیتوانی لەشار بچێتە دەرێ. پاشان رەشید پاشای والیی موسل چوە سلێمانی و شەوێکی تێدا مایەوەو پاشان دەمو دەست روی کردە کەرکوك و شێخ مەحمودی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ سلێمانی بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە. پاش گەیشتنی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی ماتەمینی بۆ شێخ سەعیدو یارەرەکانی دانار سەرۆکایەتیی بنەماڵەکەی کرد[5]. لەم مەسەلەیشدا ئەوەی دەستیان لەکوشتنی شێخ سەعیدو کوڕەکەیو هەندێ لەیاوەرەکانیان هەبو، درانە دادگا[6]. هەروەها شێخ مەحمودیش پاش ئەوەی گەڕایەوە بۆ سلێمانی، کەوتە راونانی بازرگانەکان، بۆیە بازرگانەکان لەلای والی موسل شکاتیان لێ کردو لەم سۆنگەیەوە

---

[1] الغلامي، عبدالمنعم، الضحايا الثلاث، الموصل، ١٩٥٥، ص٦/ قەزاز، رەمزی، بزوتنەوە، ل٩٨.

[2] بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بەڕوداوەکە، سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: الغلامي، الضحايا الثلاث، ص١٩-٢١/ حیلمی، رەفیق، یادداشت، بەشی یەکەم، ل٢٩-٤٢/ حەفید، شێخ لەتیف، یادداشتەکانی شێخ لەتیف، ل١٨-١٩/ احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص٨٨-٩٠/ العراق في الوثائق البريطانية، ص٧٠.

[3] لەوانەیە ئەم ئەفسەرە هەمان ئەو سیاسەتمەدارە بەناوبانگەی عێراق بێ کە لەسەردەمی رژێمی پاشایەتیی عێراقدا رۆڵی گەورەی هەبوو و لەساڵی ١٩٥٨دا لەکودەتاکەی سوپادا کوژرا. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی نوری سەعید، بڕوانە: النصيري، عبدالرزاق احمد، نوري السعيد ودوره في السياسة العراقية، ص١٩٨٧.

[4] حەفید، شێخ لەتیف، یادداشتەکان، ل١٩-٢٠.

[5] میجەر سون، رحلة، ج١، ص٢٤٥.

[6] بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە، الغلامي، الضحايا الثلاث، ص٣١-٣٣/ حیلمی، رەفیق، یادداشت، بەشی یەکەم، ل٤٧/ احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص٩٢-٩٣.

کاربەدەستان لەموسڵەوە نوێنەرێکیان بۆ لێکۆڵینەوە نارد بۆ سلێمانی. نوێنەرەکە لەگەڵ هەردولادا بەجیا دانیشتو پاشان راپۆرتێکی نارد تێیدا باسی کردبو کەئۆباڵی کێشەکە لەملی بازرگانەکانەو لەملی شێخ نیەو لەم سۆنگەیەوە حاکمێکی پتەوو تۆکمە بۆ سلێمانی نێردرا[1]. بەڵام ئەو سەربازانەی لەگەڵ حاکمەکەدا هاتبون، کەوتنە ئازاردانی خەڵکی شارو لەم سۆنگەیەوە شێخ مەحمودیش داوای کرد خێڵی هەمەوەند بەفریایەوە بچن. ئیدی چەکدارەکانی هەمەوەند رژانە ناو شار بەڵام لەباتی ئەوەی ئاسایش بپارێزن بونە هۆی زیادکردنی پشێوی‌و ئاناراميو تالانو برۆ[2].

خێڵی هەمەوەند لەوەڵامی کوژرانی شێخ سەعیدی زاوای، کەوتە ئەنجامدانی زۆر کردەوە وەك برینی رێی گشتی نێوان سلێمانیو کەرکوكو هێرش کردنە سەر بارەگای پۆلیسی قەرەداغ لەساڵی ۱۹۰۹داو پاشان لەگەڵ ئەو هێزانەی حکومەتیش بەشەر هاتن کەلەچەمچەماڵەوە هەڵیانکوتابوە سەریان. لەئاکامدا هەمەوەندەکان کوردستانی باشوریان بەجێ هێشتو چون لەناوچەی رەهاو نیشتەجێ بونو ماوەیەکیان لەوێ گوزەراند تا لەدواییدا، ناظم پاشای والیی بەغدا لەساڵی ۱۹۱۰دا لێبووردنی بۆ دەرکردنو رێی پێ دان بچنەوە شوێنەکانی خۆیان لەکوردستانی باشوردا.

پاش لابردنی ناظم پاشا لەویلایەتی بەغدا لەساڵی ۱۹۱۰دا، هەمەوەندەکان دیسان کەوتنە ئاژاوەنانەوە[3]. لەو کاتەدا کونسوڵی بریتانیا لەکرماشان داوای لەکونسوڵی بریتانیا لەبەغدا کرد زانیاریی دەربارەی شێخ مەحمود بۆ بنێرێ. ئەویش بۆی نوسی((ناوبراو کوڕی شێخ سەعیدە کە لەکانونی دوەمی ساڵی ۱۹۰۹ لەموسڵ کوژراو رەنگە ئەم کابرایە(واتە شێخ مەحمود) دەستی هەبێ لەیاخیبونی ئێستای خێڵە کوردەکانی هەمەوەند))[4].

ساڵی ۱۹۱۳ شێخ مەحمود پەیوەندیی لەگەڵ کوڕانی بەدرخاندا دامەزراند لەوانە: حسێن لەجزیرەو لەم روەوە شێخ بەتەمای پێکهێنانی حکومەتێکی فدرال بوو. جگە لەوە نامەیەکیشی بۆ هۆنی یاریدەدەری کونسوڵی بریتانیا لەموسڵ نارد. هەروەها شێخ پەیوەندیی لەگەڵ کونسوڵی گشتیی بریتانیا لەبەغدا، جۆن لۆریمەر، هەبو. شێخ

[1] لەزاز، رەمزی، بزوتنەوە، ل٩٦.
[2] الكوراني، رحلة من عمان، ص٩٩.
[3] بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: زكي، تاريخ السليمانية، ص٩٥-٩٧/ الارحيم، تطور العراق، ص٩٢.
[4] بەڵگەنامەیەکی بڵاونەکراوە.

بەپێچەوانەی کوردەکانی کوردستانی باشورەوە کەدڵخوازی یارمەتی روسیا بون، چاوی لەیارمەتی بریتانیا بوو[1].

بـەپێی بەڵگەنامەیـەك دەردەکـەوێ کەحکومـەتی بریتانیـا بـەهۆی راپۆرتـەکانی کۆنسۆلگەکانیەوە، هیچ ئومێدێکی بەبزووتنەوەکەی حسێن پاشای بەدرخان زادەی جزیرەو سەید تایەر(سەید تەها شەمزینی؟)و عەبدولرەحمان رەزاق بەگ نەبو. دیارە هەر ئەمەش هۆی گواستنەوەی برای حسێن پاشا بوە لەپۆستی مەکتوبچی ویلایەتی موسلەوە بۆ موتەسەریفی شاری تەعز لەیەمەن. مستەر هۆنی جێگری کۆنسۆلی بریتانیا لەموسل پێشبینی هیچ گۆڕانکارییەکی لەبزوتنەوەی کورد نەدەکرد[2].

بەپێی دۆکیۆمێنتەکەی سەرەوە دەردەکەوێ کەحکومەتی بریتانیا بەنیاز نەبوە یارمەتیی کورد بدات، لەبەر ئەوە دەبینین شێخ مەحمود پاش ئەوەی لەحکومەتی بریتانیا بێ ئومێد دەبێ، لەتابی ۱۹۱۲دا نوێنەری خۆی دەنێرێتە لای کونسۆلی گشتیی روس لەبەغدا بۆ ئەوەی ئەم پرسیارەی لێ بکا: ئایا ئەگەر کورد راپەڕی، حکومەتی روس چ هەڵوێستێکی بەرامبەر بەکورد دەبێ؟ بەڵام روسەکان وەڵامی شێخیان نەدایەوە[3]. هەروەها شێخ نوێنەری خۆی سەید محەمەد نارده لای کۆنسۆلی روس لەموسل، کیسانۆڤ، بەو ئومێدەی کەقەناعەتی پێ بێنێ کەشێخ لەتوانایدایە پەنجا هەزار شەڕکەر بۆ ئەنجامدانی راپەڕین کۆ بکاتەوە. شێخ دەیویست بزانێ کەئەگەر ئەمە رویدا، روسیا چیان بۆ دەکا. کۆنسۆل وتی: ئەگەر کورد راپەڕینی ساز کرد، ئێمە حەز دەکەین یارمەتییان بدەین. ئەگەر بڕوانینە ئەم وەڵامە، هەست دەکەین وەڵامێکی پڕ تەمومژەو بەو مانایە دێ کەزەحمەتە یارمەتیی کورد بدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شێخ لەساڵی ۱۹۱٤دا دیسان هەوڵی دایەوەو ئەمجارەش سەید محەمەدی بۆ لای کۆنسۆلی روس لەموسل نارد، بەڵام ئەمجارەش روسەکان بەپیری داواکەیەوە نەچوون[4].

لەمەوە دەردەکەوێ کەشێخ مەحمود لەهەوڵدانیدا بۆ وەدەست هێنانی یارمەتیی بێگانە، بەتایبەتی روسیاو بریتانیا، هیچ دیدێکی تەنگبینی بۆ مەسەلەکان نەبوە بەڵام ئەم دو دەوڵەتە بەپیری داواکانیەوە نەچوون.

---

[1] لازاریف، کێشە، ل۳۲۳-۳۲٤.

[2] بەڵگەنامەیەکی بڵاونەکراوە.

I.O.P. Lip ٨ s/١٠١١٨٨

[3] لازاریف، کێشە، ل۳٦۳.

[4] لازاریف، کێشە، ل۳۲٤، ۳۳٥، ۳٤١.

## رۆڵی شێخ عەبدولسەلام بارزانی

بنەماڵەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی پایەی ئاینی دیاری خۆی هەبو. ناوی ئەم بنەماڵەیە لەناوی ئەو گوندەوە هاتووە کەتێیدا ژیاون، واتە گوندی بارزان[1] کە کەوتۆتە نێوان رواندز لەرۆژهەلاتداو نامێدی لەرۆژئاواداو نێوان زێی گەورە لەباشورداو سنوری تورکیا لەباکوردا[2]. شێخ عەبدولسەلام پاش کۆچی دوایی باوکی، شێخ محەمەد، لەساڵی ۱۹۰۳دا سەرۆکایەتیی بنەماڵەکەی کردو لەناوچەی بادیناندا نفوزێکی زۆری پەیدا کرد. سدیق دەمەللوجی[3] کەکاتی خۆی چاوی بەشێخ عەبدولسەلام کەوتبو، وتویەتی ((کابرایەکی بیر تیژە. تەنها کەموکوڕی ئەوەیە کەخوێنەوار نیەو لای من باسی ئەوەی دەکرد کەزۆر پێی ناخۆشە لەزانست بێ بەش بوە، لەکاتێکدا باوكو باپیری لەزاناکان بون)).

شێخ لەو ناوچەیەی کەحەڵی دەسوڕاند زۆر ریفۆرمی کرد لەوانە دابەشکردنی زەویو زار بەسەر جوتیارەکاندا، رێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو نەهێشتنی پارەی مارەییو بەزۆر بەشودانی کچ. لەهەر گوندێکیش کەلایەنگرەکانی تێدا بوو، مزگەوتێکی دروست کردو ئەنجومەنێك بۆ مشورخواردنی کاروباری گوندەکەو لەهەر عەشیرەتێکیش هێزێکی چەکداری پێك هێنا[4]. شێخ پێی وابو نەزانی، یەکێکە لەهۆیە گرنگەکانی بەجێمانی کورد، لەبەر ئەوە بایەخی بەکردنەوەی خوێندنگە دا[5]. بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی تەعاونو تەرەقی کوردو کۆمەڵەی هیڤی لەیەکەم دەیەی سەدەی بیستەمەوە دەگەیشتنە ناوچەی بارزان، شێخ هاوسۆزی کۆمەڵە کوردییەکانو پشتیوانی پرۆگرامەکانیان بوو[6]. بەمجۆرە بزوتنەوە بارزانییەکان دوراییەکی نەتەوەییان وەرگرتو ئەم روخسارەش دەچێتەوە سەر ساڵانی پێش کودەتای ساڵی ۱۹۰۸و لەم روەوە شێخ عەبدولسەلامو چەند رابەرێکی تر لەساڵی

---

[1] البارزاني، مسعود، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج١، ١٩٨٦ ص١٦/ هەزەکانی کورد، بەشی دووەم، وەرگێرانو ئامادەکردن حسێن جاف، بەغدا، ١٩٩٢، ل٣٤.

Sykes, Mark, The Caliphs last Heritage, London, ١٩١٥, p.٥٩.

[2] البارزاني، مسعود، المصدر السابق، ص١٧/ مصطفى، حسن، البارزانيون وحركة بارزان ١٩٣٢-١٩٤٧، بيروت، ١٩٦٣، ص٢٠.

[3] الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص٩٠.

[4] البارزاني، مسعود، نفس المصدر، ص١٨.

[5] البارزاني، عبدالمصور، حماية الاكراد، ص٩٠.

[6] الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص٩٥/ الضابط، شاكر، تاريخ الصداقة بين العراق وتركيا، ص٩٢.

١٩٠٧دا گەشتێکیان بەناوچەی بادیناندا کرد[1] و رویان کردە تەکیەی شێخ نور محەمەد بریفکانی رابەری تەکیەی قادری لەگوندی بریفکانی سەر بەدهۆك. لەوێ کۆبونەوەیەکیان گرێ دا بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکێك بۆ گروپەکەیان تاکو لەگفتوگۆکاندا لەگەڵ فەرمانگە حکومییەکاندا نوێنەرایەتییان بکاو بەناوی خێڵەکانەوە قسە بکات. لەم سەروبەندەشدا شێخ نور محەمەدیان هەڵبژارد بەڵام ئەو لەبەر خراپیی باری تەندروستی داوای لێبوردنی کرد کەکارەکەی پێ ئەنجام نادرێ‌و پێشنیاری کرد شێخ عەبدولسەلام ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ. لەو کۆبونەوەیەدا ئامادەبووان یاداشتێکیان بۆ حکومەتی عوسمانی بەرز کردەوەو چەند کۆپیەکیان لێ نارد بۆ ئەنجومەنی پیران‌و مەبعوسان‌و شێخ عەبدولقادر نەهری‌و جەنرال شەریف پاشاو ئەمین عالی بەدرخان[2].

یاداشتەکە ئەم داوایانەی لەخۆ گرتبو:

یەکەم: زمانی کوردی زمانی رەسمی بێ لەناوچەی بادینان‌دا.

دوەم: خوێندن بەزمانی کوردی بێ لەخوێندنگەکاندا.

سێیەم: کاربەدەستە گەورەکانی قائیمقامەکان‌و بەڕێوەبەرەکانی ناحیەکان لەو کەسانە بن کەزمانی کوردی دەزانن تاکو راستەوخۆ لەدانیشتوانە خۆماڵییەکان بگەن.

چوارەم: ئەحکام بەپێی شەریعەتی ئیسلام بێ.

پێنجەم: قازییەکانی ناوچەکە لەمەزهەبی شافعی بن.

شەشەم: باج بەپێی شەریعەتی ئیسلام لەدانیشتوان وەربگیرێ.

حەوتەم: باجی بەدەلی خزمەتی سوپایی وەکو خۆی بمێنێتەوە بەمەرجێك پارەکە بۆ چاککردنی رێوبانی ناوچەکە تەرخان بکرێ[3].

ئەم دیکۆمێنتە بەدیکۆمێنتێکی ریفۆرمخواز دەژمێردرێ کەداخوازییەکانی ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستانی لەخۆ گرتوەو بایەخێکی مێژویی تایبەتی هەیەو بەو مانایە دێ کەکورد بەتایبەتی پاش کودەتای سالی ١٩٠٨ دەستیان بەباسکردنی داخوازییە نەتەوەییەکانی خۆیان کردو لەم روەشەوە زۆر هۆشیار بون‌و زۆر درکیان بەو زوڵم‌و زۆرە کردبو کە لەسەردەمی حوکمڕانی عەبدولحەمیددا دوچاری بووبوون.

[1] البارزاني، مسعود، نفس المصدر، ص١٩.

[2] زیاتر بیر بۆ ئەوە دەچن کەئەم یاداشتە پاش کودەتای سالی ١٩٠٨ نوسرابێ نەك لەسالی ١٩٠٧دا چونکە یاداشتەکە ناوی ئەنجومەنی پیران‌و مەبعوسانی تێدا هاتوە، ئەم دو ئەنجومەنەش لەسالی ١٩٠٧دا لەئارادا نەبون.

[3] الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، هامش ص٩٦/ البارزاني، مسعود، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج١، ص١٩/ يێ رەش، بارزان، ص٩٩/احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص٩٦/ البارزاني، عبدالمصور، حماية الاكراد، ص٩.

جگە لەوە دیکۆمێنتەکە بانگەوازێکی ئاشتییانە بوو بۆ ریفۆرم. بەڵام حکومەتی ئیتتیحادییەکان تەنها بەوە دانەکەوت کەوەڵامی یاداشتەکە نەداتەوە بەڵکو بەهەنگاوێکی مەترسیداریشی دایە قەڵەم رووە سەربەخۆیی، بۆیە هەر لەسەرەتاوە بڕیاری دا سنوورێك بۆ جموجۆڵەکانی شێخ عەبدولسەلام دابنێت. والیی موسل محەمەد فازل داغستانی هێزێکی پشت بەستو بەتۆپخانەی بۆ گرتنی شێخ عەبدولسەلام ناردو باری نائاساییشی راگەیاند[1]. ئەو هێزەش پێشوەخت بۆ سەرکوت کردنی جموجۆڵەکانی خێڵی هەمەوەند ئامادە کرابو بەڵام ئەمجارە بۆ دژایەتی کردنی شێخ عەبدولسەلام سودی لێ وەرگیرا[2]. سوپا لەرەوتی ئۆپەراسیۆنەکانیدا چەندەها گوندی وێران کرد لەوانە گوندی بارزان‌و لەئاکامدا شێخ کشایەوەو داوای وتووێژی کرد بەڵام داغستانی داواکەی رەت کردەوەو پاش ماوەیەك شێخ عەبدولسەلام گەڕایەوەو هێرشی سەختی کردە سەر ئەو هێزەی لەبارزان مۆڵ درابوو و زیانێکی کاریگەری پێ گەیاند[3]. دواتر هێرشی کردە سەر ئۆردوگای ئاکرێ‌و لەو کاتەدا نازم پاشا کرایە والیی بەغدا، ئەویش سیاسەتێکی نەرمی لەگەڵ کورددا پیادە کردو لێبووردنی بۆ شێخ عەبدولسەلام دەرکردو بڕی هەزار لیرەی وەك قەرەبوی زیان پێ دا. پاشان شێخ عەبدولسەلام لەبارزان نیشتەجێ بۆوەو پاش ئەوەی ئەسعەد پاشا بوە والیی موسل بەوەکالەت لە٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٢دا، پێشنیاری بۆ حکومەتی عوسمانی کرد کەمەدالیای پلەی سێی جۆری مەجیدی پێشکەش بەشێخ بکرێ، حکومەتیش رەزامەندیی نیشان دا[4]. بەڵام کاتێك سلێمان نەزیف کرایە والیی موسل، دژی پێشکەشکردنی مەدالیاکە بەشێخ وەستا[5]. لێرە بەدواوە پەیوەندیی نێوان والیی تازەو شێخ گرژییەکی زۆری بەخۆوە بینی بەتایبەتی پاش کوژرانی وەزیری جەنگ نازم پاشاو گەڕانەوەی ئیتتیحادییەکان بۆ سەر دەسەڵات پاش لابردنی گروپی پارتی ئازادی‌و ئیئتیلاف. لەم رووەوە سەفوەت بەگ بەوە گوناهبار کرا کەسەدری ئەعزەم محەمەد شەوکەتی کوشتووە لەم سەروبەندەشدا سەفوەت هانای بۆ شێخ عەبدولسەلام

---

[1] الدملوجي، صديق، المصدر السابق، ص٩٧.

[2] العراق في الوثائق البريطانية، ص٧١.

[3] رۆژنامەی((صدى بابل)) ژمارەی رۆژی ١٠/٩/١٩٠٩. وەرگیراوە لە: احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص٩٩.

[4] الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص٩٨/ احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص١٠٠.

[5] الدملوجي، صديق، المصدر السابق، ص٩٨. لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەسلێمان نەزیف کوردی دیاربەکر بوو و دایکیشی ئێزدی بوو، کەچی یەکێ بوو لەتوندڕەوترین لایەنگرانی بەعوسمانیی تورانی. لەو رووەوە بڕوانە بۆ سەر: الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص٩٨-٩٩/ هەروەها: القلامي، عبدالمنعم، الضحايا الثلاث، ص٣٩.

بردو شێخیش داڵدەی دا. کاتێك سلێمان نەزیف داوای سەفوەتی کرد، شێخ رازی نەبو بیداتەوە چونکە نەریتی خێڵەکی رێ بەدانەوەی لێقەوماوان نادا[1]. ئیدی هەر لەو کاتەدا حکومەت بەرێژەی ٢٥٪ باجی زیاد کردو رایگەیاند کەنیازێتی روپێوێکی گوندەکانی ناوچەکانی بارزان بکاو ئامارێك سەبارەت بەگاو گۆتاڵەکانی ئامادە بکات[2].

لەناوەڕاستی ئازاری ساڵی ١٩١٤دا عوسمانییەکان سوپایان بۆ ناوچەکانی شێخ لەرواندز، ئاکرێو ئامێدی نارد[3]، ئیدی شێخ خۆی لەبەردەم ئەو هێزە گەورەیەدا رانەگرتو پەنای بۆ ئێران بردو لەگوندی راژانی نزیك ورمێ بوە میوانی سەید تەها نەهری[4].

لەوێ ئیسماعیل ئاغای شکاکی ناسراو بەسمکۆ ناسی. لەم سەروبەندەدا حکومەتی عوسمانی پاداشتی بۆ ئەو کەسە دانا کەشێخ عەبدولسەلام بەزیندویی یان مردویی دەگرێ. شێخ لەئێرانەوە پەیوەندیی بەروسەوە کردو پێدەچێ ئەو پەیوەندییە بەنهێنی بووبێ بەڵام پەیوەندییەکە هیچی لێ سەوز نەبو[5].

جێی سەرنجە کەکورد بەدرێژایی مێژو بەدەگمەن خێری لەروسەکان دیوە چونکە کورد زۆر جار پەیوەندیی پێوە کردونو داوای کۆمەكو یارمەتیی لێ کردون کەچی هەڵوێستی روسەکان سەرەڕای ململانێی روسیا- دەوڵەتی عوسمانی هەمو جار نێگەتیڤانە بوە.

کاتێك شێخ عەبدولسەلام لەسەردانی سمکۆ گەڕایەوە، سۆفی عەبدوڵڵا تکای لێ کرد لای بمێنێتەوە، شێخیش رازی بوو و پاشان سۆفی خیانەتی لێ کردو بۆ وەرگرتنی پاداشتەکە تەسلیم بەکاربەدەستانی عوسمانی کرد[6]. لەم سەروبەندەدا شێخ ئامادەیی خۆی دەربڕی کەچیتر گرفت بۆ دەوڵەتی عوسمانی نەنێتەوەو هەزار ئێستر بەبارەوە بدا بەدەوڵەت، بەڵام سلێمان نەزیف ئەمەی رەت کردەوەو داوای لەپیاوەکانی کرد تەقە

---

[1] الغلامي، المصدر السابق، ص٤٢.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٠٠.

[3] البارزاني، عبدالمصور، حماية الاكراد، ص٩.

[4] الغلامي، الضحايا الثلاث، ص٤٥/ البارزاني، مسعود، البارزاني والحركة التحررية، ج١، ص٢٠-٢١.

[5] بۆ زانیاریی پتر دەربارەی پەیوەندییەکانی شێخ لەگەڵ روس دا، بڕوانە: جیاروك، معروف، مأساة بارزان المظلومة، بغداد، ١٩٥٤، ص٥٥/ البارزاني، مسعود، البارزاني والحركة التحررية، ج١، ص٢٠/ پین ڕەش، بارزان، ص١٣٦/ لازاریف، کێشە، ل٢٧٩.

[6] بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: الغلامي، الضحايا الثلاث، ص٤٧/ البارزاني، مسعود، المصدر السابق، ص٢١/ پین ڕەش، بارزان، ص١٢٨.

لەشێخ بکەن گوایە لایەنگرانی شێخ گێچەڵیان ناوەتەوەو هاتون ئازادی بکەن. ئیدی بەجۆرە سلێمان نەزیف بەبێ ئەوەی رەزامەندیی کاربەدەستانی بالآی ئیستانبولیشی پێ بگات، شێخ عەبدولسەلامی کوشت[1].

ئەو بزوتنەوەیەی کەشێخ عەبدولسەلام رابەرایەتی کرد، بەڵگەی پەیدابونی ئاستێکی بەرزترە دیاریکراوی هۆشیاریی کوردایەتییەو ئاماژە بۆ پەرەسەندنی ئەو هۆشیارییە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا دەکا.

بزوتنەوەی برایم پاشای میللی

ناوی تەواوی برایم پاشای میللی برایمی کوڕی مەحمودی کوڕی تیمارییە، سەرۆکی خێڵەکانی میللی[2] و یەکێ لەدەوڵەمەندە عوسمانییەکان بوو[3]. دەسەڵاتێکی فراوانی لەناوچەکانی نێوان ئەرزنجان و دێرتەلزور هەبو. ساڵانە بایی ٢٠٠ هەزار لیرە دیاریی بۆ کۆشکی یەلدزی سوڵتان دەنارد[4] و هەم بەسەر خێڵەکانی کورددا دەسەڵاتی دەشکا هەم بەسەر خێڵەکانی عەرەبداو بارەگاکەی وێران شار بوو[5]. خەڵکی لەسوڵتان زیاتر رێزیان لێ دەگرت و لەباتی ئەوەی باج بەدەوڵەت بدەن، باجیان بەو دەدا[6]. خەڵکی بەئارامیی و بەبێ ترس لەناوچەکەیدا دەژیان و بەوەی کەکابرایەکی ئازا بوو توانیبوی خۆشەویستی سوڵتان عەبدولحەمید مسۆگەر بکات. برایم پاشا لەمیلیشیاکانی سوارەی حەمیدیەدا پلەی میرمیرانی هەبوو[7] و کاتێک حکومەتی عوسمانی دەستی بەکوشتاری ئەرمەن کرد، ئەو بەشداریی تێدا نەکردو تەنانەت دە هەزار ئەرمەنی لەمردن قورتار کرد[8].

برایم پاشا لەساڵی ١٨٩٧دا بەشداریی لەجەنگی یۆناندا کردو پاشان سوڵتان بۆ پایتەختی بانگ کرد، ئەویش بە٤٠٠ چەکدارەوە چوو، لەوێ نازناوی پاشایەتی پێ بەخشرا[9]، کوڕەکانیشی پلە قایمقامیان پێ درا بەڵام کاتێک داوای لێ کرا بچێ بۆ

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: الفلامي، الضحايا الثلاث، ص٤٩/ الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص١٠٢/ البارزاني، مسعود، المصدر السابق، ص٢١.

[2] زكي، مشاهير، ص٥٨/ ابوبكر، احمد عثمان، اكراد الملي، ص٢٥.

[3] ابوبكر، احمد عثمان، اكراد الملي، ص٢٧/ عبدالكريم بهجت، نبذة تاريخية عن حياة ابراهيم باشا الملي، مخطوطة رقم ٢١٠ في المكتبة المركزية العامة في الموصل، ورقة ٤ (لێرە بەدواوە: عبدالكريم بهجت، المخطوطة).

[4] عبدالكريم بهجت، المخطوطة، ورقة ٤/ ابوبكر، احمد عثمان، اكراد الملي، ص٤٨.

[5] وێران شار کەوتۆتە نێوان رەها و ماردین. بڕوانە: زكي، خلاصة، هامش ص٢٢٢.

[6] لازاریف، کێشە، ل١٨٣.

[7] زكي، خلاصة، ص٢٥٦/ زكي، مشاهير، ج١، ص٥٨

[8] ابوبكر، احمد عثمان، اكراد الملي، ص٣٨.

[9] ابوبكر، احمد عثمان، اكراد الملي، ص٢٧-٢٨. وەرگیراوە لە: مارك سايكس/ سەجادی، شۆڕشەکانی کورد، ل٢٢.

یەمەن بۆ شەڕی یاخیبوەکان، نەچوو[1]. وردە وردە نێوانی لەگەڵ کاربەدەستانی عوسمانیدا گرژیی تێکەوت و گەیشتە ئەو ئاستەی کەهەستی کرد چیدی ناتوانێ لەگەڵ کارمەندە عوسمانییەکاندا هەڵ بکات، بۆیە لەسالآنی ١٩٠١-١٩٠٤دا بزوتنەوەکەی خۆی راگەیاندو لەم سۆنگەیەوە لەماوەی سالآنی نێوان ١٩٠٦-١٩٠٧دا بوە دەسەلآتداری ناوچەی حەلەب و ئورفەو ماردین و لەسالی ١٩٠٧دا دیاریەکری گەمارۆ دا. سەرەڕای ئەمە، سولتان عەبدولحەمید خۆی لێ بێدەنگ کردو سزاشی نەداو ئەویش بەردەوام دیاریی بۆ سولتان دەنارد، لەوانە برێکی زۆر رۆن[2]. دەشێ ئەم جولآنەوەیە لەدژی سولتان عەبدولحەمید نەبووبێ بەلکو تەنها دژی کاربەدەستان و رەفتاریان بووبێ.

سالی ١٩٠٨ ماوەیەکی کەم بەر لەوەی کودەتاکە بقەومێ، داوا لەبرایم پاشا کرا بچێ بۆ حیجاز بۆ لێدانی ئەو خێلە عەرەبانەی دژی راکێشانی هێلی شەمەندەفەر بون بەلآم لەو ماوەیەدا کودەتاکە قەوماو برایم پاشا خۆی و ٥٠٠٠ کەس لەدیمەشق بوون. ئیدی ئیتتیحادییەکان زۆر بەگەرم و گوڕی پێشوازییان لێ کرد بەلآم بۆسەشیان بۆ نابۆوە تاکو بیکوژن. هەردو باڵیۆزخانەی بریتانیاو فەرەنسا لەئیستانبول ئاگاداری نیازو مەرامی ئیتتیحادییەکان بون لەدژی برایم پاشاو بروسکەیان بۆ کۆنسولگەی خۆیان لەدیمەشق کرد تاکو ئاگاداری بکەنەوە بۆ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێ. کاتێك برایم پاشا سەردانی بارەگای هەردو کۆنسولگەی کرد، هەواڵەکەیان بۆ پشت راست کردەوە، ئەویش بەم هەواڵە شڵەژاو هەندێ لەپیاوەکانی خۆی بۆ وێران شار نارد بۆ ئەوەی کوڕەکانی لەنیازی ئیتتیحادییەکان ئاگادار بکاتەوەو بیری لەگەڕانەوە کردەوە.

هەردو کۆنسولگە بۆ برایم پاشایان رون کردەوە کە سبەی والی و سوپا بۆ چا خواردنەوە بانگهێشتی بارەگای حکومەتی دەکەن گوایە پێش ئەوەی بچێ بۆ حیجاز بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی دەیانەوێ خواحافیزیی لێ بکەن، ئنجا لەوێ دەیگرن و ئامۆژگاریشیان کرد کە بەتەنها نەچێ بەلکو خۆی و چەکدارەکانی بچن و هەرگیز لەئەسپەکەی خۆی دانەبەزێ. ئیدی ئەویش وای کردو دانەبەزی، بەجۆرە رێسی ئیتتیحادییەکان بۆوە بەخوری و پلانەکەیان سەری نەگرت. بەلآم حکومەتی ئیتتیحادییەکان بەهێزێکی ٦٠ هەزار کەسی و بەپالپشتی ٣٥ تۆپ کەوتە هێرش کردن بۆ سەر وێران شارو پاش شەڕێکی سەخت شارەکە گیراو کوشتارێکی زۆری تێدا

---

[1] ابوبكر، احمد عثمان، اكراد الملي، ص٤٧/ لازاريف، كێشە، ل١١٤.

[2] لازاريف، كێشە، ل١٨٤-١٨٥/ جليلي، جليل وآخرون، الحركة الكردية، ص٥٦.

کرا. کاتێك برایم پاشا گەڕایەوە، شارەکەی وەرگرتەوە بەڵام هێزە عوسمانییەکان هێزێکی بەربڵاوو پشت ئەستور بون بەچەکی قورس، سەرباری ئەوەی کەچەکدارەکانی برایم پاشا بەهۆی دژواریی ڕێگاوە ماندوو و شەکەت بون، بۆیە ئیتتیحادییەکان توانییان جارێکی تر شارەکە بگرنەوە[1]. دواتر تینییان بۆ برایم پاشا هێنا، ئەویش لەشارەکە کشایەوە، ڕوی کردە چیای عەبدولعەزیزو لەوێ مرد. ئەم چەشنە ڕوداوانە ئاماژەیەك بون بۆ ئەو سیاسەتەی کەدواتر ئیتتیحادو تەرەقی بەرانبەر بەکوردی پیادە کرد.

شەریف پاشا

شەریف پاشا یەکێ لەسەختترین بەرهەڵستکارانی سیاسەتی گروپی ئیتتیحادو تەرەقی بوو. کوڕی سەعید پاشای وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی بوو[2]، لەبنەماڵەی خەندانی شاری سلێمانی بوو. ساڵی ١٨٩٥ شەریف پاشا باڵیۆزی دەوڵەتی عوسمانی بوو لەسوید[3].

لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٠٩دا شەریف پاشا لەفەرەنسا حزبێکی بەناوی پارتی رادیکالەوە دامەزراند کەبارەگاکەی پاریس بوو و لەوێ بەزمانی فەرەنسی گۆڤاری مەشروتیەتی (Mechroutiette)لە١٥/١٠/١٩٠٩ دەرکرد کەهەوەڵ جار ژمارەی لاپەڕەکانی ٤ لاپەڕە بوو و دواتر لە١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٠وە بوو بە٥٠ لاپەڕە[4].

شەریف پاشا لەرۆژنامەکەیدا هێرشی توندی کردە سەر سیاسەتی ئیتتیحادییەکان بەتایبەتی سیاسەتیان بەرانبەر بەئەرمەنەکان[5]. لەژمارە ٤٧ی ساڵی ١٩١٣دا شەریف پاشا پیرۆزبایی لەگۆڤاری((ڕۆژی کورد)) کردو خۆشحاڵیی خۆی بۆ دەرچونی دەربڕی و بەم بۆنەیەشەوە پیرۆزبایی لەهەمو ڕۆڵەکانی گەلی کورد کرد. لەرۆژنامەی مەشروتیەت ٥٥ ژمارە دەرچوو و لەمانگی شوباتی ساڵی ١٩١٤دا دوایین ژمارەی لێ دەرچوو[6].

---

[1] عبدالکریم بهجت، للخطوطة، ورقة ٤/ بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: ابوبکر، احمد عثمان، اکراد الملي، ص٤٨-٥٤.
[2] پیرباڵ، فەرهاد عومەر، شەریف پاشا، گۆڤاری یەکگرتن، ژمارە ١٢، کۆینهاگن، ١٩٩١، ل١٠٠-١٠٤.
[3]-Chris Kutschera: Le mour ment notional kulde, ed flammarion, paris, ١٩٧٧, p.٢٤.
[4] پیرباڵ، فەرهاد، گۆڤاری مەشروتیەت، گۆڤاری رامان، ژمارە ١٥، ئەیلولی ١٩٩٧، ل٣٧.
[5] لازاریف، کێشە، ل٤٦٧.
[6]G.Groc. b.Goglar, La presse francaise en Turcuie, ed- isis. Istanbul, ١٩٨٥.p.١٩٤.

## ڕاپەڕینی ساڵی ١٩١٣ی بتلیس

شاری بتلیس لەکۆنەوە ناوەندی کوردایەتی بوو و دەرکەوتنی شەرەف خان و کتێبەکەی شەرەفنامە لەو شارەدا بەڵگەی تین و تاوی کوردانەی شارەکەیە. ئەم شارە بەردەوام بوو لەسەر چالاکیی نیشتمانپەروەرانە لەدژی داگیرکەرە عوسمانییەکان بۆ ڕزگاربوون لەجەورو ستەم و ئەم هەڵسوڕانە لەپاش کودەتای عوسمانی ساڵی ١٩٠٨ زیاتر پەرەی سەندو لەم ڕووەوە یانەیەك تیایدا کرایەوە کەرۆڵێکی گرنگی لەهۆشیاریی گشتیدا گێڕاو ژمارەی ئەندامەکانی بەخێرایی زیادی کرد، لەئاکامدا کاربەدەستە ئیتتیحادییەکان ترسیان لێ نیشت چونکە سڵیان لەپەرە ئەستاندنی چالاکییەکانی ئەم یانەیە دەکردەوە.

ئەوسا تاهیر پاشا والیی بتلیس بوو کە لەگەڵ کورددا نەرم بوو و نەیدەویست شارەکە شێواوی و ئاشوبی تێ بکەوێ بەڵام حکومەت بەنیاز بوو چالاکییەکانی کورد هەڕوون بەهەڕوون بکات، لەبەر ئەوە لەپایزی ساڵی ١٩١٠دا ئیسماعیل حەقی پاشای دامەزراند کەکابرایەك بوو بەدژایەتی کردنی‌کورد ناوی دەرکردبوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی ئیتتیحادییەکان داوای لێ کرد بەو ئەندازەیە توند نەبێ لەگەڵ کورددا[1]. لەوانەیە هۆی ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەحکومەت ترساوە مەسەلەکە سەرەنجامی خراپی لێ بکەوێتەوە و کوردەکان ئەو توندییە بقۆزنەوەو لەدژی حکومەت ڕاپەڕن. بەڵام خۆ کورد گیانی خۆڕاگری و بەرگریی خەفە نەبوو بوو، بۆیە کەوتنە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی پەنامەکی بەناوی ڕێکخراوی ڕێنمایی و ئەخشەدانان بۆ خۆسازدان بۆ هەڵایسانی ڕاپەڕینێکی جەماوەریی فراوان. بۆ ساناکردنی ئەم کارە، مەلا سەلیم کەیەکێ لەگەورە پیاوانی شاری بتلیس بوو، پەیوەندیی زۆر بەهێزی لەگەڵ ئەرمەنەکاندا دروست کرد بۆ ڕێککەوتن لەسەر ئەو کارەی کەپێویستە ئەنجام بدرێ. بەم پێیە، لەمووش و بتلیس چاوی بەسەرکردەکانیان کەوت و بابەتی جێنی باسی دامەزراندنی هاوپەیمانییەکی کوردی- ئەرمەنی بوو و لەم سەروبەندەدا هەردولا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کەناوچەکە تەنها لەلایەن هەردوکیانەوە بەڕێوە ببرێ، ئیدی هەردولا ڕێککەوتنەکەیان واژۆ کرد. پاش ئەوەی حکومەتی ئیتتیحادییەکان پێی زانی، کەوتە تیرۆرکردنی سەرکردەکانی کوردو لەم ڕووەوە لەمانگی ئەیلولی ساڵی ١٩١٣ خەیرەددین بەرازی لەلایەن نۆکەرانی ئیتتیحادییەکانەوە، لەکاتی گەڕانەوەی

---

[1] لازاریف، کێشە، ل٢٢٩.

لەئێرانەوە، تێهۆر کرا. ناوبراو چوو بوو بۆ ئێران‌و بەبڕێك پارەوە هاتبۆوە بۆ سود لێ وەرگرتنی بۆ سازکردنی ڕاپەڕین‌و کڕینی چەك. ئیتتیحادییەکان تەنها بەوە دانەکەوتن کەسەرکردەکانی کورد ڕاو بنێن[1]، بەڵکو هەروەها کەوتنە زیادکردنی باجیش‌و دواتریش لاوانی کوردیان ناچار کرد بچن بۆ سەربازی[2].

لەمانگی ئازاری ساڵی ١٩١٤دا ناوچەی بتلیس سازو ئامادە بوو بۆ تەقینەوە بەهۆی سیاسەتی شۆڤێنی حکومەت لەدژی کورد. مەلا سەلیم بەراسپاردەی ڕێکخراوەکە پەیوەندیی بەسەرۆکی ئەرمەنەوە کردو دڵنیای کردەوە کەکورد هاوسۆزی ئەرمەنەکانە. ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کەژمارەیەکی زۆری ئەرمەن هاوکاریی کورد بکەن بۆ ڕزگاربون لەستەمی ئیتتیحادییەکان. تورکەکانی شارەکە ترسێکی زۆریان لێ نیشت، بۆیە والیی بتلیس ویستی کێشەکان بەشێوەیەکی ئاشتییانە چارەسەر بکات تا ئەو کاتەی هێزی دیکەی پێ دەگات‌و لەم سۆنگەیەوە داوای وتووێژی لەسەرکردایەتیی ڕاپەڕینەکە کرد. مەلا سەلیم بۆ ئەم مەبستە چوو بۆ شار بەڵام لەوێ بوو بەمیوانی یەکێ لەکەسوکاری خۆی. ئیدی والیش سێ جار بەدوای نارد تا بچێ بۆ بارەگای حکومەت بۆ گفتوگۆو ڕێککەوتن بەڵام مەلا سەلیم ئەمەی ڕەت کردەوەو گوتی کەدەبێ والی خۆی بچێ بۆ لای‌و وتووێژی لەگەڵدا بکا[3].

لەماوەی دو ڕۆژدا ژمارەی بەشداربوانی ڕاپەڕینەکە لە٤ هەزار کەسەوە بوو بە٨ هەزار کەس[4]. حکومەت دەستی بەپەلاماردانی کورد کرد بەڵام بەشێکی زۆری هێزەکانی حکومەت چونە سەنگەری کوردەوەو چەندەها کوردو ئەرمەنیش ڕازی نەبون شەڕی ڕاپەڕیوەکان بکەن. لەناوەڕاستی ئازاری ١٩١٤دا دەسەڵاتی هەرەمەکی بەسەر شاری بتلیس‌دا سەپێنراو کاربەدەستان چوار چەکداری مەلا سەلیمیان گرت، ئیدی ئەویش داوای ئازادکردنی کردن‌و هەڕەشەی کرد کەئەگەر ئازاد نەکرێن ٢٥ جەندرمە لەجیاتیان دەڕفێنێ. پاشان شەڕێك لەنێوان هێزەکانی حکومەت بەپاڵپشتی تۆپەوەو هێزەکانی کورد ڕویداو کورد سەرکەوتنی تێدا وەدەست هێنا، دواتریش کوردەکان هێرشیان کردە سەر شاری بتلیس‌و لەماوەیەکی کەمدا ڕۆژی ٣ی نیسانی ١٩١٤

---

[1] جلیلي، نهضة الاکراد، ص١٩٧-١٩٩.
[2] لازاریف، کێشە، ل٣٢٨.
[3] جلیلي، نهضة الاکراد، ص٢٠-٢٣.
[4] لازاریف، کێشە، ل٣٢٨.

رزگاریان کرد[1]. رابەری راپەریوەکان مەلا سەلیمو شەهابەددینو شێخ عەلی بوو[2]. لەگرتنی شاردا کوردەکان هیچ تالآنێکیان نەکرد

ئازاری ئەرمەنەکانیشیان نەدا. پاشتر ئەنجومەنی وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئارتوێ کردنی بارودۆخی بتلیس کۆ بوەوەو بریاری ناردنی هێزی تری دا لەموسڵو ترابزونەوەو سەرکردایەتی کردنی ئەو لەشکرکێشیەیە بەئیحسان پاشا سپێردرا کەهەوڵی نانەوەی دوبەرەکیی دا لەنێوان کوردو ئەرمەنداو لەم هەوڵەیدا دەستەیەکی لەئەرمەنەکان بۆ دەست وەشاندن لەکورد پێك هێنا بەلآم ئەرمەنەکان بەدزییەوە تەتەریان بۆ سەرکردایەتیی راپەرینەکە ناردو ئاگاداریان کردنەوە کەئەوان تەنها بەروکەش بەپێکهێنانی ئەو دەستەیە رازینو ئامادە نین شەری کورد بکەن. لەو هەراو جەنجاڵەدا سوپای عوسمانی بەهەر ناوچەیەکدا تێدەپەری، تاڵانو وێرانکارییەکی زۆری دەکرد تا لەدواییدا دەستی بەسەر شاری بتلیسدا گرت.

ئیتتیحادییەکان شێخ شەهابو براکەیان لەگەڵ نۆ سەرکردەدا لەرۆژی ٧ی ئایاری ١٩١٤دا ئیعدام کرد[3]. مەلا سەلیمیش پەنای بۆ کۆنسۆلگەی روسیا برد[4]. کاتێك یەکێ لەئیعدامکراوەکان، کەناوی مەلا رەسولە، بەرەو سێدارەکە رۆیی، گوتی((کورد بەردەوام دەبێ لەسەر تێکۆشانو لەپێناوی وەدەست هێنانی مافەکانماندا تۆڵەی خۆمان لەتورك دەکەینەوە))[5].

پاش داگیرکردنی شارەکە، فەرماندەی سوپا ئیحسان پاشا زۆر کەسی گرت کەژمارەیان لەماوەی دو مانگدا گەیشتە هەزار کەس، ئیتر زیندانەکان پڕ خەڵکانی گیراو بونو بەهۆی ئەمەوە دەوروبەری ٣٠٠ ژن لەشارەکەدا خۆپیشاندانیان سازکردو داوای ئازادکردنی مێردو کوڕەکانیان کرد. ئەم خۆپیشاندانە لەمێژوی کورددا بەدیاردەیەکی هەڵکەوتوو دەژمێردرێ. بەلآم جەندرمەکان بلآوەیان بەخۆپیشاندەرەکان کرد. ئیحسان پاشا داوای لەکاربەدەستانی کۆنسۆلگەی روسیا کرد مەلا سەلیمی بدەنە دەست بەلآم داواکەی رەت کرایەوەو مەلا سەلیم تا هەلآیسانی جەنگی یەکەمی جیهان لەوێ مایەوە بەلآم کاتێك دەوڵەتی عوسمانی جەنگی لەدژی روسیا راگەیاند،

---

[1] لازاریف، کێشە، ل٢٣٩/ احمد، کمال مظهر، کردستان، ص١١٢.

[2] بلەج، القضیة، ص٦١.

[3] سلوبی، ڤي سبیل کردستان، ص٣٤.

[4] بلەج، القضیة، ص٦١/ جلیلي، نهضة الاکراد، ص٢٠٩.

[5] لازاریف، کێشە، ل٢٤٠.

هێزەکانی عوسمانی هێرشیان کردە سەر کۆنەزۆلگەکەو مەلا سەلیمیان بەزۆر دەرهێناو یەکسەر دایانە بەر دەستڕێژی گوللەو کوشتیانو کۆنەزۆلگەکەشیان تالآن کرد[1].

ڕەنگە یەکێ لەگرنگترین هۆکارەکانی ژێرکەوتنی ئەم ڕاپەڕینە پەیوەندیی بەوەوە هەبوبێ کەمەلا سەلیم یەك مانگ کاتی دیاریکراوی ڕاپەڕینەکەی پێشخست[2]، سەرباری ئەوەی کەشارەکانی تر بەشدارییان لەڕاپەڕینەکەدا نەکردو لاسەنگییەکی زۆر لەنێوان هێزە بەشەڕهاتووەکاندا هەبوو، جگە لەوەی کەهێندێ لەخێڵە کوردەکان شانبەشانی هێزەکانی ئیحسان پاشا دژی ڕاپەڕینەکەیان شەڕیان کردو پشتیوانییان لەداگیرکەران کرد.

---

[1] زکي، خلاصة، ص٢٥٧/ جليلي، نهضة الاكراد، ص٢١٧/ سەجادی، شۆڕشەکانی کورد، ل٥٢.
[2] لازاریف، کێشە، ل٣٤٥-٣٤٦.

## کۆتایی

ئەم لێکۆڵینەوە بەچەند سەرەنجامێك گەیشتوە کەگرنگترینیان ئەمانەن:

١-گەشەکردنی هۆشیاریی سیاسی لەلای کورد لەو ماوەیە دەرنەکەوتوە کەئێمە لەم کتێبەدا لێمان کۆڵیوەتەوە بەڵکو زادەی پەرسەندنێکی بەشێنەیی‌یەو بەهۆی کۆمەڵە فاکتەرێکەوە هاتۆتە دی کەپەیوەندییان بەگەشەکردنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتیی کوردەوە هەیەو لەڕوی سیاسییەوە پەیوەستن بەهەندێ هۆکاری سیاسییەوە وەك بونی چەندەها میرنشین پێش سەدەی پانزەهەمی زاینی‌و دانانی دەوڵەتی عوسمانی بەرەوایی دەسەڵاتی سیاسیی ئەو میرنشینانە.

٢-ناوچەکە چەند ململانێیەکی ئیقلیمی‌و نێودەوڵەتی بەخۆ دیوە وەك ململانێی ئێران-دەوڵەتی عوسمانی‌و روسیا- دەوڵەتی عوسمانی‌و هەوڵی بەن وچانی دەوڵەتانی ئەوروپا بۆ هێنانە کایەی ناوچەیەکی دەسەڵات بۆ خۆیان لەو وڵاتانەی کەبەشێکی دەوڵەتی عوسمانییان پێکدەهێنا لەوانە کوردستان. هەروەها گەورەترین ململانێی نێودەوڵەتی لەو ناوچەیەدا ململانێی نێوان بریتانیاو روسیا بوو و پاشان ئەڵمانیاش وەك زلهێزێك هاتە سەر شانۆی سیاسیی ناوچەکە.

٣-لەنێو دەوڵەتی عوسمانیدا چەندەها رەوەندی سیاسی‌و بیریاری سەری دەرهێنار بەم پێیە کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقی پەیدا بوو کەڕۆشنگەرە کوردەکان رۆڵێکی کاریگەریان لەدامەزرانیدا هەبو. بەشداریی کورد لەدامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە دەلالەتە لەسەر ئاستێکی باڵای هۆشیاریی لاوانی کوردو روانینیان بۆ وەدی هێنانی ئایندەیەکی باشتر بۆ گەلەکەیان.

کورد بەردەوام بوو لەسەر خەباتی سیاسی بۆ وەدی هێنانی مافە رەواکانی‌و لەم بوارەدا پاشگەزبونەوەی کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقی لەبەڵێنەکانی خۆی بەرانبەر بەنەتەوە ناتورکەکان نەبوە هۆی خەفەبونی تێن‌و تاوی داخوازییەکانی کورد.

٤-گەشەکردنی هۆشیاریی سیاسی‌و کەلتوری رۆشنگەرە کوردەکانی دەرەوەو ناوەوەی کوردستان رۆڵێکی گەورەی هەبو لەتەشەنە سەندنی هۆشیاریی کوردایەتی بەشێوەی دەرکردنی رۆژنامەو گۆڤار بەزمانی تورکی‌و کوردی‌و فەرەنسی.

٥-هەروەها ئەو رۆشنگەرە کوردانە رۆڵێکی کاریگەریان هەبو لەپێکهێنانی چەندان کۆمەڵەو حزب لەسەدەی بیستەم داو دەرکردنی بەیاننامەو ناردنی بۆ کوردستان بۆ پێشخستنی هۆشیاریی کوردایەتی. خەڵکی کوردستانیش بەپیر ئەو بانگەوازو بڵاوکراوانەوە چون‌و لێیان لەکوردستان‌و دەرەوەی کوردستان بۆ کردنەوە.

٦-سەرەڕای کۆششی سەرکردەکانی کورد لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە بۆ پەیوەندی کردن بەدەوڵەتە گەورەکانەوە بەتایبەتی بریتانیاو روسیاو داواکردنی کۆمەك‌و پشتگیری لێیان بەمەبەستی رزگارکردنی کوردستان بەڵام دەوڵەتە گەورەکان وەڵامی ئەو بانگەوازانەیان نەدایەوە بەڵکو کێشەی کوردیان کردە پەڵپێك بۆ وەدی هێنانی بەرژەوەندییە سیاسی‌و ئابوورییەکانی خۆیان‌و وەدەست هێنانی هەندێ دەستکەوت بۆ خۆیان لەدەوڵەتی عوسمانی.

٧-سەرەڕای تەقەللای ئیتتیحادییەکان بۆ تەگەوەدان لەگەیشتنی هێندێ کورد بە پەرلەمانی عوسمانی‌و نوێنەرایەتی کردنی گەلی کورد تێیدا بەڵام هێندێکیان توانییان پێی بگەن‌و تیایدا ئەو مەسەلانەیان وروژاند کەپەیوەندییان بەکاروباری کوردەوە هەبوو.

٨-دەشێ بگوترێ کەسەرباری ئەوەی گوترا، گەوهەری سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بریتی بوو لەکۆنترۆڵ کردنی کورد بەهەمو شێوەیەك بۆ سەرکوت کردنی هەست‌و هەستی نەتەوەیی‌و سیاسییان، لەوانە ئەنجامدانی سیاسەتێکی ناوەندی‌و پێکەوەنانی میلیشیای سوارەی حەمیدییەر کردنەوەی خوێندنگەی خێلەکی‌و خۆ نزیك کردنەوە لەسەرۆك‌و دەستڕۆیشتوەکانی کورد.

ئەگەرچی هەندێ لەسەرخێلەکان بەم سیاسەتە فریویان خوارد بەڵام زۆریان پێی نەچو گەڕانەوە بۆ سەنگەری گەل‌و کەوتنە کارکردن بۆ وەدی هێنانی ئامانجی مەسەلەی کورد کەبریتی بوو لەبەدەست هێنانی سەربەخۆیی خۆماڵی بۆ کوردستان.

## سەرچاوەکان

### یەکەم: دەستنوسەکان:

١-بهجت، عبدالكريم أفندى، نبزه تاريخيه فى حياه ابراهيم باشا الملى، المكتبه المركزيه العامه فى الموصل، تحت رقم: ٠٣١٠

٢-الخيلاني، أسعد، مخطوطة تاريخ سوران.

### دوەم: دیکۆمێنتە بڵاوکراوو بڵاونەکراوەکان

#### ١-دیکۆمێنتە بڵاونەکراوەکان:

٣-India office Records, L/P- /١٠/١٨٨. Summary of events in Turkish Iraq july ١٩١٠ (No-١٣٧٠).

٤-I.O.R April ١٩١٢ (No-٢٢٨٥).

٥-Musul – Kerkuk ilegili . Arsive Belgeleri (١٥٢٥-١٩١٩) Ankara. ١٩٩٢.

٦-F.O.٣٧١/١٨١, File No, ١٢٩٨٢. Memorandon, by Mr. Panker. On the Turco, Persian, Boundary Question , (١٨٢٢-١٩٠٦).

#### ٢-دیکۆمێنتە بڵاوکراوەکان:

٧-ابوبكر، د. احمد عثمان، نصوص ثلاث رسائل للشيخ عبيدالله النهري، مجلة شمس كردستان، العدد٦٩، سنة ١٩٨٥.

٨-ابوبكر، د. احمد عثمان، كردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، العدد ٥، السنة ١٩٨٣.

Seane,E.B.confidentis Report on the Sulaimania District of Kurdistan Calcutte. India.١٩١٨.

### سێیەم: سەرچاوەی عەرەبی

٩-احمد، د. ابراهيم خليل: تطور التعليم الوطني في العراق ١٨٦٩-١٩٣٢، ١٩٨٢.

١٠-احمد، د. ابراهيم خليل: ولايه الموصل دراسه فى تگوراتها السياسيه ١٩٠٨-١٩٢٢، رساله ماجستير غير منشوره مقدمه الى جامعه بغداد، كليه الآداب، كانون الپانى ١٩٧٥.

١١-ابوبكر، د. احمد عثمان ابوبكر: اكراد الملي وابراهيم باشا، بغداد، مطبعة دار الجاحظ، ١٩٧٣.

١٢-احمد، أحمد عبدالباقي: الدور السياسي للقوميات في تركيا(الأكراد) رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى معهد الدراسات القومية والاشتراكية في الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٩.

١٣-الأحمد، د. سامي سعيد: اليزيدية أحوالهم ومعتقداتهم، ط١، بغداد، ١٩٧١.

١٤-ادمونز، سي جي، كرد وترك وعرب، ترجمة: جرجيس فتح الله، مطبعة التايمس، بغداد، ١٩٧١.

١٥-احمد، د. كمال مظهر: دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، بغداد، ١٩٨٥.
١٦-احمد، د. كمال مظهر: كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى، ترجمة: محمد ملا عبدالكريم، ط٢، بغداد، ١٩٨٤.
١٧-الارحيم، فيصل محمد: تطور العراق تحت حكم الاتحاديين ١٩٠٨-١٩١٤، الموصل، مطبعة الجمهور، ١٩٧٥.
١٨-انيس، د. محمد. الدولة العثمانية والشرق العربي.(دون مكان وسنة الطبع).
١٩-باتريك، ماري ملز: سلاطين بني عثمان الخمسة، ترجمة: حنا غصن وآخرون، مطبعة صادر، ١٩٣٣.
٢٠-البارزاني، د. عبدالمصور: حماية الأكراد، ط١(دون مكان وسنة طبع).
٢١-البارزاني، مسعود: البارزاني والحركة التحررية الكردية، انتفاضة بارزان الأولى ١٩٣١-١٩٣٤، كردستان، ١٩٨٦.
٢٢-البدليسي، الأمير شرفخان: الشرفنامة، ترجمة: ملا جميل روژبياني، بغداد، مطبعة النجاح، ١٩٥٣.
٢٣-البريفكاني، عبدالقادر: مصطفى البارزاني، ط١، القاهرة، ١٩٩٦.
٢٤-بعيو، مصطفى عبدالله: المشروع الصهيوني لتوطين اليهود في ليبيا، طرابلس،١٩٧٥.
٢٥-بوندز، جوي واخرون: جذورنا لا تزال حية، ترجمة: مكي حبيب المؤمن، بغداد، ١٩٨٢.
٢٦-بيكنغهام، جيمس: رحلتي الى العراق سنة ١٨١٦م، ترجمة: سليم طه التكريتي، ط١، بغداد، ١٩٦٨.
٢٧-پي رش: بارزان وحركة الوعي القومي الكردي ١٨٢٦-١٩١٤(دون مكان الطبع، ١٩٨٠).
٢٨-التكريتي، د. هاشم صالح: المسألة الشرقية(المرحلة الأولى ١٧٧٤-١٨٥٦) بغداد، ١٩٩٠.
٢٩-توفيق علي برو: العرب والترك في الدستور العثماني ١٩٠٨-١٩١٤، دار النهار،١٩٦٠.
٣٠-التونسي، محمد بيرم الخامس، صفوة الاعتبار بمستودع الامصار والاخبار، ط١، مصر، ١٣١١هـ.
٣١-جليلي، جليلي وآخرون: الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: د. عبدي حاجي، ط١، دار الرازي، بيروت، ١٩٩٢.

٣٢-جليلي، جليلي وآخرون: من تاريخ الامارات الكردية في الامبراطورية العثمانية في النصف الأول من القرن التاسع عشر، ترجمة: د. محمد عبدو البخاري، ط١، دمشق، ١٩٨٧.

٣٣-جليلي، جليلي وآخرون: نهضة الأكراد الثقافية والقومية في نهاية القرن التاسع عشر وبداية القرن العشرين، ترجمة: باقي نازي، ود. ولاتو وكفر، منشورات رابطة كاوه، دار الكتاب، بيروت، ط١، ١٩٨٦.

٣٤-جمال الدين الأفغاني والشيخ محمد عبده: العروة الوثقى، ط٢، بيروت، ١٩٨٠.

٣٥-الجميلي، قاسم خلف عاصي، العراق والحركة الكمالية ١٩١٩-١٩٢٣، رسالة دكتوراه مقدمة الى كلية الآداب-جامعة بغداد، ١٩٩٠.

٣٦-جياوك، معروف: القضية الكردية، ط٢، بغداد، ١٩٣٩.

٣٧-جياوك، معروف: مأساة بارزان المظلومة، بغداد، المطبعة العربية، ١٩٥٤.

٣٨-جرانت، أ. ج، هارولد تمبرلي، اوروبا في القرنين التاسع عشر والعشرين ١٧٨٩-١٩٥٠، ترجمة بهاء فهمي، القاهرة.

٣٩-جورج انطونيوس يقظة العرب، ترجمة: د. ناصر الدين ود. احسان عباس، ط٦، بيروت، ١٩٨٠.

٤٠-جوستن، بيركنس: رحلة جوستن عبر شمال العراق (الأرض الكلاسيكية عام ١٨٤٩)، ترجمة: د. سيار كوكب الجميل.

٤١-الجواهري، عماد: صراع القوى السياسية في المشرق العربي، الموصل، ١٩٩٠.

٤٢-الجبوري، انور علي: دور المثقفين في ثورة العشرين، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الآداب-جامعة بغداد، ١٩٨٩.

٤٣-الحسني، عبد الرزاق: تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ط٧، بغداد، ١٩٨٨.

٤٤-الحسني، عبد الرزاق: اليزيدية في حاضرهم وماضيهم، ط٢، بيروت، ١٩٥٣.

٤٥-حتي، فيليب: موجز تاريخ الشرق الأدنى، ترجمة: د. أنيس فريحة، بيروت، ١٩٦٥.

٤٦-حسن، جاسم محمد: العراق في العهد الحميدي ١٨٧٦-١٩٠٩، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب-جامعة بغداد، ١٩٧٥.

٤٧-حسين، سعدي عثمان: كردستان والامبراطورية العثمانية-دراسة في تطورها السياسي ١٥١٤-١٨٥١، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الآداب-جامعة صلاح الدين، ١٩٩٥.

٤٨-حسين، عبد الرزاق عباس، نشأة مدن العراق وتطورها، بغداد، ١٩٧٣.

٤٩-حلمي، رفيق: الاكراد منذ فجر التاريخ الى سنة ١٩٢٠، ١٩٣٤.

٥٠-حيدر، كاظم: الأكراد من هم والى أين، ط١، بيروت، ١٩٥٩.

٥١-الخالدي، يوسف ضيا الدين باشا: الهدية الحميدية في اللغة الكردية، تحقيق وتقديم: د. محمد مكري، بيروت، ١٩٧٥.
٥٢-خالفين، ن. أ: الصراع على كردستان، ترجمة: د. احمد عثمان ابوبكر، بغداد، ١٩٦٩.
٥٣-الخطيب، عبدالحميد: تركيا الحديثة مثل أعلى،(دون تاريخ).
٥٤-خصباك، شاكر: الأكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٢.
٥٥-خصباك، شاكر: العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، ط١، بغداد، ١٩٧٣.
٥٦-خصباك، شاكر: الكرد والمسألة الكردية، بغداد، ١٩٥٩.
٥٧-خلفا،كلشن، ترجمة: موسى كاظم نورس، مطبعة الآداب،١٩٧١.
٥٨-خورشيد، فؤاد حمه: العشائر الكردية، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٩.
٥٩-داود جلبي: كتاب مخطوطات الموصل.
٦٠-دحلان، احمد بن السيد زيني: الفتوحات الاسلامية، ج٢، مصر، ١٩٠٤.
٦١-الدرة، محمود: القضية الكردية والقومية العربية في معركة العراق، دار الطليعة، بيروت، ط١، ١٩٦٣.
٦٢-الدسوقي، د. محمد كمال: الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، دار الثقافة للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٧٦.
٦٣-الدملوجي، صديق: امارة بهدينان الكردية، مطبعة الاتحاد، الموصل، ١٩٥٢.
٦٤-رؤوف، عماد عبدالسلام: الموصل في العهد العثماني، ١٧٢٦-١٨٣٤، مطبعة الآداب، النجف، ١٩٧٥.
٦٥-الربيعي، صادق علي: الاستيطان الصهيوني في فلسطين أبان حكم الدولة العثمانية ١٨٨٢-١٩١٧، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى معهد البحوث والدراسات العربية، بغداد، ١٩٧٨.
٦٦-رسول، د. عزالدين مصطفى: حول الصحافة الكردية، مطبعة دار الجاحظ، بغداد،١٩٧٣.
٦٧-ريج، كلوديس جيمس: رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠، ترجمة: بهاء الدين نوري، ط١، بغداد، ١٩٥١.
٦٨-رامزور، د. ارنست: تركيا الفتاة وثورة ١٩٠٨، ترجمة: د. صالح احمد العلي، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٦٠.
٦٩-زكي، محمد أمين: تاريخ الدول والامارات الكردية، القاهرة، ١٩٤٨.

٧٠-زكي، محمد أمين: خلاصة تأريخ الكرد وكردستان، ترجمة: محمد علي عوني، ط١، ط٢، مطبعة صلاح الدين، بغداد، ١٩٦١.
٧١-زكي، محمد أمين: مشاهير الكرد وكردستان، مطبعة التفيض الأهلية، ج١، بغداد، ١٩٤٠.
٧٢-زكي، محمد أمين: مشاهير الكرد وكردستان، ترجمة: كريمته، مراجعة: محمد علي عوني، ج٢، مصر، ١٩٤٧.
٧٣-زلوم، عبدالقديم، كيف هدمت الخلافة، دار الأمة، ١٩٦٢.
٧٤-زين، زين نورالدين: الصراع الدولي في الشرق الأوسط وولادة دولتي سوريا ولبنان، دار النهار للنشر، ١٩٧١.
٧٥-زين، زين نورالدين: نشوء القومية العربية مع دراسة تاريخية في العلاقات العربية- التركية، بيروت، ١٩٧٢.
٧٦-ستيورت، دزموند: تاريخ الشرق الأوسط الحديث، ترجمة: زهدي جارالله، ط٢، دار النهار(دون سنة).
٧٧-السويدي، توفيق: مذكراتي(نصف قرن من تأريخ العراق والقضية العربية)، بيروت، ١٩٦٩.
٧٨-سليمان، فيضي: في غمرة النضال، ط٢، بيروت، ١٩٧٤.
٧٩-سلمان، محمد: التطور الاقتصادي في العراق، ج١، صيدا، ١٩٦٥.
٨٠-سلوبي، زنار: في سبيل كردستان، ترجمة: ر. علي، دار الكتاب، بيروت، ط١، ١٩٨٧.
٨١-شريف، د. عبدالستار طاهر: الجمعيات والمنظمات والأحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، ط١، بغداد، ١٩٨٩.
٨٢-شويل، فوزي خلف: ايران في سنوات الحرب العالمية الأولى، مركز دراسات الخليج العربي-جامعة البصرة، ١٩٨٥.
٨٣-شويل، فوزي خلف: تغلغل النفوذ الامريكي في ايران ١٨٨٣-١٩٢٥، رسالة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب-جامعة بغداد، ١٩٩٠.
٨٤-شيركوه، د. بله ج، القضية الكردية، منشورات جمعية خويبون، ط٢، ١٩٨١.
٨٥-الضابط، شاكر صابر: العلاقات الدولية ومعاهدات الحدود بين العراق وايران، نشر وطبع دار البصرة، بغداد، ١٩٦٦.
٨٦-الطالباني، جلال: كردستان والحركة القومية الكردية، بيروت، ط٢، ١٩٧١.

٨٧-الطائي، ذنون يونس حسين: الاتجاهات الاصلاحية في الموصل في أواخر العهد العثماني وتأسيس الحكم الوطني، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب-جامعة الموصل، ١٩٩٠.

٨٨-العباسي، محفوظ: امارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٦٩.

٨٩-عبدالقادر، عصمت برهان الدين: العرب والمسألة الدستورية في الدولة العثمانية ١٨٧٦-١٩١٤، رسالة دكتوراه مقدمة الى كلية الآداب-جامعة الموصل، ١٩٩٥.

٩٠-عبدالقادر، عصمت برهان الدين: دور النواب العرب في مجلس المبعوثان العثماني ١٩٠٨-١٩١٤، رسالة ماجستير غير المنشورة، مقدمة الى كلية الآداب-جامعة الموصل ١٩٨٩.

٩١-عبدالوحيد، المقدم الشيخ: الأكراد وبلادهم، المطبعة العلمية، لاهور-باكستان ط٣، ١٩٧٠.

٩٢-العزاوي، عباس: تاريخ العراق بين احتلالين، الاجزاء ٧و ٨، بغداد، ١٩٥٥-١٩٥٦

٩٣-العزاوي، عباس: عشائر العراق، جـ٢، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٤٧.

٩٤-العزاوي، عباس: تأريخ اليزيديين وأصل عقيدتهم، بغداد، ١٩٣٥.

٩٥-العقراوي، د. نافع: شعراء من بادينان، بغداد، ١٩٧٨.

٩٦-عقراوي، متي، العراق الحديث، بغداد، ١٩٣٦.

٩٧-علي، اورخان محمد: السلطان عبدالحميد الثاني حياته وأحداث عهده، ط١، ١٩٨٧.

٩٨-علي، د. حامد محمود عيسى: المشكلة الكردية في الشرق الأوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، مكتبة مدبولي، ١٩٩٢.

٩٩-علي، علي شاكر: تأريخ العراق في العهد العثماني ١٦٣٨-١٧٥٠، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الآداب-جامعة بغداد، ١٩٧٦.

١٠٠-علي، جواد فقي، الشيخ خالد النقشبندي ومنهجه في التصوف، رسالة دكتوراه مقدمة الى كلية العلوم الاسلامية، جامعة بغداد، ١٩٩٧.

١٠١-العمري، محمد طاهر: تأريخ مقدرات العراق السياسية، جـ٣، بغداد، ١٩٢٥.

١٠٢-الغلامي، عبدالمنعم: الضحايا الثلاث، مطبعة الهدف، الموصل، ١٩٥٥.

١٠٣-الغمراوي، أمين سامي: قصة الاكراد في شمال العراق، ط١، ١٩٦٧.

١٠٤-فريزر، جيمس بيلي: رحلة فريزر الى بغداد في ١٨٣٤، ترجمة: جعفر الخياط، ط١، مطبعة المعارف، ١٩٦٤.

١٠٥-فوزي، احمد: قاسم والأكراد خناجر وجبال، دون مكان الطبع، ١٩٦١.

١٠٦-فيشر، هـ، أ، ل: تاريخ أوربا في العصر الحديث ١٧٨٩-١٩٥٠، ترجمة: احمد نجيب هاشم ووديع الضبع، دار المعارف بمصر، القاهرة، ط٧، ١٩٧٦.

١٠٧-قاسم، محمد وحسين حسن: تأريخ القرن التاسع عشر، ط٥، مصر، ١٩٢٨.
١٠٨-قاسملو، د. عبدالرحمن: كردستان والأكراد، ط١، بيروت، ١٩٧٠.
١٠٩-قاسملو، د. عبدالرحمن: أربعون عاما من الكفاح من أجل الحرية، ط١، ترجمة: د. عزالدين مصطفى رسول، مطبعة جامعة صلاح الدين-اربيل.
١١٠-قزانجي، فؤاد: العراق في الوثائق البريطانية ١٩٠٥-١٩٣٠، دار المأمون، بغداد، ١٩٨٠.
١١١-الكركوكلي، رسول: دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد، ترجمة: موسى كاظم نورس، بيروت، ١٩٦٣.
١١٢-كيرك، جورج: موجز تاريخ الشرق الأوسط، ترجمة: عمر الاسكندري، مصر، دون سنة الطبع.
١١٣-كوني ره ش: الأمير جلادت بدرخان حياته وفكره، دمشق، ١٩٩٢.
١١٤-الگوراني، علي سيدو: من عمان الى العمادية او جولة في كردستان الجنوبية، مطبعة السعادة، مصر، ١٩٣٩.
١١٥-لاني، صبرية احمد: الاكراد في تركيا، الجامعة المستنصرية-معهد الدراسات الآسيوية والافريقية، تداول محدود، رقم ٢٢.
١١٦-لبيب، حسين: تاريخ المسألة الشرقية، مطبعة الهلال، مصر، ١٩٢١.
١١٧-لونكريك، ستيفن هيمسلي: أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر الخياط، ط٦، ١٩٨٥.
١١٨-لويس دوللو: التاريخ الدبلوماسي، ترجمة: سموحي فوق العادة، ط١، بيروت، ١٩٧٠.
١١٩-المائي، أنور: الأكراد في بهدينان، مطبعة الحصان، الموصل، ١٩٦٠.
١٢٠-المشايخي، علي خضر: ايران في عهد ناصرالدين شاه ١٨٤٨-١٨٩٦، رسالة ماجستير، مقدمة الى كلية الآداب-جامعة بغداد، ١٩٨٧.
١٢١-محمد، حربي: تطور الحركة الوطنية في ايران من ١٨٩٠-١٩٥٣، ط١، بغداد، ١٩٧٠.
١٢٢-المس بيل: فصول من تاريخ العراق القريب، ترجمة: جعفر الخياط، دار الكشاف، ١٩٤٠.
١٢٣-مصطفى، احمد عبد الرحيم: في أصول التاريخ العثماني، دار الشروق، ط١، ١٩٨٠.
١٢٤-مصطفى، حسن: البارزانيون وحركات بارزان ١٩٣٢-١٩٤٧، ط١، بيروت، دار طليعة، ١٩٦٣.

١٢٥-المعماري، عبد شاطر عبدالرحمن: سياسة تركيا الاقليمية بين الحربين العالميتين، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب-جامعة الموصل، ١٩٩٥.
١٢٦-منسي، د. محمود صالح: حركة اليقظة العربية في الشرق الآسيوي، دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٧٨.
١٢٧-الموصلي، سليمان الصائغ: تاريخ الموصل، ط١، المطبعة السلفية، مصر،١٩٢٣.
١٢٨-الموصلي، المقدم منذر: عرب وأكراد، رؤية عربية للقضية الكردية، ط١، دار الغصون، بيروت، ١٩٨٦.
١٢٩-ميجر سون: رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين، ترجمة: فؤاد جميل، جـ ١ ط١، مطبعة التايمس، بغداد، ١٩٧٠.
١٣٠-ميجر سون: رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكردستان، ترجمة: فؤاد جميل جـ٢، ط١، مطبعة الجمهورية، بغداد، ١٩٧١.
١٣١-مينورسكي، ف: الأكراد ملاحظات وانطباعات، ترجمة: معروف خزندار، بغداد ١٩٦٨.
١٣٢-نبز، جمال: الأمير الكردي، مطبعة وزارة التربية-اربيل، ١٩٩٤.
١٣٣-النجار، مصطفى عبدالقادر: العلاقات السياسية مع القوى المجاورة في شط العرب والخليج العربي.
١٣٤-نديم، شكري محمود: أحوال العراق من مرحلة المشروطية الثانية، رسالة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب-جامعة بغداد، ١٩٨٥.
١٣٥-النصيري، عبدالرزاق احمد: نوري السعيد ودوره في السياسة العراقية، ط١ ١٩٨٧.
١٣٦-نوار، د. عبدالعزيز سليمان: تاريخ العراق الحديث، القاهرة، ١٩٦٨.
١٣٧-نوار، د. عبدالعزيز سليمان: تاريخ الشعوب الاسلامية في العصر الحديث، ط١ دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧١.
١٣٨-نورس، د. علاء: العراق في العهد العثماني ١٧٠٠-١٨٠٠، دار الحرية، بغداد ١٩٧٩.
١٣٩-نيبور، كارستن: رحلة نيبور الى العراق في القرن ١٨، ترجمة: محمود حسين الأمين بغداد، دون سنة طبع.
١٤٠-نيكتين، باسيل: الأكراد، دار الروائع، بيروت، دون سنة الطبع.
١٤١-هاسلب، جون: السلطان الأحمر، ترجمة: فيليب عطا الله، بيروت، ١٩٧٤.
١٤٢-الهلالي، محمد مصطفى: السلطان عبدالحميد الثاني، الموصل، ١٩٩٤.
١٤٣-هلمز، سنينا: زوجات السفراء في ايران، ترجمة: سامي جابر، دار المروج، ١٩٨٦.

١٤٤-هورامي، عمر عبدالعزيز: القضية الكردية والمؤامرات الدولية، منشورات جمعية علماء كردستان، ١٩٩٣.

١٤٥-وتلن، د. ألما: عبدالحميد ظل الله على الأرض، ترجمة: راسم رشيد، دار النيل، ١٩٥٠.

١٤٦-الوائلي، عبد ربه سكران: أكراد العراق ١٨٥١-١٩١٤، رسالة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب-جامعة القاهرة، ١٩٨٧.

١٤٧-الواعظ، مصطفى نورالدين: الروض الازهر في تراجم آل سيد جعفر، الموصل(دون سنة الطبع).

١٤٨-الوردي، علي: لمحات اجتماعية في تاريخ العراق الحديث، جـ٣، بغداد، ١٩٧٢.

١٤٩-وردي، محمد توفيق: الأكراد في الاتحاد السوفيتي، مطبعة اللواء، بغداد، ١٩٥٩.

١٥٠-وردي، محمد توفيق: كرستان المناضلة، جـ١، مطبعة اللواء، بغداد، ١٩٥٩.

١٥١-ويكرام، دبليو وديكرام اركارتي، أي: مهد البشرية الحياة في شرق كردستان، ترجمة: جرجيس فتح الله، مطبعة الزمان، بغداد، ١٩٧١.

١٥٢-د. وليد حمدي: الكرد في الوثائق البريطانية، لندن، ١٩٩١.

١٥٣يگن، ولي الدين: المعلوم والمجهول، جـ١، مصر، ١٩٠٩.

چوارەم: سەرچاوەی کوردی

١٥٤-ئەسەسەرد، فەرید، گەشەکردنی سەرمایەداری لەکوردستاندا، بڵاوکراوەکانی دەزگای ناوەندیی راگەیاندنی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، ١٩٨٦.

١٥٥-احمد، د. کمال مظهر: تێگەیشتنی راستی، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا، ١٩٧٨.

١٥٦-أمين، صالح محمد: کوردو عەجەم، ١٩٩٢.

١٥٧-بابان، عبدالقادر روستم، رەوشی کوردان، وەرگێرانی: کەریم حیسامی، ١٩٩١.

١٥٨-بابان، شکرالله، کوردو کوردستان، ورمێ، ١٣٨٥.

١٥٩-جاف، حسین: هۆزەکانی کورد، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٩٢.

١٦٠-جەلیل، جەلیلی، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێرانی: د. کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٧.

١٦١-جەلیل، جەلیلی: راپەرینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠، وەرگێرانی: د. کاوس قەفتان، چاپخانەی زەمان، بەغدا، ١٩٨٧.

١٦٢-چەلەبی، ئەولیا: کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، و: ناکام، جـ٢، بەغدا، ١٩٨٧.

١٦٣-حەفید، شیخ محمود شیخ کاوە: یاداشتەکانی شیخ لەتیفی حەفید، ١٩٩٥.

١٦٤-حلمي، رفيق، يادداشت، بەشی یەکەم، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٨.

١٦٥-رۆژبەیانی، محمد جمیل: فەرمانڕەوایانی موکریان، بەغدا، ١٩٩٢.

١٦٦-سەجادي، علاء الدین: دوو چامەکەی نالی و سالم، بەغدا، ١٩٧٣.

١٦٧-سجادي، علاءالدین: شۆڕشەکانی کورد، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٩.

١٦٨-سجادي، علاءالدین: گەشتێك لەکوردستان، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٦.

١٦٩-سجادي، علاءالدین: مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٢.

١٧٠-شەمزینی، د. عزیز: جولانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان، وەرگێڕانی فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨.

١٧١-عزیز، د. حسین محمد، ململانێی ئایدۆلۆژی لەکوردستان، بلاوکراوەکانی کتێبخانەی ئەزمەر، سلێمانی، ١٩٩٣.

١٧٢-قەزاز، رەمزی: بزوتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد لەکۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی چەرخی بیست، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٧١.

١٧٣-قەفتان، توفیق: مێژووی حوکمرانی بابان لەقەلاچوالان، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغدا.

١٧٤-قەفتان، سالح: مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ، چاپخانەی سلمان الأعظمي، بەغدا، ١٩٦٩.

١٧٥-قەفتان، کاوس: بابان سۆران بۆتان، بەغدا، ١٩٨٥.

١٧٦-کۆچیرا، کریس: مێژووی کورد لەسەدەی ٢٠-١٩دا، وەرگێڕانی، محمد ریانی، چاپ١، چاپخانەی کاروان، تاران، ١٣٦٩.

١٧٧-لازاریف: کێشەی کورد، وەرگێڕانی د. کاوس قەفتان، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا، ١٩٨٩.

١٧٨-نەبەز، جمال: بیری نەتەوەیی کوردی، سوید، ١٩٨٤.

١٧٩-نیبیا، سید علي: خێڵ و تایەفەکانی عەشایەری کوردی ئێران، وەرگێڕانی: شوکت شیخ یەزدین.

١٨٠-یاسەمی، رشید: مێژووی نەژادو پەیوەستەگی کورد، وەرگێڕانی قانعی هوز کەریم زەند، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٩.

پێنجەم: سەرچاوەی تورکی

١٨١-زاده، محمد همدمي صولاقة: صولاقة زادة تأريخي، استانبول، ١٢٩٧-١٨٧٩م.

١٨٢-موصل ولايتی سالنامەسی، ١٣٣٠هـ.
١٨٣-سالنامە نظارت معارف، ١٣١٦هـ، دار السعادة، استانبول.
١٨٤-سالنامە دولت عليە عثمانية، ١٣٢٦هـ، ألتمش دورد انجی سنة در سعادت، طبعة احمد احسان، ١٣٢٦هـ-١٩٠٨م.
١٨٥-خورشيد باشا: سياحتنامە حدود، استانبول(ميژوی لەسەر نيە).
١٨٦-مدحت باشا: حيات سياسي خدماتي، منفا حياتي، استانبول، باب عالي، جادە سندە هلال، مطبعة سي، جـ١، ناشرين: علي حيدر مدحت، ١٣٢٥هـ.
١٨٧-Buyrakdur, Dr. Mehmot. Bitlisis idiris(idiris bitlisi:) Ankara.١٩٩١
١٨٨-Dergisi.Turktarih-cildI sayi ١٣ ١٩٧٧-Asiret Mektebi.
١٨٩-Ergin, Osman. Turkiye muarif, Tarihi –٣ cilt. Istanbul –١٩٤٤.
١٩٠-Hakki, Ishail –Umuncarsili- Osmanli Tarihi- Cilt . ١١. Ankara.١٩٤٩.

شەشەم: سەرچاوەی فارسی

١٩١-أفشار، علي: رسالەی شيخ عبيداللە ضمية ميزا رشيد، تاريخ افشار، بە صحيح واهتمام: پرويز شهريار افشار، محمود راميان، تبريز، مطبعة شفق، ١٣٤٦.
١٩٢-بابان، عبدالقادر روستم: سير الأكراد، بكوشش محمد رؤوف توكلي، جـ١، تهران، ١٣٦٠.
١٩٣-دهقان، علي: رضائية يا سرزمين زردشت، طهران، مطبوعات ابن سينا، ١٣٤٨.
١٩٤-محمود، محمود: تاريخ روابط سياسي ايران وانگليس در قرن نوزدهم ميلادي، مجلد ١، چاپ دووم، تهران، ١٣٣٨.

حەوتەم: سەرچاوەی فەرەنسی

١٩٥-Chris kutschera: Le Mourement National - Fla mmarion Paris –١٩٧٧.
١٩٦-CHALIAND, Gerard, hes et Kurdistan ed-mu-Spero Paris. ١٩٨١
١٩٧-Encyclopedi del Islam, Nouvelle edition, tg.livr-٦١,٦٣, Paris.١٩٧٢.
١٩٨-Mechr outiette, organ du parti Radical ottoman: sous La patronage de G. cherif pacha, N. ٤٧ oct ١٩١١
١٩٩-MORE, Christian: Les kurdes, Oujoura, huis Hornattan paris. ١٩٨٤.
٢٠٠-G. Groc, Gaglar: La presse francaise en Turquie, ed – isis, Istanbul, ١٩٨٨.
٢٠١-OMAR. Farhad Pirbal: LaGenese dela nouvelle kurde, These pourl. Obtention de Doctorat de ٣ me sycle en litterature kurde, presente sous la direction de Monsieur charles Henri De Fouchecour. Univarsitede La sorbenne Nouvelle. Paris III Janvier. ١٩٩١

## هەشتەم: سەرچاوەی ئنگلیزی

٢٠٢-Abida-AL-Karayati. Adiplomatic History of modern Irag first Edition. Newyork ١٩٦١. P.

٢٠٣-Arafa, Hasan:- The Kurds. Oxford univ. press. London. ١٩٦٦.

٢٠٤-Borhanedin. A.Yassin. vision or reality? Luno university, press Sweedn-١٩٩٥

٢٠٥-Chassn. A.Atiyyh. Iraq. ١٩٠٨-١٩٢١-Apolitical study. (beirut-١٩٧٣).

٢٠٦-Curzen. G-N persia and persiah question. London-١٩٦٦.

٢٠٧-David Mcdowall. The kurd A nation denied. London-١٩٩٢.

٢٠٨-Derk. kinnane the kurds and kurdistan ١٩٦١-١٩٧٠. London. ١٩٧٢.

٢٠٩-Guest, Johns. The yezidis, Astudyin survival. London-١٩٨٧.

٢١٠-Edward Meadeand Turkey The Great powers and Baghdad a prailwa.

٢١١-Edgar olballance The Kurais and kudistan ١٩٦١-١٩٧٠. London-١٩٧٣.

٢١٢-Fraser. J. B. Awinters Journy from constantin opole Tehran.Vol-١ Newyork. ١٩٧٣.

٢١٣-Fisner. W. B. cnange and aevelopment in the Miadle east Newyork. ١٩٨١.

٢١٤-Hoit. p. M. and others: The cambridige history or Islam: voi. A cambrirdage. University. Press-١٩٧٠.

٢١٥-Kendal and others. people with out A countery-London. ١٩٧٠.

٢١٦-Layards, sir Austin Henry. Discoveries in ruins of Ninveh and Babylon. with travels in Arminia. Kurdistan etc. London ١٨٥٥.

٢١٧-Robinson, Richard. The first Turkish Reoublic, study in Nation development (U.S.A) ١٩٦٣.

٢١٨-Safrastain- Dr. A. Kurdistan. and kurds. London. ١٩٨٤.

٢١٩-Stanford.j.show: History of Ottoman Empire and Modren Turkey. Vol.١.٢.published. Britain. ١٩٨٨.

## نۆیەم: گۆڤارەکان

٢٣١-ابوبکر، د. احمد عثمان: کردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، العدد ٥، سنة ١٩٨٠.

٢٣٢-ابوبکر، د. احمد عثمان: کردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، العدد ٥، السنة ١٢، ١٩٨٣.

٢٣٣-ابوبکر، د. احمد عثمان: نصوص ثلاثة رسائل للشيخ عبيدالله النهري، مجلة شمس کردستان، العدد ٦٩، ١٩٨٥.

٢٣٤-احمد، د. کمال مظهر: کام رێگا؟ گۆڤاری بەیان، ژمارە ٢، بەغدا، ١٩٧٢.

٢٣٥-پیربال، د. فەرهاد: گۆڤاری مەشرووتیەت، گۆڤاری رامان، ژمارە ١٥، ١٩٩٧.

٢٣٦-پیربال، د. فەرهاد: ئەو کوردەی تورکەکانی لەدەست دکتاتۆریەتی سوڵتان عبدالحمید رزگار کرد: د. عەبدوڵڵا جەودەت، گۆڤاری گوڵان، ژمارە ١٦٥، ١٩٩٨.

